خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# ● مرۆڤ و زەمەن

● نووسینی: **محەمەد سلێمان عەباس**

● **نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر**

● بەرگ: مەزهەر

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٣

● تیراژ:٧٥٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٢٨) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٦٧)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی:

چەمکی زەمەن چەمکێکی دێرینە، کاریگەری قوڵی لەسەر ساتەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤ هەیە، هەر لە دەم و ساتە زۆر بەراییەکانەوە بگرە تا ئێستا، هەر لە بار و کۆمەڵگا سەرەتاییەکانەوە تا دوا رووبەری کۆمەڵگای نوێ و هاوچەرخ، ئەمڕۆش چەمکی زەمەن لە ژیانی ئێستاماندا کارایی خۆی هەیە، بۆیە هەر کاتێك بمانەوێ پرسیار لە ژیار و کۆمەڵگە بکەین، یان پرسیار لە بوون و مرۆڤ بکەین، ناچارین پرسیار لەم چەمکە بکەین.

ئەم نوسین و لێکۆڵینەوەیە دەیەوێ لە مەسەلەیەکی ئاڵۆز و گرنگی وەك زەمەن بدوێ، بەڵام دواندنەکانی وەك تێزێکی رەها پێشکەش ناکات، چونکە تا ئێستا ئەو زانیاریانەی لەمەڕ ئەم چەمکە لەبەردەستدان کەمن و بەس نین بۆ ئەوەی ئەو بانگەشەیە بکات، بۆیە ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لە چەمکی زەمەن و دەرخستن و دیاریکردنی رۆڵی زەمەن لە بوون و ژیانی مرۆڤ و گشت دیاردەکان، هەڵبەت زەمەن بەو هەموو ئاڵۆزیەی خۆیەوە، بەو هەموو باگراوەندە مێژووییەوە کە هەیەتی، ناکرێ تەنها لە یەك رەهەندەوە بخوێندرێتەوە، یان تەنها لە یەك پێگەوە سەرنجی بدەین، بەڵکو پێویستمان بەوەیە لە چەندین لاوە سەرنجی بدەین و لە چەندین رەهەندەوە بیخوێنینەوە، بەتایبەت رەهەندی (ئایینی، فەلسەفی، مێژوویی) چونکە زەمەن پەیوەندیەکی پتەوی بەم سێ رەهەندەوە هەیە. هەروەها لەبەرئەوەی هەندێك جار زەمەن وەك پێوەرێکی یەکگرتوو یان گشتی، کە لەلایەن دەسەڵاتی ئایینی یان سیاسی سەپێنراوە لە سەر کۆمەڵگە و ژیانی تاکەکان، بۆیە پێویستە بزانیین زەمەن چییە؟ لە چی پێکهاتووە و کاریگەری لەسەر ژیانی مرۆڤ چەندە؟ بابەتی ئەم کتێبە تەنها بیرۆکەی زەمەن نییە، بەڵکو خودی زەمەنیشە، ئەو زەمەنەی کە پڕە لەو رووداوانەی کە پەیوەستن بە مێژوو، سروشت، فیزیا...

کەواتە بابەتی ئەم توێژینەوەیە زەمەنە لە دید و بۆچوونی جیاجیا .

هەڵبژاردنی بابەتی (زەمەن) بۆ نوسین و لێکۆڵینەوە، کە بێگومان ئاسان نییە، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، لەوانە، ناساندنی چەمکی زەمەن و خستنەڕووی دید و بۆچونە جیاوازەکان سەبارەت بە زەمەن کە قوڵ و پڕبایەخن، هەروەها هۆیەکی دیکەش ڕێگە خۆشکردنە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە زەمەن، بۆ ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە ببێتە سەرەتایەك بۆ کردنەوەی دەرگایەك بە رووی تێگەیشتن لە زەمەن و رەهەندەکانی، کە ئێمە ئێستا پێویستمان بەوە هەیە کە رۆڵ و گرنگ و بایەخی زەمەن بزانیین لە بوون و ژیانی مرۆڤ و مرۆڤایەتیدا.

بێگومان نووسین لە بارەی (زەمەن)ەوە کارێکی گرانە و لە هەمان کاتدا زۆر پێویستە، چونکە ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانیین گرنگی زەمەن لە ژیاندا فەرامۆش بکەین.

ئەوەندەی من ئاگاداربم تاکو ئێستا کتێبێکی تایبەت یان تۆژینەوەیەکی سەربەخۆ سەبارەت و تایبەت بە بابەتی زەمەن بە زمانی کوردی بڵاونەکراوەتەوە و لێکۆڵەر و نوسەرانی کورد ئەم بابەتە گرنگەیان فەرامۆش کردوە و پشت گوێیان خستووە، بۆیە بە پێویستم زانی تۆژینەوەیەك، کتێبێك لەسەر بابەتی زەمەن بنووسم و بە پێی توانای خۆم پەیوەندی نێوان زەمەن و مرۆڤ دەربخەم و سەرجەم ئەو بابەت و دیاردانەی بەند و پەیوەستن بە زەمەن باس بکەم، تێبینی ئەوەم کردوە کە هەندێ نووسەر وشەی (کات) بەرامبەر بە وشەی (زەمەن)ی عەرەبی بەکاردێنن، بەڵام من پێموایە وشەی کات بە تەواوی مانای وشەی زەمەن نابەخشێت، بۆیە وشەی زەمەنم بەکارهێناوە. پێشتر بابەتێکم بە ناوی (زەمەن لە باوەڕ و هزری مرۆڤی کۆندا) لە گۆڤاری رامان بڵاوکردۆتەوە، دواترپێم باشبوو ئەم بابەتە فراوانبکەم و بە شێوەیەکی تێروتەسەل لە سەری بنوسم و هەندێك لایەنی دیکەی زەمەن باس بکەم و ببێتە کتێبێك بۆ ئەوەی زیاتر سوودی بۆ خوێنەری کورد هەبێت.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دە بەش پێکهاتووە:

بەشی یەکەم، کە تەرخانکراوە بۆ بابەتی (زەمەن و مرۆڤ) باسی پەیوەندی و تێگەیشتنی مرۆڤمان کردوە بەرامبەر بە زەمەن، بۆ ئەوەی بزانیین ئەم پەیوەندیە چۆنە و لەسەر چ بنەمایەك بەندە؟ هەروەها پەیوەندی زەمەن بە دنیای ئێمەوە، بە کایەی کۆمەڵایەتی و سیستەمی بیرکردنەوەی ئێمەوە.

لە بەشی دووەمدا باس لە (پیرۆزی زەمەن)کراوە لە روانگەی هزری ئەفسانەییدا، کە لای میللەتە بەرایی و سەرەتاییەکان زەمەن بە شتێکی رەسەن و پیرۆز داندراوە، هەروەها

تەرخانکراوە بۆ (زەمەن لە ئایین و ئەفسانە و باوەڕی گەلاندا) کە تیایدا چەندین دید و هەڵوێست وبۆچوونی جیاجیای ئایین و ئەفسانەی گەلان سەبارەت بە زەمەن خراوەتە رو و باس کراون. لەم بەشەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە زەمەن لە هزر و ئەفسانە و ئایینە باوەڕی گەلاندا، رۆڵی هەبووە و بایەخی هەبووە و بیری مرۆڤی بە خۆیەوە مژول و ماندوکردوە.

بەشی سێیەم: تەرخانکراوە بۆ باسکردنی زەمەن لای کورد

بەشی چوارەم، باس لە تێڕوانینی (ئایینە یەکتاپەرستیەکان) دەکات بۆ زەمەن، هەروەها خستەنەڕووی بیروباوەری ئایینی سەبارەت بەم چەمکە.

بەشی پێنجەم، باس لە گرفتی زەمەن کراوە لە رێبازە فەلسەفیەکاندا، هەروەها لای فەیلەسوفە گریك وئیسلامیەکان و چەندین فەیلەسوفی دیکەی رۆژئاوا، کە تیایدا دید و روانگەی بیرمەند و فەیلەسوفان سەبارەت بە زەمەن خراوەتە ڕوو.

بەشی شەشەم، تەرخانکراوە بۆ باسکردنی (جۆرەکانی زەمەن) لەبەر ئەوەی چەمکی زەمەن جەستەیەکی پڕ مانایە، چەندین توخم و پێکهێنەری جیاواز بەشدارن لە پێکهێنانی ئەم جەستەیەدا، بۆیە زەمەن بۆ چەندین جۆری جیاجیا دابەش کراوە، کە لەم بەشەدا باسیان کراوە، هەروەها لەم بەشەدا باس لە هەوڵەکانی مرۆڤ کراوە بۆ زانیین و پێوانەکردنی کات و زەمەن، هەروەها ئەو رێگاو ئامرازانەی کە بەکاری هێناون بۆ پێوانەکرنی کات و گرنگترین جۆرەکانی کاتژمێر باسکراوە.

بەشی حەوتەم، کە تەرخانکراوە بۆ بابەتی (بوون و زەمەن) لەم بەشەدا ئەوەندەی بۆمان کرا و لەدەستمان هات، چەند بابەتێك کە بەند و پەیوەستن بە زەمەن، باس کراو و پەیوەندیان بە زەمەنەوە خراوەتە روو.

بەشی هەشتەم، لەم بەشەدا چەمك و تایبەتمەندیەکانی زەمەن، لەگەڵ چەمك و تایبەتمەندیەکانی مێژوو بەراورد کراوە و باس کراوە، هەروەها پێکەو ژیانی سەخت و دژواری نێوان زەمەنی چۆنیەتی و زەمەنی چەندێتی، لە رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا و لە ئەزموونی بژێوی و چالاکی تاکەکانداخراوەتە روو.

بەشی نۆیەم، کە تەرخانکراوە بۆ پەیوەندی نێوان (زەمەن، گەردوون، سروشت) کە بە شێکی گرنگی ئەم کتێبە، هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندی چەمکی زەمەن لەگەڵ دیاردە و چەمکە جیاجیاکانی وەك، گەردوون، جووڵە، شوێن، ئەبەدی، ئەزەلی...

بەشی دەیەم، تەرخانکراوە بۆ چەمکی زەمەن لە دنیای ئەدەبیاتدا، لەم بەشەدا باس لە رۆڵ و ئەرکی زەمەن کراوە لە ژانرە ئەدەبیەکاندا، هەروەها روانینی ئەدیب و نووسەران لەمەڕ ئەم چەمکە خراوەتە روو.

سەبارەت بەو گرفتانەی لەکاتی نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هاتە پێشم، کەمی سەرچاوە بوو لەسەر ئەم بابەتە.

ئومێدەوارم توانیبێتم لە خستنەڕووی بابەتەکە سەرکەوتوانە بە خوێنەرانم گەیاندبێت. خۆشحاڵم ئەم نووسینە بکەوێتە بەر دەستی خوێنەران، هەرچەندە لە کەموکوڕی بەدەر نییە، بەڵام کەموکوڕی نیشانەی چالاکی و هەنگاونانە، بۆیە سوپاسی رەخنەگر و نوسەرانی بەرێز دەکەم بۆ دەرخستنی سەرنج و تێبینیەکانیان و راستکردنەوەی هەڵەکان، لە پێناو بونیادنانی مەعریفەیەکی زیاتر، لەبەر ئەوەی هەموو بابەتێکی گرنگ لە نێو ناکۆکیەکان و مشتومڕ و رەخنەدا گەشە دەکات و جێگەی خۆی دیاری دەکات.

سوپاسی هاوڕێی بەڕێزم حەکیم عەلی دەکەم کە یارمەتی دام لە تایبکردنی بەشێکی لێکۆڵینەوەکە، هەروەها سوپاسی ئەو کەسانە دەکەم کە هاوکاریان کردم بۆ نووسینی ئەم کتێبە، سوپاسی خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە دەکەم کە ئەم نوسراوەیان خستە بەر رۆشنایی بوون.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم کتێبە کەلێنێکی بچووکی کتێبخانەی کوردی پڕبکاتەوە.

**محمد سليمان عباس**

**هەولێر- ئابی ٢٠١١**

# بەشی یەکەم

## (زەمەن و مرۆڤ)

یەکێك لە ئالۆزیەکانی چەمکی زەمەن ئەوەیە کە هەریەك لە بیرمەند و فەیلەسوف و زانایان جۆرێك لێکدانەوەیان هەیە بۆ ئەم چەمکە کە جیاوازە لەوانی تر، بۆیە تاکو ئێستا پێناسەیەك بۆ چەمکی زەمەن نەکراوە، کە هەموو زانا و فەیلەسوف و کەسانی لەم بوارە دەکۆڵنەوە، لەسەری کۆك بن و هەر بیرمەندێك لە دید و روانینی خۆیەوە پێناسەی کردوە و بە پێی تێگەیشتن و نیگای خۆی بۆ زەمەن راڤە و مانایەکی تایبەتی بە زەمەن داوە و هەموویان لەسەرتەنیا یەك ماناو پێناسە رێکنەکەوتوون، بۆیە دەتوانین بلێین چەمکی زەمەن لەم کتێبەبەدا مانا و دەلالەتی جیاجیای هەیە.

**- مێژووی زەمەن:**

مرۆڤ هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە هەستی بەهێزو کارایی زەمەن کردووە و درکی بەو گۆڕانکاریانە کردووە کە زەمەن هۆکاریەتی، بۆیە مرۆڤ ململانێی لەگەڵ زەمەندا کردووەو هەوڵی داوە چارەسەری بکات و خۆی لێیان دەرباز بکات. بینینی زەمەن وەك ڕەهەندێك و بینینی ئێستا وەك دەرئەنجامی ڕابردوو،هەروەها زەمەن وەك دەرچوون و پلاندانان و پێشکەوتن و ئایندە، ڕێگایەکە مرۆڤ خۆی پێ ناساندووە و خۆی لە بوونەوەرەکانی تر جیاکردووتەوە، واتە مرۆڤ بوونەوەرێکی زەمەنییە، زەمەن دەچێتە ناو هەموو بوونەوەرێك و

شتێکەوە و  دەخزێتە ناو سەرجەم شتەکان، واتە گشت بونەوەرو شتەکان بە ناو زەمەندا تێدەپەڕن، زەمەن ئەو شتەیە کە نابینرێت،لەناو ناچێت، فەنا نابێت،بەڵکو لەناو بەرو شیکەرەوەیە و هیچ شتێك بەبێ زەمەن بوونی نیە،لەبەر ئەوەی ئەگەر بڕوانینە هەرشتێك یان بیری لێ بکەینەوە وبە هزر خەیاڵماندا بێت، ئەوا بوونی شتەکە دەخرێتە ژێر باری زەمەنەوە.

هەر بابەت و شتێك لە ڕێگەی زەمەن (ڕابردوو،ئێستا،ئاینده)وە هەستی پێدەکەین،بۆیە زەمەن مەودای ژیانەو تەواوی ژیان بەخۆشی و ناخۆشیەوە ملکەچی خولی زەمەن دەبێت .

هەست کردن و درك کردنی مرۆڤ بەوەی کە لە زەمەندا دەژی لە ئاژەڵی جیادەکاتەوە[1].

زەمەن مەسەلەیەکی ئالۆزەو بەردەوام مرۆڤی سەرگەردان و نیگەران کردووە و سروشتی ژیانی مرۆڤی دیاری کردووەو ئیشکالیەتی زەمەن بابەتی سەرەکی ژیانی مرۆڤ بووە  و چەندان پرسیاری لەلا گەڵاڵە بووە، وەك ئایا دەشێ زەمەن بە شێوەیەکی پێچەوانە ڕاکشێت و بڕوات؟ ئایا دەشێت جیهەتێك هەبێت چەند ڕەهەندێکی هەبێت؟ زەمەن چییە؟

چۆن دەتوانین سنوورەکانی نێوان ئەمڕۆو بەیانی، ئەمڕۆ ودوێنێ درك پێبکەین و تێیان بگەین؟ئایا مرۆڤ دەتوانێ خۆی لەڕابردوو دەرباز بکات، یان ئەسیری ڕابردووەکەی خۆیەتی.

ئایا زەمەن هەیە؟ چۆنە؟ لە کوێیە؟  کەی پەیدابووە؟ کەی کۆتایی دێت؟.

ئایا زەمەن بۆ چەند بەشێکی پەیوەست و پابەند لەگەڵ یەك دابەش دەکرێت،یان وەك(ئەتۆم) دابەش دەبێت[2]؟

ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری دیکەش سەبارەت بە زەمەن لای مرۆڤی کۆن و بەرایی و هەروەها مرۆڤی سەردەمی نوێ دروست بووە و سەری هەڵداوە، بۆیە بابەتی زەمەن بووەتە جێگای سەرنج و بایەخ پێدانی خەڵك لە هەموو شونێك و لە هەمووسەردەمێکدا و بیرۆکەی زەمەن یەکێکە لەو بابەتە سەرەکیانەی کە ئاینەکان و هزری کۆن و ئەفسانە و فەیلەسف و زاناونوسەرو  شاعیرەکان بایەخیان پێداوە و لەسەریان نوسیووە، تەنانەت زەمەن لای زاناو فەیلەسووفە نوێیەکان دەروازەیەکی سەرەکییە بۆ مەعریفەت، هەر گەلێك دید و بۆچوونی جیاوازو تایبەتی لە مەڕ زەمەن هەبووە، ئەم دیدو بۆ چوونەش بەپێی جیاوازی پەرەسەندن و پێشکەوتنی مێژوو و مەعریفی و کۆمەڵایەتی لە گەلێك بۆ گەلێکی دیکە جیاوازی هەبووە،

---

١  الزمان في الفكر العربي والعالمي — د. علي شلق- مطبعة دار الهلال - بيروت- ٢٠٠٦- ل ٣٥

٢ الزمان في الفكر الديني والفلسفي- حسام الالوسي- الموسسة العربية للدراسات و النشر- بيروت- ٢٠٠٥- ل ١٢٩

واته جیاوازی شێوازەکانی ڕۆشەنبیری و هزری و هونەری و ئەدەبی لە شارستانیەتێك بۆ شارستانیەتێکی دیکە بووەتە هۆی ئەوەی بیروباوەڕو دیدی جۆراو جۆرو جیاواز سەبارەت بە بنەڕەت و شێوەکانی زەمەن پەیدا ببێت. هەروەها لەلایەکی دیکەوە،ڕاڤە و لێکدانەوەی جیاواز لەمەڕ زەمەن و چەمکی زەمەن و چیەتی زەمەن کراوە، واتە وێناندنی زەمەن لای فەیلەسوف و زاناو مرۆڤی کۆن و مرۆڤی باوەڕدار بەندو پێوەست بووە بە دید و ڕوانینە مێژوویی و ئاینەکانەوە.

بێگومان بیرۆکەی زەمەن کۆنە لە مێژووی مرۆڤایەتیداو گەل و شارستانیە کان بۆچوون و ڕێگەی جیاوازیان بۆ دیاریکردنی زەمەن هەبووە،بۆیە هەر لە کۆنەوەبووەتە پێوەرێك بۆ تەمەن و ژیان و بووەتەئەزمونێکی کۆمەڵایەتی، مادی، دەروونی و لە ئەنجامی هۆشیاری مرۆڤ بەرانبەر بەیەك بە دوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان و بەستنەوەیان بە زەمەنی سروشتی درکی بەبوونی زەمەن کردووە[1] .

لە ئەفسانەو فۆلکلۆرو کولتووری میللی گەلاندا چەند جۆرە زەمەنێك دەبینرێت و بەرچاو دەکەوێت وەك:زەمەنی واقیعی و مێژوویی، زەمەنی گەردوونی، زەمەنی ڕەها کە گوزارشت لە نەمری وجاویدانی دەکات، زەمەنی مەعریفی کە لە هزرو فەلسەفەدا بەرجەستە دەبێت،هەروەها زەمەنی سروشتی کە بەندە بەشوێن و ژینگەوە ....هەروەها زەمەن دابەش دەکرێت بۆ: زەمەنی ڕەهاو زەمەنی ڕاست و ڕێك. مەبەست لە زەمەنی ڕەها ئەو زەمەنەیە کە بەندە بە خودی خۆیەوە لە (هیچ، نەبوون) پەیدا نەبووە، هەروەها لەناو ناچێت و فەنا نابێت، کەچی زەمەنی ڕاست لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی دیکە دەگوێزرێتەوە و دەگۆڕێت،چونکە خاڵی سەرەتاو دەسپێکی هەیە. بۆیە دەشێ بڵێین زەمەن هێماو ڕەمزی جووڵانەوەیەو بیرۆکەی زەمەن ئاماژەیە بۆ خێرایی و هێواشی جووڵە، لە لایەکی دیکەوەش زەمەن بریتییە لە گەیاندن و بەردەوامی لە نێوان (ڕابردوو،ئێستا،ئاینده)هەروەها پێوەستە بە (پێش،پاش) ەوە[2] .

بۆیە زەمەن لای مرۆڤ دەلالەتی کۆمەڵایەتی و سروشتی و مەعریفی و نەفسی و شوێنی هەیە.

---

١ فكرة الزمان عبر التاريخ- تآليف (كولن ولسن و جون گرانت) ترجمه (فؤاد كامل)
عالم آلمعرفة – كويت – ١٩٩٢ – ل ١٠

٢ الزمان في الفكر العربي والعالمي – د. علي شلق- مطبعة دار الهلال - بيروت- ٢٠٠٦- ل ١١٦

- **مرۆڤ و زەمەن:**

زەمەن دیاریدەیەکی ڕاستی و واقعیە و مرۆڤ لەکۆنەوە درکی پێکردووە و خاسیەتی (بەردەوامی زەمەن)یش، بوونێکی ڕاستەقینەی پێبەخشیووە و پێوەندیەکی کارلێکردن و کارلێکراو لە نێوان مرۆڤ و زەمەندا هەیە و بەردەوامبوونی ئەم پێوەندیەش مانایەکی مرۆیی بە زەمەن بەخشیووە و بوونەتە بەشێکی سەرەکی لە خیبرەو شارەزایی مرۆیی، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو گۆڕانکاریەی بەسەر واقیعی ژیانمرۆڤدا دێن بە زەمەنەوە بەندن، بۆیە مرۆڤ هەوڵی داوە خۆی بەسەر زەمەندا زاڵ بکات . ئەو پێوەندیە ئاڵوگۆڕکراوەی لە نێوان مرۆڤ و زەمەندا هەیە، وای لە مرۆڤ و بیرمەندانی کۆن کردووە قەدەرو چارەنووسی مرۆڤ بە زەمەن ببەستنەوە و بڕوایان وابێت کە زەمەن هیواو نسکۆ و شکستی مرۆڤی لە خۆی گرتووە و پێشبینی مردن و لەناوچوونی مرۆڤ دەکات.ئەگەرچی مرۆڤ هۆشیاری و شارەزایی سەبارەت بە زەمەن هەبووە و پەیدا کردووە، کەچی دیاریکردنی مانا و چەمکی زەمەن شتێکی گران و زەحمەت بووە،بۆیە کاتێك لە (قدیس ئۆگستین) یان پرسی: زەمەن چییە؟

ئەویش لە وەڵامدا گووتی: ئەگەر لێم بپرسن نازانم، بەڵام ئەگەر لێم نەپرسن ئەوا دەزانم زەمەن چییە [1] .

هەروەها مرۆڤ بایەخی بە زەمەن داوە،چونکە خزین و جوڵانەوە خاسیەتی سروشتی زەمەن و بە دیدی مرۆڤ زەمەن بەرجەستەی ئەو چالاکی و جووڵە

هەمیشەییە کە لە دەروون و ناخی نەفسی مرۆڤدا هەن.واتەزەمەن ژیان و چالاکی و کارایی و نەفسی مرۆڤایەتین و ئێمە لەمیانی زەمەندا خۆمان دەناسین و هەست بە زات و خودی خۆمان دەکەین،چونکە زەمەن گەشەکردن و ڕووخساری ئەم زاتە دیاری دەکات،هەروەها لەبەر ئەوەی زەمەن پێوەندی بە چارەنووسی مرۆڤەوە هەیە [2] .

مرۆڤ لەناو زەمەندا بوونی هەیەو بەسەریدا سەپاوە،کە فەنابێت و لەناو بچێت، چارەنووس و قەدەری مرۆڤە کە دەبێ لە شانۆی زەمەنی ئێستا بڕوات بۆ زەمەنی ڕابردوو.مرۆڤ هەست و درکی بە تێپەڕبوون و کارایی زەمەن کردووە بڕوای وابووە، کە گۆڕانکاریەکانی بەسەر مرۆڤ کۆمەڵدا دێن زەمەن هەمووی لە خۆ گرتووەو پێکهێناوە [3] .

---

١ المذاهب الكبري في التاريخ- ج. ويدجيري- ترجمة ذوقان قرقوط- بيروت- ١٩٧٩- ل ١٤٨

٢ الزمان في الفكر الديني والفلسفي- ل١٧٣

٣ الزمان في الفكر العربي- ل٣٩

کەواتە ڕوباری زەمەن مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەبات بێ ئەوەی پشووی بداتێ و ئێمە ناتوانین ڕژان و دەرپەڕینی زەمەن ڕابگرین و بیگەڕێنینەوە بۆ دواوە . چەمك و دیدی مرۆڤ بۆ زەمەن لە بەدوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژو خولی ساڵانە و هاتن و نوێبوونەوەی وەرزەکان و کاریگەریان لەسەر گەشەکردن و سیسبوونی ڕووەك سەرچاوەی گرتووە و لێوەرگرتووە.

**- زەمەن و بزاڤی ژیان:**

ڕەنگە مرۆڤ هەندێك جار بپرسێت، چی ڕوودەدات ئەگەرهەستکردن بەزەمەن لای مرۆڤ نەمێنێت؟

مرۆڤ لە ترۆپکی بڕیارەکانیدا بە دوای مێژوویەکی نوێ و خودێکی نوێ و زەمەنێکی نوێدا دەگەڕێ، ئەگەر زەمەن لە خودی خۆیدا ڕاستی و حەقیقەتێك بێت یا بنوێنێت، ئەوا هەستکردن بە زەمەن ئەوکاتەدێتە دی وبەرجەستە دەبێت، کاتێك کە کارلێکردنێك هەبێت لە نێوان ڕاستی و حەقیقەتی بوونی زەمەن و فاکتەری مرۆیی، نەمانی ئەو هەستەش حاڵەتی دابڕان نیشاندەدات. هەرچەندە مرۆڤ لەگەڵ ئەو داهێنراوانەدا هەڵسوکەوت دەکات، ئەم کارەش درزێکی گەورەی لەناوخۆیدا دروستکردوە، والێکردوە دابڕێت لە ئێستای و رابردوو لەبیربکات و لە داهاتووش بترسێت، ئەم دابڕانە لە زەمەن بە هەموو دووریەکانییەوە مرۆڤی والێکردوە، پەنابباتە بەر خەیاڵ وخەونە بینین، بۆ ئەوەی رۆڵی قەرەبووکردنەوە ببینێت لە بری ئەو واقیعە لەرزۆك و ناجێگیرە.

هۆی ئەو بێ ئارامییەی لای مرۆڤ بەرامبەر بە زەمەنی ڕاستەقینە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یەکێك لە تایبەتمەنیەکانی زەمەن ئەستەمی گەڕانەوەیەتی، ئەستەمی گەڕانەوەی زەمەنیش لە دەروونی مرۆڤدا بێئارامی دروست دەکات، بەم جۆرە زەمەن ململانێ لەگەڵ مرۆڤدا دەکات، ئەگەر مرۆڤیش بیەوێت وەڵامی ململانێیەکەی بداتەوە، لە ڕێگەی تێکۆشانەووە لەو ڕێگەیەوە دەبێت سروشتی زەمەن تێبگات و بیشێوێنێت، ئەویش بە وێناکردنی زەمەن بە وێنایەك کە دی سروشتی زەمەن بێت وەك ئەوەی وێنای بکات بە شوێن [1].

هەڵبەت "زەمەن" و هەستکرددن بە زەمەن ئەو چوارچێوەیەیە کە تیایدا جوڵاندنەوەی بون و زیندەگی توانا شاراوەکانی خۆیان بەرجەستە دەکەن. ئاخۆ هەموو بونەوەرەکان بەشێکن لەو "یاری ئەگەرکارییەی" کە زەمەن و سروشت دەیکەن، زنجیرە بەیەکدا چووەکانی ئەگەرکاری سەرچاوەی

---

١ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- مەریوان عەبدول- دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی- هەولێر- ٢٠٠٩- ل٨٠

هەمەڕەنگەکی بێسنوور وفرەشێوە نیین بۆ زەمەن، هەر چرکەیە و ئاوێنەی ئەگەرێکە، لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە "چۆنایەتی " و جیاوازی " چۆنایەتیەکان" لە خودی زەمەن بستێنینەوە، و ببەخشین بە عەقلّ، بەلّکو زەمەن تەنها بە تێکەلاّوبونی لەگەلّ "چییەتی/ ماهیە"گۆڕدراوی شتەکاندا زنجیرەیە چۆنایەتی گۆڕدراو دروست دەکاتکە بەردەوام دەگۆڕدرێن "چرکە جیاوازەکانی چۆنایەتی " لە جیهانی دەرەوەدا، جەوهەری تایبەتی زەمەنە [١].

کاتیّ "چۆنایەتی " ساتەکان بە تەنها بگێڕینەوە بۆ خودی زەمەن و بە خەسلّەتی زەمەنیان لە قەلّەمبدەین، ئەوا خۆمان یان لە ناو جیهانی بابەتدا نوقمکردوە، یان زەمەنمان وەکو رەهایەکی (نیوتن)ی فرێداوەتە دەرەوەی مادەو دەرەوەی ئەزموونەکانی مرۆڤ، بەم جۆرە هەمەڕەنگی زەمەن، وەکو هەمەڕەنگیی پەیوەندی مرۆڤ بە جیهانەوەیە [٢].

واتە زەمەنی جیاواز بریتیە لە درەوشانەوەیەکی جیاوازی مانای هاوبەش لە نێوان عەقلّ و دونیادا، کەواتە ئەوەی ناوی دەنێین چرکە یان هەستکردن بە زەمەن، هەستکردنێکی راستەوخۆیە بە پەیوەندی عەقلّ و جیهان لە حالّەتی پەرەسەندندا [٣].

پێویستە دەرك بەوە بکەین کە زەمەن هۆکار و فاکتەری پێشکەوتنە، هەروەها وەك هێزێکی کارا رۆلّی لە بوون و ژیاندا هەیە و دەردەکەوێت. ژیانی رۆژانە پەیوەستە بە شوناسی جێگیر، ئایا دەکریّ شوناس لە زەمەن و شوێندا جێگیربکرێت؟

رەنگە بەهای زەمەن لە گشتگیریەکەی و هەم لە تایبەتمەندیەکەیدا بێت و ئەگەر شمولی وگشتگیری رەهەندی ژیاری زەمەن بێت، ئەوا تایبەتمەندی رەهەندە فەردیەکەی زەمەنە، لەبەرئەوەی بەهای دەسکەوتەکانی ژیار و شارستانیەت پەیوەستە بە بوونی مرۆڤەوە، بۆیە پەیوەندیەکی ئەندامی هەیە لە نێوان رەهەندی گشتگیری و تاکایەتیدا، بۆیە وەستانی زەمەن لە رووی ژیاریەوە، مانای وەستاندنی زەمەنی مرۆیی ئەبەخشێت [٤] .

هەندێك مرۆڤ پێویستی بە چەند سالّێك هەیە بۆ ئەوەی هەست بە شارەزاییەکانی ژیان بکات، هەندێکیشیان پێویستیان بە چەند مانگێك یا بە چەند رۆژێکی کەم هەیە، بۆیە وای لیّ

---

١ گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ٦- سالّی، ١٩٩٨- ل ١٥

٢ گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ٦- سالّی، ١٩٩٨- ل ١٥

٣ هەمان سەرچاوە- ل ١٦

٤ مجلە –افاق عربیە، ع-١٢- سنە- ١٩٨٧- ل٦٠

هاتووە هەموو تاکێك زەمەنی تایبەتی خۆی هەیە، یان زەمەنی کەسی یان خودیی هەیە، کە زەمەنێکی ڕێژەییە و ناکرێ بپێورێت، زەمەنی خودیش زەمەنێکی دیارنەکراو و سنووردار نییە لە پەیوەستبوونی بە مرۆڤەوە.

ئێمە کات دەگوزەرێنین وکەچی لە هەمان کاتیشدا هەوڵدەدەین به ئارامیەوە پێکی بهێنین، لێرەوەیە کە ئێمە کات دەگۆڕینەوە به شوێن، شوێنیش دەستبەسەرداگرتنی ئاسانترە وەك لە کات، بۆ ئێمە کات ئەرك و مەترسییە بەسەرمانەوە، لەبەرئەوەیە کە ئێمە لە پیادەکردنی رۆژانەماندا زۆر حەز بە لەناوبردنی کات دەکەین [1]. لە ناو کاتدا هیچ لەحزەیەك دووبارە ناگەڕێتەوە، هیچ پنتێکی- ئێستا شیاوی گلدانەوە نییە. تەنیا تاك هەوڵنادات ڕووبەڕووبونەوەی کات کەم کاتەوە، بەڵکو تەواوی کلتوورەکان ئەوە دەکەن. ئێمە بەروو ڕووی ئایندە ڕەوت دەکەین کەچی وەها ڕەفتار دەکەین وەك ئەوەی دەستمان بەسەریدا گرتبێت.

هەنوکەی ئێمە ئەو ساتەیە کە هەرگیز ناشێت لەوەوبەر ببوایە یان لە داهاتوودا ببێت.

**- گرنگی زەمەن و کات لە ژیانی مرۆڤدا:**

زەمەن لە زۆر ڕووەوە گوزارشت لە، ژیان، ئازدای، هێنانەدی و بەرهەمهێنان، دەکاتن، گوزارشتی ژیان، لەبەرئەوەی زەمەن جیاوازە لە جێگری وەستان و چەق بەستوویی، بۆیە زەمەن بەڵگە و هێمای بزاڤ و جووڵە وکارلێکردنە، تەنانەت خودی ژیان بریتیە لە جووڵە وکارلێکردن.

لە گشت بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا (زەمەن) شوێنێکی کاریگەر و دیاری هەیە، ئەرێنیانە و نەرێنیانە کار لە ژیان رۆژان-ە و تێکڕانی تەمەنی دەکات، چۆنیەتی بەکارهێنانی (کات)یش چارەنوسسازانە سیماکانی ئایندەی مرۆڤ دیاری دەکا [2].

زەمەن لە ئەدەبدا گوزەر دەکات وەك چۆن لە ژیانماندا گوزەر دەکات، بەشێوەی ئینسیابی کە درێژئەبێتەوە بە پێی بەدواهاتنی قۆناغە مێژووییەکان تا ئەو کاتەی گۆرانکاریە ژیارییە گەورەکان ڕوویاندا و تا ئێستاش بەردەوامە و بەبێ وەستانیش بەردەوام دەبێت. هێما و نیشانەکانی زەمەن لە زۆر بابەت و شتدا دەبینرێ و بەدیدەکرێت، بۆیە دەتوانیین زەمەن بکەینە تاکە هۆکار بۆ پەیوەستبوون و پەیوەندی لە بواری جیاجیا وەك: ژیان، مۆسیقا، مێژوو، فیکر،

١ گۆڤاری ڕەهەند- ژمارە، ١٨-١٩ - ساڵی، ١٩٩٨- ل ٢٩١

٢ فەرهەنگی کات لە کوردەواریدا — عەبدولوەهاب شێخانی- زنجیرە کتێبی کەلەپوری-هەولێر- ٢٠٠٧- ل ١٠

هەست،.... لێرەدا دەبینین کاتیش پەیوەستە بە بایەخدانمان کاتێك هەیە تیادا دەچین بۆ کار، کاتێك هەیە بۆ حەوانەوە، کاتێك بۆ خەوتن...

مرۆڤ لە رێی ریتمە سەرەکیەکانی ژیانەوە لە جیهاندا هۆشیاری دەبێت بە زەمەن و کات بەر لەوەی ئەو ریتمانە لە کاتژمێردا پێکەوە ببەسترێنەوە[1].

ئێمە هەرچۆنێك بجولێینەوە لە ناو چرکەیەکداین دیواری چرکەکان سنووردار یان کردووین، بەڵام چۆنایەتی ساتەکان رەنگدانەوەی پەیوەندی ئێمەن بە رەوتی عەقڵ و رەوتی جیهانەوە. چرکە بەتاڵەکان زیندانن لەبەر ئەوە ئێمە هەر کات توانامان نەبوو جەوهەرێکی جیاوازیان لێ دروستبکەین، مانا کۆنەکان داگیریان دەکەن، کە توانامان نەبوو ئەو جووڵە ناوەکیەی زەمەن ببینین تارمایی چۆنایەتییە کۆنەکان لە پشت پەردە دەگەڕێنەوە و دادەمەزرێن[2].

کاتێك وێنەکانی ژیان لێکدەدەین ئەوکاتە رەنگە بتوانین بگەینە کرۆك و حەقیقەتی زەمەن، هەروەها ئەوکاتەی کە لە زەمەنی رووت و موجەرەد گوزەردەکەین بۆ زەمەنی زیندەگی هەستپێکراو، با ئەم شێواز و پێکهاتەیە دووبارەبکەینەوە، زەمەن هاوتایە لەگەڵ ژیان، لەبەرئەوەی ژیان بریتیە لە هێنانەدی و رێکخستنی چەند ئەرکێکی بەدوایەکدا هاتوو، هەروەها ژیان بەردەوام شتەکان لەخۆ دەگرێت، ژیانێکی هاوسەنگ و هێمنی وئارامی، مۆسیقای بەجۆش و سەرنج راکێش، خەونێکی خۆش، هزرێکی ساف و بێگەرد، ئەمانە ئەوە دەردەخەن و بەڵگەی ئەوەن کە زەمەن بەردەوامە و گشت ئەم ئەزموونانە ئەو پیشاندەدەن کە زەمەن هاوتای بوون وژیانە. بۆیە گۆڕان و گۆشەنیگای هەموو زانستەکان بە زەمەن دەستپێدەکات و ئەو خەڵکانەی کە لەگەڵ ئەو گۆرانکاریە ژیارییانەدا نەگونجاون، یان یەکیان نەگرتۆتەوە ئەوە زەمەن دوورەپەرێزی کردون و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە لە زەمەنێکدا دەژین کە بەسەرچووەو لەگەڵ بونیان لە رووی جەستەیی ومادیەوە لە زەمەنی ئێستادا، بەڵام ئەوانەی کارلێکیان لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا کردوە و سوودیان لێ بینیوە، ئەوانە توانیویانە لە کاتی خۆیاندا بژین و سوودی لێ ببینن بە ۆرێکی وا بەردەوامی ژیانیان مسۆگەر بکات، لە کاتێکدا کەسانی دیکە پێش ئەمانە کەوتوون و تەحەدای زەمەنیان کردوە و بەرێکوپێکی توانیویانە بچنە داهاتوو و

---

١ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- وەرگێرانی، ئازاد بەرزنجی-دەزگـای چـاپ و پەخشـی سـەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧- ل١٤٩

٢ گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ٦- ل ٢١

هەندێك ئاگایی پێشبینی چاوەڕوانكراویان دەرهێناوە، ئەوانە خۆیانن داهێنەرەكان و دۆزەرەوەكان و هونەرمەندەكان و... ئەوانە لە زەمەن دەرچوون و دژایەتی یاساكانی كردوە هەندێكیان كارین كردوە لە سەر خێراكردنی زەمەن و تەكان پێدانی بەجۆرێك ئەوان داوای سەرپەرشتی چەند قۆناغێكی داهاتووی دووردەكەن، ئەوان هێشتا لە ئێستایاندا دەژین، چ ئەوانەی بەگەشبینیەوە سەیری داهاتوویان كردوە، یان ئەوانەی بە تێڕوانینێكی نێگەتیڤیەوە بۆی دەروانن، بە روونی دەكرێت تێبینی ئەوەبكرێت لە رۆمان و شاكارە هونەریەكان و تیۆرە گرنگەكان كارو چالاكییانەی شانۆیانەی لە داهاتوودا روودەدەن.

ئەو مرۆڤانەی كاتیان بڕیوە و بۆ ئاینده دەڕوانن، ئەوە ئومێد و خواست و تەماعەكانیان داناوە لەو كاتەی تێیدان و باوەڕ یان بە كاتی هەنووكەیی نییە، بۆیە گەشە دەدەن بە كاتی ئێستایان بە مەبەستی گەیشتنە ئامانێكی دیاریكراو، هەندێكیشیان لەو نێوەندەدا گیریان خواردوە و پەنایان بردوە بۆ سۆزگرتن و پیاهەڵدان بە زەمەنی كراوە یان ئەو زەمەنەی درێژدەبێتەوە، دەستیان كردوە بە قسەكردن لە بارەی ئازار و لەدەستدان و غوربەت و تراژیدیای ژیان، بە جۆرێك دەربازبوون لێی مەحاڵە [1].

بە تەواوی و بە وردی نازانیین مێشكی مرۆڤ چۆن سەرەدەری و تەعامل لەگەڵ زەمەندا دەكات و چۆن دەركی پێدەكات؟ بۆیە تێگەیشتنی مرۆڤ لە زەمەن مێژووی هەیە و بە پێی شارستانیەكان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، جا تێگەیشتنمان لەو راستیە بەرهەمی هەستی تایبەتیمانە بە مێژوو و بەو ژیانەی لە سەردەمی رێژەییدا دەیگوزەرێنین [2].

كەواتە مرۆڤ خاوەن هەستی یادەوەری و دركپێكردن و پێشبینیكردنە، لە نێو تۆرێكدا ژیانی خۆی رێكدەخات، كە لە رابردوو و ئێستا و داهاتوو پێكهاتووە، واتە زەمەن پێكدێت لە: رابردوویەك كە یاد دەكرێتەوە و لە ئێستایەك كە هەست و دەركی پێدەكرێت و ئایندەیەك كە پێشبینی دەكرێت.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا زەمەن رێڕەوێكی نوێی وەرگرت، كە سیفاتە بنەڕەتیەكانی بریتین لە " خەزن كردن، چڕكردنەوە، نیگەرانی و دڵەڕاوكێ" وای لێهاتووە، ئەو كەسەی یەك ساڵ دەژی، وەك ئەوە وایە كە دە ساڵ ژیابێت لە سەدەكانی رابردوودا و ئەوەش كە پێی دەگوترێت

١ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢، ل٢٠

٢ گۆڤاری، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ — ل ١٤٢

"ململانێی زەمەن" له ئەنجامی ئاڵۆزبونی تەفسیلاتی ژیان و دیاردەکانیەتی. هەندێك گەڕانەوه بۆ بیرکردنەوه له رابردوو وەك دژه کاردانەوەیەکی ئەو ترسەی بۆته خاوەنی مرۆڤ که رووبەرووی ململانێی توند دەبێتەوه لەگەڵ ژیاندا.

دەکرێ بڵێین،خاسیەت و سیماکانی جووڵەی زەمەن له ژیاندا بریتین له:

١ — زەمەن توخمێکی گرنگه له جووڵەدا، چونکه جووله بریتیه له گواستنەوه لەبارودۆخێك بۆ بارودۆخێکی دیکه، ئەم بزاڤ و کردەوه و پەرەسەندەش له ڕێگەی زەمەنەوه ئەنجامدەدرێت.

٢ — بەستنەوەی بزوتنەوەی تاك به جووڵەی گشتی کۆمەڵگە، لەبەرئەوەی مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەته، بۆیه ئەو جوولەیەی مرۆڤ ئەنجامیدەدات، جوولەیەکه بەنده به کۆمەڵگە.

٣ — رەنگه پەیوەندیەك هەبێت له نێوان سەربەستی و زەمەن و ئازادکرن و رەهاکردنی تواناکانی مرۆڤ و کرانەوەیان وا له مرۆڤ دەکات، ئاراستەکانی ژیان بەرەوهێنانەدی ئامانجێك ببات: مرۆڤ- ئازادی، ئازادی ژیانه، ژیانیش جووڵەیه، جوولەیەکی مەبەستداریش پێشکەوتنه، پێوەری پێشکەوتنیش زەمەنه[1] .

له بارەی گرنگی زەمەن (چارلز لامپ) له سەدەی نوزدەم نوسیویەتی: " هیچ شتێك له گەردووندا، وەك زەمەن سەرسامم ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا زەمەن له هەموو شتێك کەمتر بێزارم دەکات- نابێته مایەی بێزاریم- چونکه به هیچ شێوەیەك بیری لێناکەمەوه[2].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، که زەمەن ئەو فەزایەیه که مێژوو رەهایەکی بنەرەتی شاردراوه و ئاشکرای تێدا بەرقەرار کردووه له ڕێی بابەتەوه که بریتیه له قەیران و کێشه دەرەکی و ناوەکیەکانی تاك و کۆمەڵ و ئەرێ و نەرێیەکان و وروژاندن له مەڕ پێکهاتەکانی و ژیاری مرۆڤایەتی لەوێ له ئاینده و رابردوو و هەنووکه.

دەبێ دەرك بەوەبکەین که ئەزموونەکانی زانینی مرۆڤ له سنوری کات و شوێن دەرناچن، چونکه کات و شوێن دوو مەرجی پێشترن بۆ زانین و به بێ کاتێکی دیاریکراو و (شوێن)ێك ئەزموونه هەستیەکانم ناتوانن زانینم بۆ پەیدا بکەن، بەڵام مرۆڤ له ئەزمونەکانیدا ئاگای له بونی کات و شوێن نییه [3].

---

١ مجلة —افاق عربية، ع-١٢- سنة-١٩٨٧- ل ٦٢

٢ — الكون في قشرة الجوز- تاليف ستيظن هوكنط- ترجمة، مصطفا ابراهيم فهمي- كويت- ٢٠٠٣- ل٣٥

٣ بوون و داهێنان، د. محمد كمال، سلێمانی، ٢٠٠٤ — ل ٢٤

کەواتە، کات مەرجی بوونە لای هەر مرۆڤێك، هەروەها مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگەی کاتەوە، وەك کەسێتیەك خۆی بناسێت و ئەو کاتەی کە تاك تیایدا دەژی، دەرفەتی ئەوەی پێدەدات، وەکو بونەوەرێکی ئەخلاقی خۆی بناسێت، کە سەرقاڵی گەڕانە بەدوای حەقیقەتدا. ویژدانی مرۆیی لە بونی خۆیدا پابەندە بە کاتەوە.

- **بونیاد، بارودۆخ، شۆڕش:**

ڕووداوەکان ئاکامی لەدایکبووی بونیاد و هەلومەرج وبارودۆخێکی دیاریکراون، دەرکەوتنێکی بینراوی دابڕانەکانی هاوسەنگیە، یان دووبارە دامەزراندنەوەی ئەو هاوسەنگیەیە.

گۆڕنکاری بونیادەکانیش، داهێنراوێکن کە ڕێگە دەدەن لە پێویستیە کۆن و باوەکان ڕەتبن، واتە گۆڕانکاری چۆنیەتیە، دابرانێکە لە بەردەوامبوون. کەواتە زەمەنی بونیاد، زەمەنێکی زۆر خاو و هێواشە، وەك وەستاوە، دەکرێ بڵێین لە ناو هەر شێوازێکدا بونیادێك هەیە بێ جوڵەیە. بەڵام بەراوردکرنی بونیادە یەکبەدوای یەکەکان، ئەوە دەردەخات، کە ئەم جۆرە زەمەنە، زەمەنی گۆڕانکاریەکانی یەك ئاراستەیە: کە شێوازی بونیادەکە دەگۆڕێت بۆ شێوازێکی دیکە، زۆر جار وشەی (شۆڕش) بۆ ئەم گۆڕنکارییە بەکاردێت [1].

زەمەن لە ڕوانگە و پرۆسیسی مێژوونوساندا، هەروەها لە پرۆسیسی ئابوریناساندا، وەك خۆی نەماوەتەوە کە بریتی بێت لە: تەنینەوە ورۆیینێك بێت کە دیاردەکان لەخۆبگرێت، هاو شێوەی ئەو تەنانەی کە ڕوبارێك لەگەڵ خۆیدا بەرەو دوور بیبات [2]. بەڵکو زەمەن ڕێکخراو و ڕێك ڕاستە، کە لە شێوەی ستوونەکانی مێژوو لە خشتەکانی ڕۆژمێردا. لە واقیعدا ڕۆڵی ئامرازێك دەبینێت بۆ زانیین و پێوانەکردنی گۆڕانکاریەکان و بە بەراوردکردنی ئەم گۆرانکاریانە لەگەڵ یەکتردا [3].

پرسیاری کرۆنۆزۆفی باو ئەوەیە، ئایا زەمەنی مێژوو خولی یە، یان ڕاستەهێلیە، یان وەستاوە؟ ئەمە پرسیاریکی ساویلکە و بێ مانایە، چونکە تۆبۆلۆجیای ئەم سێ زەمەنە، کە

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ترجمة، بدرالدين عرودكي- المنظمة العربية للترجمة- بيروت، ٢٠٠٩- ل ١٤٥

٢ نظام الزمان- ل ١٥٣

٣ نظام الزمان- ل ١٥٣

مافی خۆمانە لەیەکتریان جیابکەینەوە، بە گوێرەی پێویست و شیکردنەوەی لۆجیکی، لە راستیدا ئەو زەمەنانە تێکەڵی یەکن [١].

مێژوونوس بایەخ بە زەمەنی رووت و موجەرەد نادات، بەڵکو بایەخ بە بوونی زەمەنی گەوهەری دەدات، ئەو پرۆسانەی کە توێژینەوەیان لەسەر دەکات، کە لە رەوتی گۆرانکاریەکان خۆیان دەنوێنن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانیین کە گۆڕنکاریەکان زۆرن و و ئاراستە ورەوتەکانیان لەیەکتر جیان [٢]. بەم شێوەیە زەمەنی مێژوو بزردەبێت لە ناو ئەو زەمەنە جەوهەرییانەی پرۆسەکانی مێژوو: سیاسەت، کۆمەڵایەتی، ئایین.

لێرەدا پرسیارێك قیتدەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە، ئایا زەمەنی مێژووی گشتگیر چییە؟

تۆبۆلۆجیای زەمەنی مێژووی گشتگیر زۆر ئاڵۆزە: پێکهاتووە لە خوولی بەدوایەکداهاتوو: نەشونماکردن، وەستان، داتەپین، گەشەکردن، ئەم خولانە، پێویستیەکانی بونیاد بەرهەمدێنن، کە هەندێك لە گۆڕانکارییە گەوهەرییەکان دەستنیشاندەکەن. دواتر هێواش هێواش توشی داخوران و داتەپین دەبێت، یانیش دەوەستێت پێش ئەوەی بە هۆی گۆڕانێکی لەناکاوە (وەك شۆڕش) دەبێتە پێویستیەك لە شێوازێکی نوێ. لە میانی گۆڕانی ئەم بونیادە خاوانە، خول و شۆڕشەکان لە هەندێك بواردا دێتەدی [٣]. لەم بارەیەوە، بیرتۆ بیریە، دەڵێ: شۆڕش بریتیە لە تاقیگەیەك لە رووداوو شەپۆڵەکەی لە شوێن و زەمەندا بڵاو دەبێتەوە. داهات(حدب)یش تەنها گۆڕانکاری نییە لە جیهانی دەوروبەر، بەڵکو دابڕانە لە بار و حاڵەتی پێشوو [٤]. واتە داهات، بریتیە لە گۆڕانێکی دەرکپێکراو و گواستنەوەی لە جیهانی دەرکپێکراو بۆ بواری دووبارە بونیاد نانەوەی.

پێویستە ئاماژە بەوەبکەین، کە دابڕان لە هەموو جێگایەکدا پێویستە، بەڵام هەرگیز دابڕان لە یەك ساتدا لە هەموو کایەکان ولە هەموو بوارەکاندا روونادات. هەروەها لە رێگای ئەو دابرانەشەوە هەستدەکەین زەمەن جوڵەیەکی ناوەکی و ئاڵۆزی هەیە

---

١ نظام الزمان- ل ١٥٥

٢ نظام الزمان- ل ١٥٦

٣ نظام الزمان- ل ١٥٨

٤ هەمان سەرچاوە- ل ٦٩

**- زەمەن و عەقڵی ئێمە:**

پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت کە مرۆڤ ئاژەڵێکی بیرکەرەوەیە، بۆیە کە لایەنە بایۆلۆژیەکەی باس دەکەین، پێویستە لایەنە دەرونیەکەی فەرامۆش نەکەین. کەواتە لایەنە دەرونیەکەی مرۆڤ بۆ زەمەن چییە؟

وادیارە کە سێ دیاردەی سەرەکی هەیە بۆ هەڵسەنگاندنی مرۆڤی هۆشیار بۆ زەمەن: ئاگاداری بە زەمەنی ئەمڕۆ، دەرکردن بە قۆناغە زەمەنیەکان، درێژکردنەوەی ئاگایی لە میانی زەمەندا لە رابردوو و داهاتوو لە رێگەی یادەوەری و پێشبینی.

دیاردەی یەکەم، بریتیە لە هەستکردن بە زەمەنی ئەمڕۆی رۆژانە، کە لە هەردوو دیاردەکەی دیکە زیاتر دەردەکەوێت، لەبەرئەوەی ناوەرۆك و سەنتەری بونیادی ژیاری ئێمەیە، و روو لە هەرکوێیەك بکەین دەبینین خشتەی زەمەنی و خشتەی کاتەکانی کارکردن و لەبەرچاومانە، بۆیە ناکری تەسەوری ژیانێك بکەیت بە بێ ئاگایی و هەستکردن بە زەمەن، تەنها لە کاتی پشوداندا نەبێت، بۆیە کاتژمێر رۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ دیارکرن کاتەکانمان و ئەرك و کارەکانمان[1].

هەندێك خەڵك هەن بەهرەیەکی رەمەکیان هەیە سەبارەت بە کات و زۆر جار پێویستیان بە کاتژمێر نییە، وادیارە کە ئەم بەهرەیە واتە هەستکردن بە زەمەن لە ئاکامی ئەزمون وفێربوون دەستدەکەوێت، بۆ نمونە پارێزەرەکان و بیسنزمانەکان، بەردەوام پێویستیان بەوە هەیە کە بزانن کات چەندە.

دیاردەکەی دووەم پەیوەستە بە درکردن بە ماوە یان بە بەردەوامی زەمەن، توانایی زانیین و هەڵسەنگاندنی ماوەی رووداوێك لای منداڵ زوو گەشەدەکات و لای باڵقەکان ئەم هەڵسەنگاندنە زیاتر گەشە دەکات، بەڵام هەڵسەنگانەکە توشی پشێوی ئەبێت بە هۆی چەندین هۆکار، رەنگە مایە کیمابیەکان هۆکارێك بن بۆ شێواندنی هەستکردنمان بە زەمەن، بۆ نمونە خوێی ترشی بریتۆریك، یان ئۆکسیدی نایترۆجین، یان کەمی ئۆکسجین، کاریگەریان هەیە لەسەر هێواشکردنی خێرایی زەمەنی خودی، کەچی مادە هۆشبەرەکانی وەك، ئەمفیتامینات، یان سیرۆکسین، کاریگەریان هەیە لەسەر خێراکرنی زەمەنی خودی[2].

---

١ فکرة الزمن عبر التاریخ ـ ل١٤٤

٢ فکرة الزمن عبر التاریخ ـ ل١٤٨

دیاردەی سێیەم پەیوەستەبە گەشەکردنی نرخاندنمان بۆ زەمەن کە بریتیە درێژەکێشانی زەمەنی ئاگایی لە ئیستاوە بۆ ئایندە، بۆ نمونە نرخاندنی زەمەن لای منداڵ زۆر دوور ناروات و یادگاریەکانی بۆ چەند مانگی رابردوو لە یاد دەبێت و ناتوانێت پێشبینی زەمەنی بۆ داهاتوو هەبێت، بەڵام لای هەرزەکار وگەنجەکان داهاتوو مەبەستی سەرەکیانە لە ژیاندا و هەمیشە بیر لە ئایندە دەکەنەوە و پێوەی مژولن و هیواو ئومێدیان بە ئایندە هەیەو دەڵێن: " ئەگەر گەورەبم وا دەکەم ......"، کەچی بە پێچەوانەوە پیرەکان بەردەوام یادی رابردوو دەکەنەوە و دەڵین" کاتێ لاو بووم..." و لە نێوان ئەم دوو نرخاندنەدا، پێویستە عەقڵی مرۆڤی کامڵ هەمیشە بروات بۆ رابردوو و داهاتوو، و سوود لە یادەوەریەکانی وەربگرێت بۆ پێشبینی کردن و پلاندانان بۆ داهاتوو[١].

ئەم دوو چەمکە (زەمەن و عەقڵ) هەرچەندە جیاوازن لە یەکتری، بەڵام لەبەرچاوی ئێمە هەندێك جار پەیوەندیەکی بە هێز پێکەوەیان ئەبەستێتەوە، جەستەمان لە جیهانی زەمەنی یەك ئاراستەدایە، بەڵام عەقڵمان وانییە. کاتێك مرۆڤ هزرو خەیاڵی دەڕوات و پەرت دەبێت و دەچێتە "شوێنێکی دیکە" بۆ زەمەن و شوێنێکی تر، یا بیر لە زەمن و شوێنێکی تر دەکەیتەوە. بۆ نموونە ئێمە ژیانی رۆژانەی خۆمان لە ناو چوارچێوەیەکی زەمەنی و شوێندا دەگوزەرێنین و بەسەردەبەین و هۆش و ئاگایی خۆمان زیاتر بۆ دەرکپێکردنی رووداوەکانی دەوروبەرمان بەکارئەهێنین، کەچی شاعیر و فەیلەسوف و هزرمەندان، هۆش و عەقڵی خۆیان بۆ مەبەستێکی دیکە ولە بوارێکی دیکەدا بەکاردەهێنن و هەندێکیان توانای خەیاڵکردنیان بەهێزە و سەفەر دەکات بۆ دنیا و زەمەنی دیکە[٢].

لە کاتی خۆشیەکی گەورە، یان موغامەرەیەکی سەرکێشانە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە جیهان و ژیان فراوانترە و بێسنووە و زۆر شت هەیە ئێمە نەمان کردوە و بیرمان لێ نەکردۆتەوە، ئەو کاتە درك بەوە دەکەین کە عەقڵی مرۆڤ پەی بە زۆر شت ئەبات و توانایەکی گەورەی هەیە، بەڵام ئێمە تاکو ئیستا بەباشی بەکارمان نەهێناوە و سوودمان لێ وەرنەگرتووە[٣].

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە ئێمە کۆیلەی زەمەنین، و رەگی ئەم بیرۆکەیە لە لە ناخماندایە بۆیە ئێمە بە ئاسانی باوەڕ بەم بیرۆکەیە دەکەین، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم بیرۆکەیە ناتەواو بایە، ئەوا ژیان بەو شێوەیەی ئێستا نەدەبوو.

---

١ فکرة الزمن عبر التاریخ ـ ل١٥٠

٢ فکرة الزمن عبر التاریخ ـ ل٢٩٥

٣ فکرة الزمن عبر التاریخ ـــل٢٩٥

# بەشی دووەم

## (زەمەن لە هزری ئەفسانەیی و باوەڕی گەلاندا)

**- بیرۆکەی زەمەن لە هزری سەرەتاییدا:**

مرۆڤی بەرایی دیدێکی دیاری کراوی بۆ چەمکی زەمەن هەبووە،کە ئەم دیدو ڕوانینە ی و بەندبووەبە سروشتی ئابووری و بنەماکانی کۆمەڵەوە،واتە مرۆڤی کۆن و بەرایی بە پێی پێویستیەکانی ژیان و داواکاریەکانی بایەخی بە زەمەن داوە، مرۆڤناسی ئەمریکی(رادکلیف براون) لە لێکۆلینەوەیەکدا لە مەڕ دوورگەی (ئەندمان) ڕوونی کردۆتەوە،کە دانیشتوانی دوورگەکە سات و کاتەکانی ساڵ بە پێی پشکووتنی گوڵ و خونچەکان دەستنیشان دەکەن[1]. بۆیە دیاریکردنی زەمەن بۆ کارو بەرنامەو چالاکییە کشتوکاڵی و ئابوریەکانی ئەوان گرنگ بووە و بۆ ئەوەی کاتی وەرزەکان دیاری بکرێت کە پێوەندی بە ئەنجامدانی چالاکی ئابوری و ئاینیەوە هەبووە، دەبوایە چاودێری هەسارەکانی ئاسمان بکرێت [2].

هۆزی هوبی (هندییە سورەکانی ئەمەریکا) دارِشتن و شێوازێکی جیاوازیان نییە کە دەلات لە وشەکانی(ڕابردوو،ئێستا،ئایندە) بکات و لێکیان جیا بکاتەوە بۆیە ئەوان لە حاڵەتی ئێستاییەکی هەمیشەییدان [3]. کەچی لای هەندێك گەل و هۆزی دیکە ئەم سێ دەمە لەیەك

---

١ آلفضاء والزمن والانسان – گراهام کلارک – ترجمة (عدنان حسن) دمشق – ٢٠٠٤ – ل٨٧

٢ آلفضاء والزمن والانسان – گراهام کلارک – ترجمة (عدنان حسن) دمشق – ٢٠٠٤ – ل٩٥

٣ فکرة الزمن عبر التاریخ– ل ٦

جیاكراونەتەوە،ئەمەش نیشانەو بەڵگەی ئەوەیەكە هەستكردن بە زەمەن و بە لە دوای یەك داهاتنی ڕووداوەكانی دەوروبەر و ژینگەی مرۆڤ،هۆشیاری زەمەن لەلای مرۆڤی بەرایی گەلاَلە بووە و دروست بووە . (ئیرنست كاسیرەر) سەبارەت بە چەمكی زەمەن لای مرۆڤە بەراییەكان دەلێت:ئەزموونی زەمەن لای مرۆڤە بەراییەكان ئەزموونێكی وردو دەوڵەمەندە،ئەوان لە سەرجەم كات و ئیقاعی ژیانی مرۆڤ و سروشتدا و لەگشت قۆناغەكانی (منداڵی- هەرزەكاری- باڵق- كامڵی – پیری)ژیانی مرۆڤدا زەمەن تاقی دەكەنەوەو گواستنەوە لە قۆناغێك بۆ قۆناغێكی دیكەی ژیان زەمەنی تایبەتی خۆی هەیەو سرووت و مەراسیمی بۆ ئەنجام دەدرێت[١] .

هەروەها بەدوایی یەكداهاتنی وەرزەكانی ساڵ و جووڵەی هەسارەكان بە بڕوایی مرۆڤی بەرایی پەیوەستە بە مرۆڤ و هوشێوەی ژیانی مرۆڤەوە.واتەبەلای مرۆڤی بەراییەوە زەمەن شتێكی چۆنیەتی و بەرجەستەییە،نەك شتێكی چەندێتی ڕووت و هزری مرۆڤی بەرایی سەبارەت بەبیرۆكەیزەمەن وەك ئەوە نییە كە ئێمە لە بیركاری و زانستی فیزیادابە كاری دێنین،زەمەن لە باوەڕی هۆزەسەرەتاییەكانەوە وەك هێڵێك نییە خاڵێك بكاتە سەرەتاو لە ڕابردووەوەو دەست پیێ بكات و بەرەو ئێستا و ئاینده بڕوات [٢] .

هەروەها زەمەنێكی خولیش نیە،بەڵكو زەمەنێكی نا زەمەنیە واتە ئێستایەكی هەمیشەییە،لە بەرئەوەی زەمەن لای ئەوان جەخت دەكاتە سەرزنجیرەی هۆكارەكانی ڕووداوەكان و ڕابردوو لای هۆزە سەرەتاییە كان بە مانای سەردەمی سەرەتاو سەرچاوەی بوون و شتەكان دەگەیەنێت و بەسەردەمی زێڕین دادەنرێت..

لە هزری ئەفسانەییدا گواستەنەوە لە قۆناغێك بۆ قۆناغێكی دیكە وجیاوازی درێژی ڕۆژو شەولە وەرزەكانداو ئەو گۆڕانكارییە هەمیشەییەی بەسەر خۆر هەلاَتن و خۆر ئاوابووندا دێت،شتێكی ئاسایی و سروشتی نیە، بەڵكو دەلالەت و نیشانەی ئەو ململانێیەیەكە لەسروشتدا هەیە،خۆر هەموو بەیانیەك بەسەر تاریكیدا زاڵ دەبێت، هروەك چۆن لە سەرەتای درووست بوونی گەردوون بە سەریدا زاڵ بوو،هروەك هەموو سەری ساڵێكی نویَ بەسەریدا زاڵ دەبێت،واتە ڕیتمی زەمەن لای مرۆڤی كۆن وەك لێدانی دڵ وابوو، كە لەم لێدانەدا ململانێی نێوان تاریكی و ڕوناكی یان (كاوس وكۆسمۆس) بەرجەستە دەبێت و خۆی دەنوێنێت.هەروەها

١ ما قبل آلفلسفة – فرانكفورت وآخرون – ترجمة – جبرا آبراهيم جبرا- ل٣٦
٢ ما قبل آلفلسفة – فرانكفورت وآخرون – ترجمة – جبرا آبراهيم جبرا – ل٣٧

بڕوایان وابوو کە لە ڕیتمی زەمەندا بەرزبوونەوە و نزمبوونەو و هەڵکشان و داکشانی ژیان بەدی دەکرێت ومرۆڤی کۆن پێی وابووکە گواستنەوە لە خولێکی زەمەنی بۆ خولێکی دیکە، زەمەنی پێشوو دەمرێت و زەمەنێکی نویٚ لە دایك دەبێت و ئەو ساتەی کەوتوتە نێوان ئەم دوو زەمەنەکەوتووتە دەرەوەی زەمەن و دەمێکی نادیارو ترسناکەکە لەسەرەتای گەردووندا هەبووە، بەرلەوەی دنیا دروست ببێت، بۆیە پێویستە هەندێك سرووت ئەنجام بدەین و کرداری خواوەند دووبارە بکەینەوە  و لەڕێگەی ئەم سرووتەدا زەمەنی پاك وسەرەتایی دەمی ئافراندنی دنیا دووبارە دەبێتەوە  .

ئەم وێناندنەی مرۆڤی کۆن بۆ گەردوون و سروشت،  بۆ ژیانی مرۆڤ گرنگ بوو کە پێویست بوو لە مەڕاسیم و سرووتی سەرکەوتنی هێزی ڕووناکی و چاکە بەسەر هێزی شەڕو بەدخوازدا بەشدار بێت، بۆیە سەری ساڵی نویٚ لە میسر و بابل بۆنەیەکی پیرۆز بوو و ئاهەنگیان تێدا دەگێرا و شانۆیان پێشکەش دەکرد.

واتە یادکردنەوەی ئەو بۆنەو ئاهەنگانەی وەك: سەرکەوتنی ڕۆژ بەسەر شەو (تاریکی) و جووتی زەوی و ئاسمان، وای لە مرۆڤ کردووە کە لە گەڵ گەردووندا سازبێت و بگونجێت.

لە لایەکی دیکەوە ئەو هەماهەنگی و یەك خستنەی لە نێوان ڕووداوە کۆمەڵایەتی و گەردوونییەکاندا هەبووە، نیشانەی ئەوەیە، کە زەمەن  لای مرۆڤی کۆن تەنیا هێڵێك یان چوارچێوەیەك نییە بۆ ڕووداوەکانی ژیانی ئاسایی، بەڵکو بەدوایەکدا هاتنێکی ئاڵۆزە کە بەهاو مانای تایبەتی هەیەو سروشتێکی دوو فاقیانەی هەیە، واتە بە زەمەنێکی گەڕانەوەو ناگەڕاوەیی دادەنرێت . بڕوای وابوو کە زەمەن پێوەندی بە چارەنووسی مرۆڤەوە هەیەو دەستی لە ڕووداوەکانی ژیانیدا هەیە، بۆیە بیرۆکەی بەشداری کردن لە ئاوێتە بوون لە زەمەندا لەوەوە سەری هەڵداوە.

واتە زەمەن لە هزری ئەفسانەییدا دەلالەتێکی کۆمەڵایەتی هەیە، تەنانەت (ساڵ) یش ڕیتمی کۆمەڵایەتی هەیە، هەروەها بۆنەو سرووت و جەژن و کاتی کاتی ئەنجامدانی ڕێوڕەسمە ئایینیەکان بە زەمەنەوە پێوەستن .

لەکۆمەڵگەی کشتوکاڵیدا کەژو کاتی تۆ کردن و چاندنی دارو درەخت و دروێنە و ڕاوکردن لە سات و زەمەنی دیاریکرایکراودا ئەنجام دەدرێن. هەروەها بە دوای یەکدا هاتنی وەرزەکان بایە خێکی زۆری هەبووە سەبارەت بە ژیان و کارەکانی مرۆڤی کۆن، هەروەها بۆ دیاریکردنی ئەرکەکانی . ئەو گەل و شارستانییانەی ژیان و ژیاریان زۆر بەندو پێوەست بووە بە سرووشتەوە،

دیاردەکانی سروشتیان وەك ساڵنامە (ڕۆژژمێر) بەکار دێنا بۆ دیاریکردنی کات و ڕووداوەکانی زەمەن. بۆیە دەبینین زۆربەی میللەتان سرووتی لە دایك بوونی (ڕۆژ) یان هاوکات کردووە لەگەڵ کەش گۆڕانی زستانە (الانقلاب الشتوی) کە دەکەوێتە ڕێکەوتی ۲۱ی بەفرانبار، هەروەها بابلیەکان لە هاوساتی بەهاردا (چۆن یەکی شەو و ڕۆژ لە بەهاردا) چەند ڕۆژێك ئاهەنگی سەری ساڵیان دەگێڕا .

میللەتە کۆنەکان بۆ سەرەتای ساڵی نویٰ مێژوو، یان بەرواریێکی چەسپاو دیاریان نەبوو، بۆیە لەگەڵ گۆڕینی کەژی بەهار، یان هاوین، یان زستاندا گونجادوویانە،ئەوەش کۆکە لەگەڵ قۆناغێکی کاری سالآنەی مرۆڤ و سرووتیان لە پێناو ڕەزامەندی و لاسایی کردنەوەی کرداری خواوەند ئەنجام دەدا، کە ئەویش کرداری ئەفڕاندنی گەردوونە، هەروەك لە ئەفسانەکانی دروستکردنی گەردووندا هاتووە، بۆ نموونە لە ئەفسانەی سۆمەریەکاندا هاتووە:

**لەسەرەتادا لەو دەمەی ڕۆژ ئافەریدەکرا**
**لەسەرەتادا کاتێك شەو ئافەریدەکرا**
**ئەو زەمەنەی چارەنوس بڕیاریدرا**
**ئەو کاتەی خواوەندانی ئەنونا کی پەیدابوون.**

(کلۆشکۆف) بڕوای وایە، کە بابلی و ئەکەدییەکان بڕوایان بە زەمەنی وەستاو، یان زەمەنی گەڕاوە بۆ دوواوە هەبووە و گەڕانەوە بۆ ڕابردوویان بە گەڕانەوە بۆ ئایندە دادەنا، بۆیە لای ئەوان وشەی (دار و — داریتو) واتای (ئایندە و ڕابردوو) دەبەخشیٰ و چەمکی زەمەن لای ئەکەدییەکان بە چەمکی قەدەر و چارەنوسەوە پێوەست بووە. لە ئەفسانەی گەل و میللەتە کۆنەکاندا بایەخ و بە زەمەن دراوەو ململانێی مرۆڤ لەگەڵ زەمەن و گەڕان بە دوای نەمریدا بابەتێکی سەرەکی بووە. لە ئەفسانەی زۆربەی میللەتاندا هەروەك هەوڵ و کۆششی میسرییە کۆنەکاندا دەردەکەوێت کە تەحەدای زەمەنییان کردووە و لە پێناوی نەمری و زیندووبونەوە لە ژیانی دیکە دا کۆششی زۆریان کردووە. هەروەها داستانی گلگامشی سۆمەری باس لە نەمری و گەڕان بەدوای نەمریدا دەکات و باس لە گەڕانی گلگامش دەکات بۆ بەدەستهێنانی ڕووەکی نەمری . لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ئەفسانەکانی میللەتاندا بایەخ بە زەمەن دراوە و ململانێی مرۆڤ لەگەڵ زەمەندا بەرجەستە کراوە .گرنگی زەمەن لە حیکایەتە میللیەکانیشدا

دەردەکەوێت، هەروەك دەبینین کە سەرەتاو دەستپێکی زۆربەی ئەو حکایەتانە بە دەستەواژەی: لە سەرەتا، لە زەمەنی کۆن، یان جارێك لە جاران (کان یا مکان فی سالف الزمان)یان لە زەمەنی (جوانیدا،بەراییدا) دەست پێدەکات.

ئەم دەستپێکەش ئاماژە بەوە دەکات کە زەمەن نێوەندێکە لەنێوان ژیان و بابەتی سەرەکی حیکایەتەکە وسەردەمی حکایەتەکە بۆ دەرەوەی زەمەن دەگەڕێنێتەوە:کە نەکرێت بە پێی پێوەرەکانی ئێستا بیانپێوین . لەلایەکی دیکەوە هەموو شتێك و ڕووداوێك شیاو دەبێت و لەچوارچێوەی زەمەن و  شوێندا نامێنێت و دەکرێت دیاریدەکان وا ڕاڤە بکەین، کە لە زەمەنێکی سەرمەدی ڕوویان داوە . بۆیە حکایەتە میلیەکان لە زەمەنی ئاسایی بۆ زەمەنێکی دیکە دەردەچن،کە ڕوداوەکان لە زەمەنێکی دوور ڕوویانداوە.لەجیهانی نا زەمەندا (الازمن)ی جیهانی دێو و جنۆکە،کە شتەکانی تێدا نەمرو سەرمەدین و پاڵەوان بە زۆر ئەزموون و مەینەتی و دنیایی سەمەرەدا تێدەپەڕێت، بەڵام کە دەگەڕێتەوە جیهانی ئاسایی دەبینین تەنیا چەند چرکەیەك تێپەڕیوە،ئەمەش تیمەو بابەتێکی جیهانیە.

بۆ نمونە لەحیکایەتی (سلێمان پێغەمبەرو شاژن بەلقیس)دا ساتی ون بوون و پەیدابوونی کۆشك و بارەگای بەلقیس هوکاتن لەگەڵ یەك وهیچ ماوەیەك لەنێوان بزر بوون و پەیدا بوونی کۆشکەکەدا نیە، بەڵکو لە چاو تروکانێکدا کۆشکەکە لە پێش بەلقیس بوو.

هەروەها لە حیکایەتەکاندا شوێن هەیە زەمەنی تێدا نیە، وەك دوورگە (کامەرانی، ئارامی).

**- زەمەنی میتۆلۆژی:**

زەمەنی میتۆلۆژی ڕەمزی ئەفراندنی دنیایە، ئەو زەمەنەیە کە سەرجەم بونەوەرو شتەکان لەو دروست بوون، هەروەها ئەو زەمەنەیە کە هەموو شتێك هەڵدەلوشێ و قووت دەدات و بە پێی بڕواو ڕوانینی مرۆڤی کۆن زەمەنی میتۆلۆژی خۆی لە جیهانی مرۆڤدا تەجەللا دەکات. خاسیەتێکی سەرەکی زەمەن بەلای باوەڕی کۆن و مرۆڤی چاخە کۆنەکانەوە بریتیە لە باوەڕبوون و داننان بەوەی کە زەمەن بونێکی بابەتیانەی هەیە، واتە بونێکی سەربەخۆی هەیە، تەنیا لە خەیاڵ و هۆش و ئاگایی مرۆڤدا نییەو زەمەن وێناندنی  خودی و ئایدیالی مرۆڤ نییەو  تەنیا لە مێشك وهزری مرۆڤدا هەبێت، بەڵکو بەپێی بیرو باوەڕی ئاینیی و میتۆلۆژی زەمەن دیاریدەیەکە لە دیاریدەکانی بوونی گەردوون و شتەکان[1]. بەهۆی هەستکردنەوە،مرۆڤ لە

١ صور و رموز – میرسیا ایلیاد – ترجمة – حسیب کاسوحة –دمشق – ١٩٩٨ – ل٨٣

مەجرای گشتی ڕووباری زەمەن بەشدار دەبێت کە لە سەرەتای گەردوونەوە دەستی پێکردووە و ڕووداو لە دوای ڕووداوی دروست کردووە و پاشان ڕووداوەکان

لە دوای خۆی بەجێدێڵت.مرۆڤی کۆن زەمەنی (ئاسایی،ڕۆژانە،مرۆیی) وەك پێوەر بە کارهێناوە بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆژمێر و ساڵنامە و سیستەمی مێژوویی ئاڵۆزی داهێناوە،بەڵام زەمەنی ئەفسانەیی (میتۆلۆژی) جیاوازە لەگەڵ زەمەنی رۆژانەو هەوڵیان نەداوە بیپێون، لەبەر ئەوەی ئەو زەمەنە زۆر درێژەو لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە هەبووە،پێش زەمەنی ئاسایی هەبووە پێش ئەوەی مرۆڤ پەیدابێت، بۆیە ئەو زەمەنە لە دەرەوەی یادەوەری مرۆڤایەتییە و زەمەنێکی ئەفسانەیی و پڕ لە نهێنییە،هەروەها ئەو زەمەنە بەوە جیادەکرێتەوە و دەناسرێت،کە بە ڕابردوو و زەمەنێکی پیرۆز دادەنرێت . زەمەنی میتۆلۆژی بەهۆی چەندین ڕێگەی ئەفسووناوییەوە لەکاتی ئێستادا ئامادە دەبێت وەك (خەون، سرووت)، بۆیە سرووت (گقوس) یەکێکە لە چالاکییە گرنگەکانی مرۆڤی کۆن،کە لە ڕێگەیەوە ڕووداوە ئەفساییە کان و کردارەکانی خواوەند و پاڵەوانەکان دەگێڕێتەوە و دووبارە دەبێتەوە[1] .

زەمەنی ئەفسانەیی،زەمەنی سرووت و ئاهەنگ و بۆنە پیرۆزەکانە،کە لە میانیدا ئەو ڕووداوانە یاد دەکرێنەوەو لاسایی دەکرێنەوە کە لە سەرەتای زەمەن ڕوویانداوە،واتە لە کاتی ئەنجامدانی سرووتەکاندا دەگەڕێنەوە بۆ ئەزەل و زەمەنی ئەفسانەیی و ئەم سرووتانە لە پێناو ڕەزامەندی و لاسایی کردنەوەی کرداری خواوەندەکان ئەنجام دەدران، کرداری ئافراندنی دنیایە،هەروەك لە ئەفسانەکانی دروستکردنی گەرددووندا هاتووە، واتە کۆمەڵگەی کۆن هەوڵ و کۆششی داوە بۆ ئەوەی زەمەنی ئاسایی لابات و زەمەنی سەرەتاو ئەفسانەیی زیندوو بکاتەوە[2] .

لای مرۆڤی کۆن هەروەك چۆن شوێنی پیرۆز هەیە،ئەوا زەمەنی پیرۆزیش هەیەو یەکێك لە ئەرکە بنەڕەتییەکانی ئەفسانە ئەوەیە کە دەروازەیەك دەکاتەوە تا مرۆڤ لێیەوە بگاتە زەمەنی پیرۆز،زەمەنی پیرۆزیش هەیەو یەکێك لە ئەرکە بنەڕەتییەکانی ئەفسانە ئەوەیە کە دەروازەیەك دەکاتەوە تا مرۆڤ لێیەوە بگاتە زەمەنی پیرۆز، زەمەنی پیرۆزیش ئەو زەمەنە ئەفسانەیەیە کە ئەزەلی و هەتاهەتییە، بۆیە مرۆڤی کۆن هەمیشە بە پەرۆشە بۆ ئەم زەمەنە ئەفسانەییە، کە شتەکان پەیدابوون و سەریان هەڵداوە و مرۆڤی کۆن و میللی هەوڵیداوە زەمەنی ئاسایی لاببات و بچێتە زەمەنی سەرەتاکان، هەروەك لە ئەفسانەکاندا هەوڵی بۆ داوەو تەنانەت ئێستاش لە

١ صور و رموز – میرسیا ایلیاد – ترجمة – حسیب کاسوحة –دمشق – ١٩٩٨ – ل٩٨
٢ صور و رموز – میرسیا ایلیاد – ترجمة – حسیب کاسوحة –دمشق – ١٩٩٨ – ل٩٤

بۆنە و سرووتە ئایینیەکانداهەوڵی بۆ دەدات و دەریدەبڕێت. هەروەها بیرۆکەی زەمەنی ئەفسانەیی لای مرۆڤی بەرایی بە بابەتی ڕێزگرتنی

مردووانە بەستراوەتەوە، مرۆڤی بەرایی بۆ سەردانی گۆڕی مردووان بە پەرۆشە و قوربانی بۆ دەدات، بەتایبەتی کە خەونی پێوە دەبینێت، کەچی مردووان سیفەتی مێژوویان نەماوە. هیواو ئومێدی مرۆڤی کۆن بە زەمەنی ئەفسانەیی،هانی دەدات پاڵەوان و کەسایەتیە ناودارەکان وەك(گلگامش،هیراکلیتس،خدری زیندە...) لە ناو چوارچێوەی مێژوویی دەربێنێ و بیانخاتە نێو زەمەنێکی ئەفسانەیی .پێویستە بگوترێت، ئەم کەسایەتیانە شەڕو ململانێیان لەگەڵ دێو وهێزە دڕندەکان وشەڕخوازەکاندا کردووە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ ئەوەی ئەمانە لە زەمەنی مێژووی دوور بخرێنەوە و بخرێنە ناو زەمەنی غەیبی و ئەفسانەیی، کاتێك مرۆڤ ئاینی کارو سرووتە ئاینیەکان ئەنجام دەدات، وا هەست دەکات زەمەنی ئاسایی و سروشتی جێدێلێت و دەخزێتە ناو زەمەنی غەیبی و پیرۆز و بۆ ماوەیەك لەو زەمەنەدا دەژی، ڕەنگە ئەم ڕەفتارەلای مرۆڤێکی شارستانی و مۆدێرن هزرو ڕەفتارێکی ساویلکە بێت، بەڵام پێویستە درك بەوە بکەین کە مرۆڤی ئاینی بەرگێکی ئاینیی و پیرۆز دەکاتە بەر کردارەکانی و کردارو ڕووداوەکە لەزەمەنی هەستیارەوە بۆ زەمەنی نا هەستیار دەگوێزێتەوە. کەواتە مرۆڤ لە زۆربەی کات و سەردەم و حاڵەتە کاندا بە هیوای ئەوە بووە کە لە زەمەنەکەی خۆیدا نەژیابا، بەڵکو لە زەمەنی ڕابردوو، یان ئایندە ژیابا، چونکە ئەم زەمەن و کاتەی ئێستا کە مرۆڤە کەی تێدا دەژی خودو هیوای ئەوی نەهێناوەتە دی و جێبەجێی نەکردووە، بۆیە مرۆڤەکە بەبێ ویستی خۆی لە ڕابردوو یان ئایندەدا ژیاوە.

## - بە پیرۆزکردنی زەمەن:

هزری ئەفسانەیی و ئاینی چەند زەمەنێکی دیاریکراو لە زەمەنەکانی دیکە جیادەکاتەوە و پیرۆزی پێ دەبەخشێت،واتە پەرتکردنی خودی زەمەنە بەوەی کە هەندێکیان پیرۆزن و هەندێکیان پیرۆز نین،واتە لە ڕستەیەك زەمەنی ئاسایی و سروشتی دانەیەك لەو زەمەنە جیا دەکاتەوە و تەقدیسی دەکات، بۆ نمونە زەمەنی پشوودانی خواوەند لە ڕۆژی حەوتەمدا پاش ئەوەی بەشەش ڕۆژ لە کردەی خەڵقکردنی گەردوون و بونەوەر دەبێتەوە،پیرۆزی شەوێك بە قەدەر هەزار مانگ لە هزری ئیسلامدا (لیله القدرخیرمن الف شهر)[1].

---

١ گۆڤاری، ژیار- ژمارە، ٧- ساڵی، ٢٠٠١- ل٧١

واته هزری  ئەفسانەیی هێواش هێواش زەمەنەکانی لە زەمەنی ئاساییەوە دەکاتە زەمەنی موقەدەس،ئەمەش بەخولڵقاندنی زەمەنی جۆراو جۆر بۆ یادکردنەوە و برەوپێدانی هێماو بۆنە ئاینیەکان،بە زۆرکردنی ژمارەی بۆنەو جەژنەکان، بەجۆرێك تۆناتوانیت لە دەرەوەی زەمەنە پیرۆزەکانی ئەودا ساتێك بدۆزیتەوە و کەمێك بیر بکەیتەوە.لەلای ئیماندارێك زەمەنە پیرۆزو ناپیرۆزەکان (ئاساییەکان) لێك جیادەبنەوە،ئەو زەمەنەی پێوەندی بە ڕابردوو و خواوەند و پێغەمبەران و دروستبوونەوە هەیە زەمەنێکی هێندە پیرۆزە  کە دەتوانێت بە بەردەوامی لە ئێستاکەی ژیانی ڕۆژانەدا دووبارە ببێتەوە، گەڕانەوە بۆ سەرەتاو ڕۆژانی پیرۆزی ڕابردوو کە ئێستاکە بووەتە جەژن و  ساڵانە یاد دەکرێنەوە  و دووبارە دەکرێنەوە .کە لە بەخشینی ڕەوایەتی بە سەرمەدیەتی زەمەن و هێزو  توانای زەمەن پێکهاتووە[1].

ئەفسانە بە پەیدابوون و تەکوین و ژیانی خواوەند و پاڵەوانەکان لە ناو زەمەنا دەست پێدەکات، هەندێك ریوایەت دەگێڕنەوە کە خواوەندەکان بوون و سروشتی خۆیان لە ناو  زەمەندا دەردەخەن، جیهانی ئەفسانە کاتێ دەگا بە دەربڕینی راستەقینەی خۆی کە بە قوڵایی زەمەندا رۆچوبێ، و بە دانانی بونەوەری ئەفسانەیی لە رابردوو و لە قوڵایی زەمەندا[2]،  لە روانگەی ئەفسانەوە، رابردوو "بۆچی \لەبەرچی" هەبوونی شتەکانە، ئەوەی زەمەنی ئەفسانەیی لە زەمەنی مێژوویی جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە بۆ زەمەنی ئەفسانەی رابردوویەکی رەها لە ئارادایە، کەچی مێژوو هەبوونی دیاردەیەك بە زنجیرەیەکی بێ کۆتایی لە "بوون" کەرت دەکات کە تێیدا هیچ خاڵێك وەك سەرەتا جیاناکرێتەوە، بەڵکو خاڵی پێش خۆی پیشاندەدات. زەمەنی ئوستوری بەبەراورد لەگەڵ زەمەنی بابەتیدا(چ زەمەنی فیزیکی وچ زەمەنی مێژوویی) بە نازەمەن دادەنرێت، بەم جۆرە دەبینین کە ئەفسانە بەرامبەر بەو بابەتیەی کە لە چەمکی فیزیکی زەمەندا هەیە، هیچ تێگەیشتنێکی نییە، ئەفسانە ئەو زەمەنە رەهایەی کە "بێ سەرنجدان بە هەرشتێکی دەرەکی، لە خۆیدا و بۆخۆی" ناناسێ  و بەهەمان جۆریش ئاگاداری زەمەنی مێژوویی نییە، چونکە لە ئاگایی زەمەنی مێژوویدا چەند هۆیەکی بابەتیانەی ۆراو جۆر لە ئارادا هەن، زەمەنی مێژووی بە پێی جیاوازی "زوتر" و "درەنگتر" و دیتنی نەزمێکی دیار و دەستنیشانکراو لە زنجیرە ساتەکانی زەمەندا دامەزراوە، کەچی لە ئەفسانەدا دابەشکردنی لەم جۆرە لە ئارادا نییە، و رێکخستنی زەمەنیش بوونی نیە و لە هەر جێگەیەك پەیوەندیەك لە نێوان  دیاردە و

١  گۆڤاری ، ئایدیا، ژمارە-(٨-٩)- ساڵی، ٢٠٠٦- ل٤٤

٢  زمان، هزرو کولتوور-و. رەحیم سورخی- دەزگای بڵاوکردنەوەی موکریانی- ٢٠٠٦- ل٨٤

شت و کاروبارەکاندا دروستببێ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەندامەکانی ئەم پەیوەندیە بچن بەناویەکدا و و یەك جەوهەریان هەبێت و قۆناغەکانی زەمەن، واتە رابردوو، ئێستا و داهاتووو لە یەکتر جیاوازنین و زۆر جار ئاگایی ئوستوری ئەوانە ئاوێتەی یەکتر دەکات[1]. زەمەن لە ئەفسانەدا هەستپێکراوە، وەك زەمەنێك کە مۆسیقایەکی رێکی هەبێت و ساتەکانی پەیتا پەیتا بەدوای یەکتردا بێن و و بەپێی رێسای دیاریکراو چەندپات ببنەوە لە ئارادا نییە، تەنیا شتێکی ئەفسانە دەیناسێ وێنەکانن کە ناوەرۆکی تایبەتیان هەیە و ئەوانە پێکهاتێکی زەمەنی دیار ئاشکرادەکەن، وەك هاتن و چون، هاتنە ئارای قۆناغەکان، بەم جۆرە زەمەن وەك گشتێك بەسەر سنوری دەستنیشانکراودا، وەك هێڵی میزان لە نۆتەی مۆسیقادا دابەش دەبێت [2].

هەروەك دەزانین زەمەن لە ئەفسانەدا زەمەنێکی خەیاڵییە، ئەسڵێکی زەمەنی بەردەوام لە ئەفسانەدا زاڵە، کە دەڵێ، هەرشتێ بۆ سەرچاوەی خۆی دەگەڕێتەوە، ئەو سیستەمەی کە لە سروشتدا دەبینرێ(مەبەست سیستەمی نوێبونەوەیە، زەمەن لە یەك شکڵی و یەکسانی دەردێنێت و بەرەو ترۆپکی دەگەیەنێ. لە ئەفسانەدا زەمەن وەك رێژەی تۆخ نییە کە تێیدا "رابردوو، ئێستا، داهاتوو" بەردەوام بگۆڕێن و ببنە یەکتر.

## - زەمەن و کات لە ئایین و شارستانیەتی میزۆپۆتامیادا:

دانیشتوان و خەڵکی نێوان دوو رووبار (میسۆپۆتامیا) درك و هەستیان بەوە کردوە کە پەیوەندیەك لە نێوان جوولەی هەسارە و ئەستێرەکان و گۆڕانکاری کەشوهەوادا هەیە، جا بۆ ئەوەی پێوانەی کاتیان لا وردبین بێ، کاتژمێریان داهێنا، بۆ پێوانەکردنی بەشەکانی رۆژ، کاتژمێر لای سۆمەریەکان بە (دب- دب) ناو دەبرا، کە لێرەدا مەبەستمان کاتژمێری ئاوییە[3] هەروەها کاتژمێری هەتاویش بەکاردەهات، کە بریتی بووە لە قامیشێك، کە بە ستوونی لە ناو قاپێکدا دادنرا، کە پڕبوو لە لم، کاتەکەش لە ئاکامی پێوانەی درێژی سێبەرەکە دەپێورا کە بەسەریدادەهات[4]

١ زمان، هزرو کولتوور-و. رەحیم سورخی- دەزگای بڵاوکردنەوەی موکریانی- ٢٠٠٦- ل٩٢

٢ زمان، هزرو کولتوور-و. رەحیم سورخی- دەزگای بڵاوکردنەوەی موکریانی- ٢٠٠٦- ل٨٧

٣ گۆڤاری شانەدەر- ژ(٩) - ل ٤٩

٤ هەمان سەرچاوە ل ٥٠

سۆمەری و بابلیەکان جولانەوەی هەسارە و ئەستێرەکانیان بەکارهێناوە بۆ زانینی بەختی پاشا و چارەنوسی وڵاتەکەیان، بێگومان ئەوەپەیوەندی بەوەهەیە کە خەڵکی میسۆپۆتامیا زۆر هۆکاری دیکەیان بەکارهێناوە بۆ زانین و دۆزینەوەی بەختی پاشایەکەیان، بەڵام بۆچی جووڵەی هەسارە و ئەستێرەکانیان پەیوەست کردوە بە بەختی پاشای وڵاتەکەیان؟ زانست ئەوەی دەرخستووە کە پەیوەندیەك هەیە لە نێوان جووڵەی ئەستێرەکان و گۆڕانکاری ئاوهەوا(کەش) کەبەسەر زەویدا دێت، کۆنترین بڕگەش لەسەر زانینی بەختی شا و وڵاتەکەیان پشتی بەستووە بە مانگگیران، وەك لەم بڕگەیەدا هاتووە: ئەگەر لە رۆژی چواردەی لەمانگی یازدەدا، مانگ گیرا ئەوا دوژمن بەشێکی دەروازەی ئەم شارە داگیردەکات [١] .

زانیاریەکان ئەوە دەردەخەن کە دانیشتوانی میسۆپۆتامیا لەسەردەمی شا (نابوناسر ٧٤٧-٧٣٤) پ ز دەستیان کردوە بە چاودێریکردنی گشت دیاردەکانی گەردونی بۆ دیاریکردنی پەیوەندی ئەم دیاردانە بە لافاو و بەروبوومی کشتوکاڵی.

لە روانگەی ئاگایی و هزری ئەفسانەیی، نەزمی رەوتە سروشتیەکان وەك خولی سووڕانی وەرز و هەسارەکان، بە تەواوی وەك رەوتی ژیان دەردەکەون، هەروەها سەرەتا گۆڕانی رۆژ و شەو و روان و شکبوونی گژوگیا و گۆڕانی وەرزەکان، لە ئاوێنەی بوونی مرۆڤدا ئەبینێ و درك پێئەکات، ئەم پێوەندنیە دوولایەنەیە هەستی ئەفسانەیی زەمەنی لێدەکەوێتەوە کە لە نێوان شێوەی یان و بابەتیانەی سروشت، پردێك هەڵدەبەستێ، مرۆڤ بوونی خۆی لە بوونی زەویدا دیتوەتەوە و هەستی بە هێوری و بەردەوامی کردوە و فێری بەرهەم هانین بوو و ئەو سەردەمە هەوڵیدا پێوەرێك بۆ کات و زەمەن دابنێت، چونکە درکی بەوەکردبوو، کە ژیانێکی ئارام و ئاسوودە و جێگیر لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابووریەوە، نایەتەدی تا کاتەکانی چاندن و کشتوکاڵکردن رێکنەخسترێت و کاتی بۆ دانەنرێت، بۆیە کاتژمێرییان داهێنا بۆ پێوانەکردنی کاتەکانی زەمەن.

لەلایەکی دیکەوە، بە باوەری مرۆڤی میسۆپۆتامیا، زەمەن لە پێش (شوێن) دێت، لەبەرئەوەی بەهۆی ئاراستە و رێڕەوی زەمەنەوە، بەشەکانی شوێن دیاردەکرێت، شوێن لای سۆمەریەکان بۆ سێ جیهان دابەشدەکرێت: ئاسمان، زەوی، جیهانی ژێرەوە، بەڵام زەمەن بە

١ هەمان سەرچاوە ل ٥٣

باوەڕی ئەوان دەکرێتە دوو بەش: زەمەنی کاتی و دیاریکراو، زەمەنی ئەوان (باپیران)[1] سۆمەریەکان ژمارە پێنج (٥) یان وەك هێما بۆ زەمەن داناوە، ژمارە (٨) یان بۆ هێمای شوێن بەکارهێناوە، واتە زەمەن لە پێنج بەش پێکهاتووە و لە شێوەی بازنەیەك تەرتیب و ڕێکخراوە، کە مەوقع و جێگای (٠،٥) هەمان پنتە و لەم دوو ژمارە سیستەی زەمەنی دەیی (زەمەنی مرۆیی) و زەمەنی شێستی (زەمەنی خواوەندان) هاتۆتەکایەوە، واتە پوختەی مەسەلەکە ئەوەیە کە یەکەکانی زەمەن، لەیەکەوە بۆ پێنج (١-٥) پەیوەستە بە زەمەنی ئەبەدی و جاویدانی و لە ژمارە (١-٤) پەیوەستە بە زەمەنی مرۆیی، کە زەمەنی ریتم و شیعر و گۆرانیە[2]. دەکرێ بلێین کە شارستانیە کۆنەکان مانایەکی روون و ئاشکرایان لانییە سەبارەت بە چەمکی زەمەن. ئەوان زەمەن دەگۆڕن بۆ چەندین نەغمەی جیاواز

**- زەمەن لە ئەفسانە و ئایینی زەردەشتیدا:**

زەمەن چ لە دنیای بەربلاوی ئەفسانەو چ لە دنیای زەمینی و دوور لە ئەفسانەییدا چەمکێکی پڕ ڕەمز و ڕاز و قوڵ لە قەلەم دراوەو دەردێت، هەموو ئەو باسانەی کە لە کۆنەوە مرۆڤ لەسەر "زەمەن"ی داناوە و پەی پێ بردوە، تایبەت بە فەرهەنگ و کلتورێکی دیاریکراو نییە و چەمکێکی جیهانیە و بە ئاسانی دەتوانین وێنەی ئەم ئەندێشە کە لە نێو بیروباوەڕی گشتی هەرفەرهەنگێکدا دەستنیشان بکەین، بەڵام لە باوەڕە ئەفسانەیەکاندا دەردەکەوێ کە زەمەن شتێکی " ڕێژەییە" و مێژوو و زەمەن لە دنیای ئەفسانەکاندا، پەیوەندیان بە ئاسمان و دنیای سەروسروشتیەوە هەیە، ئەگەر چی زەمەن شتێکی ئەزەلی و ئەبەییە و پێش پێکهاتنی دنیا و ئەوەی تێیدایە، هەبووە و پاش نەمانی دنیاش هەر هەیە، بەڵام بەردەوام لە ئەفسانەدا پێکهاتەی زەمەن هاوکاتە لەگەڵ ڕووداوێکی نوێ.

بۆ نموونە بە هاتنە دنیای "ئەهریمەن" و " ئاهورمەزدا" لە زگی "زورڤان"وە خودای زەمەن لە ئێرانی کۆن و کەونارادا، بۆ هەر کام لە ئەوان چەند هەزار ساڵ دیاری دەکات تا نەبێ بە شەڕیان و هەریەکەیان بە ئەندازەی دیاریکراو لە رووی دنیادا حکومداری خۆیان بەسەردەبەن. لە ئەفسانەیەك لە بارەی پێکهاتنی هەزارەکانەوە بەم جۆرە هاتووە: " زورڤان

٥٠ مجلة ا فاق عربية -ع -٥- سنة- ١٩٩٠ ص ١٠٨

٥١ مجلة ا فاق عربية -ع -٥- سنة- ١٩٩٠ ص ١٠٩

خوای یەکەم، لە ماوەی هەزار ساڵی رەبەق قوربانی گێڕا، تا کوڕێکی ببێ و ناوی بنێ هورمزد، بەڵام لە ئەنجامدا لەسەر شوێن دانانی قوربانیەکانی، خۆی تووشی دوودڵی بوو، هەربۆیە دوو دانە کوڕیش لە (زگیدا پەیدابوون)دەرکەوتن، یەکێکیان هورمزد، کە بۆنەی ئەوەوە قوربانیەکانی کردبوو، ئەوی تر "ئەهریمەن" کە هی گومان و دوودڵیەکە بوو، زورڤان لە دڵی خۆیدا بڕیاری دابوو کە پاشایەتی دنیا بدات هەرکام لەوانەی کە زوتر ببێ و پێشترێ بە خزمەتی بگا، تاجی پاشایی لەسەر دەنێ، وەلێ هەر کە ئەهریمەن لە نیەتی بابی بە خەبەر هات زگی بابی دڕی و خۆی بە خزمەتی گەیاند و خۆی پێ نیشاندا، زورڤان لێی پرسی تۆ کێی؟ وەلامی دایەوە کە کوڕی تۆم "زورڤان" گوتی کوڕی من بۆن خۆش و ڕووناکاویە، بەڵام تۆ زۆر بۆگەن و ناشرین و تاریکستانی، لەم قسانەدابوون کە هورمەزد بە هەیکەلێکی سەراپا نورانیەوەخۆی بە بابی نیشاندا و زورڤان ئەوی بە کوڕی خۆی ناسی و قبولێ کرد، بەڵام ئەهریمەن بەڵێن وبڕیارەکەی باوکی خستەوە یادی و وەبیر باوکی هێنایەوە، بۆیە زورڤان بە ناچاری سەڵتەنەتی دنیای تا نۆ هەزار ساڵ دایە دەستی ئەهریمەن، پاش بەسەرچوونی ئەم نۆ هەزار ساڵ پادشاییە، هورمەزد دەبێ بە پاشای جیهان و بە تەنیا پاشایەتی جیهانی دەکات[1] "

ئەو رەوەندە هەزارەوانیە کە زورڤان بەشی کردوە لە ئەفسانەکاندا لە سەرەتای جیهانەوە تا کۆتایی جیهان، دەگرێتەوە، ئەم وشەکانی "هەزار" کە لەسەرەوەدا هاتووە هەمووی مانای هەزارە خوازی و ئاڵوگۆڕ دەگەیەنی کە لە ناخی بێ ئاگایی خەڵکیدا رەنگی داوەتەوە.[2]

لای شوێنکەوتوانی زەردەشت لە ئێرانی دێریندا، وا گوزارشت کراوە کە مرۆڤ بە تەنیا لە یەك خول پێکهاتووە، کە لە ئەزەلەوە هاتوونەتە دەرەوە و رۆژێك لە رۆژانیش بۆ ناو ئاگر یان کارەساتێکی لەوە گەورەتر کۆتایی پێدێت.

لە ئایینی زەردەشتیدا (زورڤان) خواوەندی زەمەن و قەدەرەو باوکی ئەهورا مەزدا (خواوەندی خێر) و ئەهریمەن(خواوەندی شەڕ)ە و چارەنووسی مرۆڤ لە ژێردەستی ئەودایە. پێش ئایینی زەردەشتی، لە ئایینی (میترا)دا زورڤان لە شێوەی پیاوێکی سەر شێر کە زودیاك(کەلووەکانی ئاسمان) دەوری جەستەیان داوە، وێناکراوە. بە پێی ئەفسانەکانی ئێرانی

---

١ گۆڤاری ، رامان، ژ- ٣٨- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٣٠

٢ گۆڤاری، رامان، ژ- ٣٨- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٣١

دێرین و زورڤانی بۆ چەند ئایینزایەك دابەش بووە، لەوانە ئاینزای قەدەری کە بڕوای وایە، جیهان لەلایەن زەمەنەوە دیاریکراوە و مرۆڤ یاریەکە لە دەست قەدەر.

زورڤان خواوەندێکە وا وێناکراوە، کە حەوت ڕوو (روخساری) هەیە، لە هەر ڕوویەك لەمانە سێ چاوی هەیە، زورڤان) خۆی لە خۆیدا زەمەنێکی بێ سنوورە، هەروەها حیکمەت و توانا و هێزیشی بێ سنوورە، واتە هێزێکی بێ سنووری هەیە لە ئەفراندنی بونەوەرەکان (چاك و خراپ).

زورڤان خواوەندێکی ئارام و لەسەر خۆیە، نەمرو جاویدانە، نازانێت ئازار و پیربوون چییە؟ هەروەها ئەزەلی و بێ هاوتایە، ئافرێنەرەو و ئافەریدەنەکراوە، فەنانابێت و لەناو ناچێت.

زورڤان مرۆڤ دروست دەکات گەشەی پێدەکات، تا باڵق دەبێت، بۆیە هەر ئەو خواوەندی ژیان و مەرگە و سەرپەرشتی لەدایکبوون و پێگەیشتن و مردنی جەستەی مرۆڤ دەکات.

دەتوانیین ئەرکەکانی زورڤان لە خوارەوەدا دەستنیشانبکەین:

**زورڤان= زەمەن- شوێن- هێز- حیکەت**

**زورڤان= ئەفرێنەر- لەناوبەر**

**زورڤان= قەدەر- سیستەم- میترا**

**زورڤان= زەمەنی دیاریکراو- ڕێرەوی قەدەر- یاسا**

**زورڤان= قەدەر- ساتی یەکلاکەرەوە- بڕیاری نەگۆر**

**زورڤان= چاکە و خراپە- پشتەوان- دوژمن**

زورڤان خواوەندی قەدەر: لەبەر ئەوەی زورڤان خواوەندی مەرگ و قەدەریشە، بۆیە چاکەو خراپەی تێدا بەرجەستە بووە، یان لەخۆ گرتووە. هاوشێوەی مرۆڤ کە شیاوی چاکە و خراپەیە. لەبەر ئەوەی زورڤان تەنها چەمکێکی رووت نییە، بەڵکو خواوەندی قەدەرە، بۆیە مرۆڤ گەمەی دەستی ئەوە و بەسەر قەدەر و چارەنوسی مرۆڤدا زاڵە.

حەتمیەتی مردن و بێ توانایی مرۆڤ لە بەرامبەر مردن بە روونی لە باوەڕی زورڤانیدا دەردەکەوێت، هەر وەك لە دەقە ئایینیەکاندا هاتووە: زەمەن چاوی مرۆڤ دەنوقێنێت و پشتی

دەشکێنێت، توشی نەخۆشی دەکات و دەستی دەشکێنێت، واله مرۆڤ دەکات چیدی نەتوانێت بجولێت و گەشە بکات و دواتر دەیکوژێت[1].

قەدەر بەش و چارەنووسی سەرجەم خەڵکە. لەم شتەدا قەدەری گەردوونی مەزن جیاوازی لەگەڵ قەدەری گەروونی بچوك (مرۆڤ)دا نییە، گەردون پەیدا دەبێت و گەورە دەبێت، پیردەبێت، دەمرێت، قەدەری مرۆڤیش هەر بەم شێوەیەیە.

بە پێی میتۆلۆژیای زورڤانی کە ل (یەسنا)دا هاتووە: کە زورڤان ئەکرنا (زەمەنی رەها) باوکی ئەو دوو (ئەهورا مەزدا و ئەهریمەن) گیانە سنوردارەیە، سەرچاوەی سەرەکی رووناکی و تاریکی، چاکە و خراپەیە.

هەروەها سەرچاوەی گشت شت و بوونەوەرەکانە، لەبەر ئەوەی زەمنێکی ئەبەدی و بیٚ سنورە[2].

تاکو نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی زاینی لە ئایینی زەردەشتیدا زورڤان خواوەندی گەورە و باڵا بووە، نەك ئەهورا مەزدا، هەروەها لە سەردەمی (یەزد گوردی دووەم)دا زورڤانی، ئایینی دەولەت بوو، شاپووری یەکەم هەندێك بیروباوەڕی هندیەکانی سەبارەت بە زەمەن تێکەڵ و ئاوێتەی باوەڕی زەردەشتیەکان کرد.

لە ئۆپانیشاد دا هاتووە: زەمەن هاوشێوەی بنەمای باڵایە، زەمەن دوو شێوەی هەیە، یەکەم زەمەنی سەرمەدی، کە جاویدانییە و دابەش ناکرێت. دووەمیان زەمەنی ئاساییە، کە بۆ چەند بەشێك دابەش دەکرێت.

بە گوێرەی ئەم ئایینە، بوونەوەرەکان لە زەمەنەوە دەردەچن و گەشەدەکەن و پێشدەکەون، هەر لە ناو زەمەندا مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ بارەگای سەرەکی و رەسەن[3].

لەلایەکی دیکەوە، زورڤان رەهەندێکی دیکەی هەیە، ئەویش (نەمری)یە کە ئەمەش حاڵەتێکە لە دەرەوەی زەمەن وشوێنە.

کەواتە هەر لە سەردەمی کۆندا "زورڤان" بەناوی زەمەنی ئەزەلی و ئەبەدی بیٚ سەرحەد و سنوور ناسراوە و لەم سیفەتای کە بە ئەو دراوە روونە کە " زورڤان" بەردەوام بە نەمر و بیٚ کۆتایی و هەرمان داندراوە و هەمیشە بە پایەدار و نەمر زاندراوە ئەویان بە شایانی رازو نیاز

١ هەمان سەرچاوە، ل ٢٨٩

٢ هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٦

٣ هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٧

و پەرستن زانیوە و لە "زاد سپرم" زرڤان بە بە راشکاوی بە ئەفراندەی ئاهورامەزدا لە قەلەم دراوە و بە شایستەی پەرستن زاندراوە، لە ناوەڕۆکی ئاڤێستادا وا دەرکپێدەکرێت کە زورڤان بە مانای زەمەنی بێ سەرحەد و نەمر لەکاربراوە، لە گوتەیەکدا لە گاتاکاندا، زورڤان چاکەکارو بەدکار، وەك "دوو گەوهەری هاوزار تاریفکراوە و پاشان زورڤان وەك پەروەردگاری ناسراوە.

هەروەها لە سەروبەندی هەخامەنشیاندا لەمەڕ چییەتی ئەم پەروەردگارە، بیروباوەڕی جۆراوجۆر هەبوون: هەندێ لەوباوەڕەدابوون زرڤان زەمان، هەندێك پێیان وابوو شوێنە و لە ئایینی " میهرا"پێش زەردەشت، زەمەنیان پەرستووە، هەروەها "مانی"یش ناوی "زورڤان" ی بە خودای گەورە و بێ هاوتا هێناوەتە گۆڕێ[1].

## - زەمەن لە ئەفسانە و ئایینی هندیەکاندا

لە هیندستاندا تێڕوانینی خولی و بازنەیی بۆ زەمەن و باو و باڵادەست بوە، کۆنترین بیرو ڕای هندیەکان، دەلێت، مرۆڤەکان چارەنوسیان وایە بە بێ هیوا لە جیهانێکدا بژین، کە بە خولی بە هەرەسهێنان و گەندەڵبوندا تێدەپەڕێت، تا ئەو کاتەی بە تەوای هەرەس دێنێت و پاشان سەر لە نوێ دروست دەکرێتەوە، پێوەری سەر لەنوێی لە دایکبوونەوە، ژیانەوە لە (ئۆپانیشاد)دا دەبینین، وەك چۆن لە فێرکاریەکانی (گوتاما بودا) و (ماها ڤیرا)دا هەیە، ئەو مامۆستایانەی کە دەبینن مرۆڤایەتی بێ هیوایە لە لایەنی ئەو خولە لە کۆتایی نەهاتووانەی سروشتەوە، کراوە بە کۆیلە، ئیدی پێدا دەگرن کە دەشێت ڕێگەی سەر فرازی بە هۆی قوتاربوونیرۆحیانە لە زەمەن و مێژووی پڕوپوچی، دەروون یان خودی راستەقینە ددەتوانێت خۆی لە جەستە رزگار بکات و ڕێگەی سەرەکی مرۆڤ ئەوەیە کە ئارامگیرانە لە توێی زنجیرەیەکی دوور ودرێژ دیسان بۆ لە دایکبوونەوە خەبات بکات، هەتا لە کۆتاییدا وەك، رۆحێکی پوختە بۆی دەرباز دەبێت.

خواوەند (ئەندرا) کە کەسایەتیەکی سەرەکیە لە کتێبی (ریگ ڤیدا)دا، خواوەندی ئاسمان و بروسکەیە و ڕۆلێکی دیاری لە ئافراندندا هەیە، مێژووی راستەقینەی ئەندرا کە خۆی لە (ئافراندن، تێکدان، لەناوبردن)ی جیهاندا دەنوێنێت و زانین و ناسینی ئەو مێژووە، زەمەنی گەورە (ئەفسانەیی)یت بۆ دەردەخات، چونکە ئەندرا سەرچاوەی بوون و رووداوەکانی گەردوونە[2].

---

١ گۆڤاری ، رامان، ژ- ٣٨- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٣٠

٢ صور و رموز- مرسیا الیاد- ل٨٣

به پێی تیۆری زەمەنی هیندۆکان، کە زەمەنناسە ڤیداییەکان تیۆری (زەمەنەکانی ئاگایی) پێدەڵێن، زەمەن زۆر گرنگە و ڤیداکان پەیوەندی زۆریان بە زەمەنەوە هەیە. ئەوان پێیان وایە زەمەن دابەش دەبێت بۆ چوار بەش و هەر بەشێك دابەشکراوە، بەسەر بەشێکی سەرەکی و دووبەشی لاوەکی.

بە گوێرەی کتێبی (ریگ ڤیدا) زەمەن (کالی) دەوری هەموو شتێکی داوە و ئەزەلی و ئەبەدیە. دوو جۆر زەمەن هەیە (دێڤاکالی) و (جیڤاتما کالی). دێڤاکالی واتە زەمەنی خودایی کە هەر ساڵی خودایی (٣٦٠) ساڵی مرۆییە و هەر ساڵێکی مرۆیی (جیڤاتما کالی)یش (٣٦٥) رۆژە.

ڤیداکان زەمەنیان دابەشکردۆتە سەر چوار بەش، هەر لە وردترین شت و بوونەوەر تا گەورەترین بوونەوەر بەم چوار قۆناغەدا تێپەڕ دەبن، بۆیە کاتی کەونی هەیە کە هەموو مادده و شتەکانی دیکەی بەسەردا دابەش دەبێت[1].

هەروەها ڤیداکان زەمەنی ئاگایی دابەش دەکەنە سەر ئەم چوار بەشە: ١- ساتیا یوگە، ٢ -تریتا یوگە، ٣- داواپارا یوگە، ٤- کالی یوگە. هەر چوار زەمەنەکەش پێکەوە پێیان دەوترێت (ماهایوگە)[2]. واتە خول ودەورێکی تەواو. هەر زەمەنێکیش لەو زەمەنانە، سەرەتا و کۆتاییەکی هەیە.

هەر یەك لەم زەمەنانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە، واتە تایبەتمەندی ئەو زەمەنانە پەیوەندی بە مەعریفەو زانینەکانی مرۆڤەکانەوە هەیە، کە خۆی لە چالاکیەکانی ئاگایی ناسوتی و لاهوتیدا دەبینێتەوە.

١- ساتیا یوگە (SATYA YUGA): ساتیا یوگە زەمەنی حەقیقەتە، کە بە زەمەنی ئاڵتونیش ناوزەد کراوە. لەم زەمەنەدا مرۆڤ لەگەڵ خودادا لە یەکبوونێکی تەواودا بووە و جیاوازی نەبووە لە نیچوان مرۆڤ و دەنگە ناوەکیەکاندا و مرۆڤ و ئاگایی مرۆڤ لە یەکێتیەکی تەواودابوون لەگەڵ ئاگایی و وجودی کەونی و ئیلاهی.

٢ -تریتا یوگە (TRETHA TYGA): ئەم زەمەنە زەمەنی جیابوونەوەی مرۆڤ و خودایە، ئەم جیابونەوە هیچ نییە، جگە لە فیراقی رۆحی و بێ ئاگابوونی مرۆیی لە ئاگایی کەونی و جیهانی و کەڕبوون لە ئاست دەنگە ناوەکیەکاندا کە رێگەی راست و هاوسەنگی نیشانی مرۆڤ

---

١ زانست و فەلسەفەی ڤیداییەکان- نوسینی، هاوبیر کامەران- چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩- ل٣٠

٢ زانست و فەلسەفەی ڤیداییەکان- ل ٣٠

دەدەن، لێرەوە پەرستیش و قوربانی (یاجنا) هاتنە کایەوە و ڤیداکان، لە ڕێگەی ریشی و پیاوە پیرۆزەکانەوە، کە لەگەڵ ئاگایی گشتی یەکیان گرتبوو، هاتنەبون و کەشفبوون.

٣- داڤاپارا یوگە(DAVAPARA TYGA): زەمەنی مردنی خوا.داڤاپارا یوگە ئەو زەمەنەیە، کە مرۆڤ بڕوای لەدەستدا بەرامبەر بە هێزی ڕەها و کەوتە ژێر عەقڵ و نەفسی فەردی خۆیەوە. لەم زەمەنەدا مرۆڤ بڕواناکات بەوەی مەڵبەندێك هەبێت تیایدا دەنگەکانی لێوەببیستێت و مەرکەزی ئاگایی باڵابێت.

٤-کالی یوگە(KALI YUGA): زەمەنی کالی یان زەمەنی مردنی مرۆڤ. لێرەدا ئیدی مرۆڤ نامێنێت، کە بتوانێت لەگەڵ ڕەهادا یەکبگرێتەوە. ئەم مرۆڤە بێ ئاگایە لەوەی کە ئەو ئاگاییەکی کەونیە و لە خۆی دوورکەوتۆتەوە، دەبێت بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی و خۆی بناسێ تا هاوسەنگی و ئارامی دەست کەوێت[1].

ئێمە ئەمڕۆ بە پێی لێکۆلینەوە ڤیداییەکان لە زەمەنی (کالی) داین، هاتنی مامۆستا و (ریشی)یەکان پەیوەندی بەم زەمەنەوە هەیە، ئەوان هاتوون و خەڵکیان وەبیری خۆیان خێناوەتەوە، هەروەها ئەوان لە ژێر کاریگەری زەمەن و شوێندا نامێنن و لەلایەن خوداوە دەست نیشاندەکرێن بۆ تازەکردنەوە(دهارما) و هێنانەوەی خەڵکی بەرەو زەمەنی ساتیە کە زەمەنی ئاڵتونیە. ئەو کەسانەی بە بە (ریشی) بەناوبانگ بوون و کۆنتڕۆڵی زەمەن و شوێنیان کردوە[2].

ئەو ریشی و مامۆستایانەی کە دەبینن مرۆڤایەتی بێ هیوایە لە لایەنی ئەو خولە لە کۆتایی نەهاتووانەی سروشتەوە، کراوە بە کۆیلە، ئیدی پێدا دەگرن کە دەشێت ڕێگەی سەر فرازی بە هۆی قوتاربوونیرۆحیانە لە زەمەن و مێژووی پڕوپوچی، دەروون یان خودی ڕاستەقینە ددەتوانێت خۆی لە جەستە رزگار بکات و ڕێگەی سەرەکی مرۆڤ ئەوەیە کە ئارامگیرانە لە توێی زنجیرەیەکی دوور ودرێژ دیسان بۆ لە دایکبوونەوە خەبات بکات، هەتا لە کۆتاییدا وەك، رۆحێکی پوختە بۆی دەرباز دەبێت.

مرسیا ئەلیاد، پێیوایە کە زەمەنی لە ئایینی کۆنی هندیەکاندا وشەی (کالی) بە مانای سەردەمی خراپ دێت و لەو سەردەمەدا مرۆڤ و کۆمەڵگە دەگەنە ئەو پەڕی شیبونەوە و تێکچوون و گەندەڵی. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە وشەی کالی پەیوەستە بە (کالی)

---

١ زانست و فەلسەفەی ڤیداییەکان- ل٣٢

٢ زانست و فەلسەفەی ڤیداییەکان — ل ٣٣

خواوەند، کە ئەمەش یەکێکە لە ناوەکانی خواوەندی گەورە (ساکتی) ژنی خواوەند(شیڤا). بۆیە کالی کە بە خواوەندی ڕەش ناسراوە، بەند و پەیوەستە بە وشەی (کالا)ی سەنسکریتی کە بە مانای زەمەن دێت، بۆیە کالی لای ئەوان بە خواوەندی زەمەن و چارەنووس دادەنرێت، چونکە چارەنووسی شت و دیاردە و بوونەوەرەکان دەستنیشان دەکات[1].

جیهانی مێژوویی لە دید و باوەڕی پێڕەوکەرانی (بودا) بە وەهم و پوچ دادەنرێت، چونکە جیهانی مێژوویی لە ئاستی ریتمی گەردوندا تەنیا یەك سات دەخایەنێت، بۆیە ئەوان واز لەو زەمەنە دێنن و بە دوای زەمەنی رەها و بێ کۆتاییدا دەگەڕێن، تاکە رێگە بۆ دەرچوون لەو زەمەنە و شکاندنی ئەو کۆت و زنجیرەی ژیانی بەند کردوە، بریتیە لە وەی کە لەو حاڵەتە مرۆییە دەربچن و (نیرڤانا) بە دەست بێنن، لە (نیرڤانا)شدا ڕوونکردنەوەی زەین و هزر و موعجیزەی دەرچوون لە زەمەن بەدی دێت و لای بوداییەکان بە مانای چاکەی باڵاّ و تەواو دێت، کاتێك کە مرۆڤ بۆ ئافەریدەکار دەگەڕێتەوە و خودی خۆی ئاوێتەی ئەو رەهایە دەکات [2].

گەڕانەو بۆ دواوە و رابردوو بۆ حاڵەتی سەرەتایی و کامڵی جیهان، بۆ ئەو ساتەی کە ژیان لە رەگوڕیشەوە دەستپێدەکات، ئەو ساتەی کە لێوان لێوە لە بەڵێن و ئاوات. هەروەها جەختکردنە لەسەر ئاراستەی خولی و بازنەیی ژیان. کە هەمو شتێك سەر لە نوێ دەستپێدەکاتەوە و هەمیشە سەرەتاکەی روونە. دەرچوون لە زەمەنی بچووك (مێژوویی) و گەیشتن بە زەمەنی خولی و بێ کۆتایی، ئەوە دەردەخات کە زەمەن دیاریکراوە و لە رێگەی هێما و سرووتی ئایینیەوە گەزارشت لە زەمەنی خولی کراوە[3].

بەم پێیە زەمەن لای بوداییەکان، خوللی بووە، جیهان لە کاتێکی دیاریکراودا ئافەریدەکراوە و پاشان کاول و وێران دەبێت. بە بڕوای بوداییەکان زەمەن لە ڕژان و دەرچوونێکی هەمیشەیی پێکدێت. بە کاری ئەو تواوەیە شێوەکان لە زەمەندا پەیدا دەبن، سەرەڕای فەنابون، لێرەدا مەبەست لە شلی و تواوەیی زەمەن، ئەوەیە کە ساتی ئێستا ناواقعیە، چونکە بەردەوام ئەو ساتە دەبێتە ڕابردوو و نامێنێت[4].

---

١ صور و رموز- مرسيا اليا- ل ٨٧

٢ صور و رموز- مرسيا اليا- ل٩٠

٣ صور و رموز- مرسيا اليا- ل٩٤

٤ صور و رموز- مرسيا اليا- ل١٠٧

بۆیە بە گوێرەی باوەڕی بودا هەموو ساتە زەمەنیەکان بۆ زەمەنی ئێستا دەگەڕێنەوە. زەمەنی (ئێستا- هەمەکی)ی بریتیە لە ئێستایە ئەبەدیەی کە حاڵەتێکە لە بێ جوولەیی و جێگیری و هەر کەسێك بیر و هۆشی چەسپاو بێت، ئەوە رووباری زەمەن لای ئەو مرۆڤە دەوەستێت و لە ئێستایەکی ئەبەدیدا دەژیت [1].

- **زەمەن لە ئەفسانەی گریکەکاندا:**

بە گوێرەی ئەفسانەی گریگەکان، (کرۆنۆس) خواوەندی زەمانە، لە هەندێك گێڕانەوەدا کرۆنۆس وەك (مارێك) وێناکراوە کە سێ سەر یان سێ رووی هەیە، کە ئەمەش وێناندێکی رەمزیە بۆ بەشەکانی زەمەن(رابردوو، ئێستا، ئایندە) کەواتە مار لای ئەوان هیمایە بۆ کرۆنۆس و لە هەمان کاتدا بۆ زەمەنیش، لەبەر ئەوەی خاسیەتەکانی مار بریتین لە: خۆگۆڕین، لەخشتەبردن و مەکر، رۆیشتن و ئینسیابکردن بۆ ناو شتەکان[2]. ئەمانەش دەلالەت لە زەمەن دەکەن.

بە گوێرەی ئەفسانەی یۆنان "کرۆنۆس" کۆنترین خواوەندی یۆنانە و لە سروشتەوە پێی رادەگەینرێ کە یەکێك لە منداڵەکانی دەیکوژێ و شوێنی ئەو دەگرێتەوە، لەمەوە "کرۆنۆس" بڕیار دەدات هەموو کوڕەکانی خۆی قوت بدات و هەڵلوشێ، بەڵام کاتێ "ریا"ی خێزانی منداڵێکی بە ناوی "زیۆس" دەبێ دەیشارێتەوە لە بری ئەویش بەردێکی پێ دەدا، ئەویش هەڵدەلوشێ، بەم جۆرە زیۆس رزگاری دەبێ و گەورە دەبێ و هێرش دەکاتە سەر باوکی و لەناوی دەبات[3].

هەروەها ئەفسانەکانی یۆنان ئەوە دەردەخەن، کە ئەوان زۆر باوەڕیان بە (گەڕانەوەی سەرمەدی) هەبوە و پێیان وابووە، کە زەمەن بازنەیی و خولیە، واتە بڕوایان وابوو کە گەردوون و ئەو جیهانەی ئێمە لەسەری دەژین، لە شێوەی بازنە و خولی، گەشە دەکات و دیاردەکان هەمیشە دووبارە دەبنەوە و بەدوای یەکدادێن. واتە یۆنانەکان باوەڕیان بەوە نەبوو کە رووداوێك لە گەردوون و جیهاندا تەنها جارێك رووبدات، بەڵکو رووداوەکان بە شێوەیەکی خولی بەردەوام دووبارە دەبنەوە[4].

---

١ صور و رموز- مرسيا اليا- ل١١٠

٢ الزمن في الفكر الديني والفلسفي- ل٥٦

٣ ط، كاروان.ذ- ١٣٥-ل ٧٦

٤ المقدس و العادي- مرسيا الياد- عادل العوا- بيروت- ٢٠٠٩-ل ١٤٢

## - زەمەن لای عەرەبەکان:

عەرەبەکان سیما و سیفەتی جۆارو جۆریان بە زەمەن داوە و لە شیعر و بەسەرهات و فەرهەنگ و هزری کۆنی عەرەبەکاندا، دەیان وشە و چەمکی زەمەن، وەك:(الدهر، الحين، المده، الازل، الرمد، الامد، القدم) بەرچاو دەکەوێت، جگە لەوەی کەلە قورئاندا زۆر باسی زەمەن کراوە.

لە سەردەمی جاهلیدا، عەرەبەکان بڕوایان وابوو، کە زەمەن هێزێکی زەبەلاح و باڵا دەستە و بەسەر ژیانی مرۆڤدا و مرۆڤ دەمرێنێت، بۆیە عەرەبەکان جنێویان بە زەمەن دەدا و نەفرەتیان لێ دەکرد، چونکە بە دیدی ئەوام زەمەن سەرچاوەی خراپەکاری و بەد بەختیە، ئەم دیدەی ئەوان لە قورئاندا رەنگیداوەتەوە، هەروەك لە قورئاندا هاتووە (قالو ماهی الا حیاتنا الدنیا نموت و نحیا و مایهلکنا الا الدهر).[1]

واتە تێپەڕینی شەو رۆژ و زەمەن دەمانکوژێت، کە ئەمەش نکۆڵیکرنە لە رۆڵی خودا لە مردنی مرۆڤدا. ئەم باوەڕە لە ناخ و دەرونی عەرەبەکانی سەردەمی جاهلیدا چەسپاو و باوبوو، تەنانەت دوای ئاییینی ئیسلامیش ئەم باوەڕە لە ناو عەرەبەکاندا هەر باوبوو، کاتێك دووچاری کۆست و کارەساتێك بونایە، ئەوا دەیانگەڕاندەوە بۆ (الدهر)، بۆیە جوێنیان بە دەهر دەدا[2]. (ئەمەش وای لە پێغەمبەر کردنەهی لە نەفرەتکردن لە دەهر بکات، ئەمەش بە پێی ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێت: (لاتسبوا الدهر، فانی انا الدهر).

لای عەرەبەکان وشەی (زەمەن) بە مانای (الدهر) هاتووە، هەروەها زماننناسەکانیش، پێیان وایە کە وشەی (زەمەن) و (الدهر) یەك مانا دەبەخشن، بەڵام زەمەن کورترە لە دەهر، واتە زەمەن بۆ ماوەیەکی کورت بەکارێت، بەڵام (الدهر) بە مانای زەمەنی بەردەوام و بێ کۆتایی و هەمیشەیی دێت[3].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە عەرەبەکان وشەی (زەمەن)یان بە هاومانای(دهر) بەکارهێناوە، هەروەك شاعیری جاهیلی (زهیر بن ابی سلمی) لە شیعرێکدا دەڵێ:

---

١ آلزما ن في آلفكر آلديني والفلسفي – تآليف ( حسام آلآلوسى ) – ل ١٩

٢ المفصل في تاريخ العرب قبل الاسلام- د. جواد علي- جزْ السادس- ل – ١٤٩

٣ المفصل في تاريخ العرب قبل الاسلام- د. جواد علي- جزْ السادس ـ ل- ١٥٠

| | |
|---|---|
| **لمن الديار بقنه الحجر** | **اقوين من حجج و من دهر** |
| **لعب الزمان بها و غيرها** | **بعدى سوافى المور والقگر [1].** |

هەروەها وشەی (زەمەن) لە شیعری هەندێك شاعیری دیکەی جاهلیشدا هاتووە، کە گوزارشتی لە غەدری زەمەن و یاریکردن بە چارەنووسی مرۆڤ هاتووە.

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەوان باوەڕیان وابوو کە زەمەن بە ئارەزووی خۆی یاری بە چارەنوسی مرۆڤ دەکات.

عەرەبەکان چەمکی زەمەنی مێژوویان لە یادنەکردبوو، لە رۆشنایی ئەم هزرەدا، گەیشتنە چەمکی ئەو زەمەنەی کە نەسەرەتا و نەکۆتایی هەیە و بە (الدهر) ناویان دەبرد، دوای ئەوە بە هۆی باوەڕی ئایینی ئەم چەمکە گۆڕینی بەسەردا هات. لە ڕوی ڕۆژژمێرەوەش عەرەبەکان لە کۆنەوە، بە هۆی (ئەستێرە)کانەوە، کاتیان زانیوەو ڕووداوەکانیان تۆمارکردووە.

مێژوونووس (ئەبو جەریر تەبەری) سەبارەت بە زەمەن، دەڵێت: دوایین شت کە خوا ئافراندی زەمەن بوو و بە دیدی تەبەری زەمەن بریتیە لە: سەعاتەکانی شەو و ڕۆژ، شەو سەرەتای خەلقکردنی زەمەن و رۆژیش کۆتاییەکەیەتی [2].

١ المفصل في تاريخ العرب قبل الاسلام- د. جواد علي- جزْ السادس- ل١٥١

٢ آلزما ن في آلفكر آلدينى والفلسفي – تآليف ( حسام آلآلوسى ) – ل٢١

# بەشی سێیەم

## زەمەن لای گەلی کورد:

ڕووباری زەمەنی کورد لە کوێوە هەڵدەقوڵێت؟ لە ئەشکەوتی شانەدەر و هەزارمێرد، یان لە چیاکانی (ئارات، جودی، قەندیل، هەورامان،...) یان لە کەلاوەی میرنشینەکان و پاشماوەی قەڵاکانی دم دم و هەولێر و ئامێدی و کەرکوك، یان لە کۆچکردنی خێڵە ڕەوەند و کۆچبەرەکان، کە گەرمیان و کوێستان دەکەن، یان لە ئەنجامی شەڕەکانی نێوان میرنشین و خێڵەکانەوە، زەمەنی کورد دەستپێدەکات، یان ئەڤین وخۆشەویستیە نەمرەکانی وەك، مەم و زین و خەج و سیامەند، سەرەتایەکن بۆ زەمەنی گەلی کورد، یان ڕاپەرین و شۆڕشە کوردیەکان بە سەرەتای زەمەنی کورد دادەنرێن.

ئەم هەموو کارەسات و مەینەتیانە وای لە کورد کردوە زۆر گلەیی و گازاندەی لە زەمەن هەبێت و زۆر جاران بڵێ: چەرخی چەپگەرد و چەرخی سپڵە و گەردوونی بێ بەزەیی تا... تەنانەت ئەم گلەییە، لە شیعری شاعیرەکانی کوردیشدا رەنگیداوەتەوە، بۆ نموونە، فایەق بێکەسی شاعیر،سەرزەنشتی زەمەن دەکات و داخی ناو دڵی هەڵدەرێشتە نێو شیعرێکەوە، دەرحەق بەو رۆژگارەی کە هەمیشە بۆتە کۆسپ و تەگەرە لە پێشیدا و دووچاری خەمۆکی کردوە، بۆیە بە توندی سەرزەنشتی زەمەن دەکات و دەڵێ:

**ئەی زەمانەی بیٚ وەفا تا کەی لەگەڵما خائینی**
**دائیمەن نارێك و چەوت و عەکسی ئامالی منی**
**مودەتیٚ لای خۆت لەگەڵما وەك برابووین ئەی زەمان**
**حاڵی حازر لێم بەری بووی، ناحەز و هەم دوژمنی [1].**

هەرچەندە زەمەنی کورد پڕبووە لە مەینەتی و کارەسات و ناخۆشی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تروسکێك هیواو ئومێدی تێدا بووە، کەسانێك هەبوون تواناو حەزێکی گەورەیان بۆ گۆڕین و پێشکەوتن هەبووە. ئێمەی گەلی کورد، ئێستا چاوەڕوانی زەمەنی کوردین، چاوەڕوانی سەردەم و لە دایکبونێکی نوێین.

زۆربەی زۆری گەلان، خودان زەمەنی پیرۆز و گرنگن. جڤاتی گەل، یان شوێنکەوتوانی باوەڕ، ریز لەو زەمەنە دەگرن و زیندوی ئەکەنەوە. بۆ نموونە ئێمەی کوردیش، جەژنی "نەورۆز" کە لە نێو میللەتی کورد و گەلانی ئێران، هەر ساڵ بە نەریتی تایبەت یادئەکرێتەوە [2]. جفات و خەڵکەکە بە گشتی هەوڵدەدات بە ئەکتیڤکردنەوەی ئەو یادە پیرۆزە، بۆئەوەی بۆ چەند سات و خولەکێك لە ژیانی ئاسایی دوور بێت و بەدەر لە نەریتی ژیانی ئاسایی، ئاسوودە بێت و بحەسێتەوە. [3] ئەمەش جۆرێك نوێبوونەوە و گوڕگرتنەوەی بەدواوەیە.

هەروەها (میرسیا ئەلیادە)ش سەبارەت بە جەژنی نەورۆز، پێیوایە، کە نەورۆز یادکردنەوەی رۆژی ئافراندنی جیهان و مرۆڤە و رۆژی نوێکردنەوەی خەڵقکردن و ئافەریدەکردنی بوونەوەرەکانە، هەروەها پێیوایە کە نەورۆز نیشانە و هێمایە بۆ تازەکردنەوەی ئەو شتانەی کە زەمەن لەناویبردون [4].

---

١ ديوانی بێکەس- محمدی مەلا کەریم- سلێمانی، ٢٠٠٨، -- ل١٦٦
٢ جەژنێك بۆ پیر (بنەمایەك بۆ ئوستورەی کوردی)- رەووف مەحمود پوور- هەولێر، ٢٠٠٩- ل ٢٦٣
٣ جەژنیك بۆ پیر(بنەمایەك بۆ ئوستورەی کوردی)- ل ٢٦٣
٤ المقدس والعادي- مرسيا الياد- ترجمة، عادل العوا- بيروت- ٢٠٠٩- ل١١٢

بەمپێیەی کە زەمەنی ژیانی ئاسایی ژیان و مرۆڤ بەرەو دارزان دەبات و ماندوێتی ئەخاتە سەر شانی تاك، هەر بۆیە لە زەمەنی پیرۆزەکاندا، بە یادکردنەوە و ئەکتیڤکردنی نەریتە تایبەتیەکان، جۆرە شەرێك دژ بەو دارزان و وەڕسبوونە دادەگیرسێ.

هەروەك چۆن لە جیهاندا گشت نەتەوەیەك پیاوی شارەزا و بەهرەمەندی لە بواری کەشناسی و پێوانی زەمەندا هەبووە، کوردیش لەم بوارەدا شارەزای باشی هەبووە، چونکە بوونی چوار وەرز و کەشی بێگەردی ئاسمانی شینی کوردستان، وای کردوە ئەستێرەکان بە جوانی ببینرێن و و بە چاکی لە جێگۆڕکێی ئەستێرەو بورج و سەرە وەرزەکان شارەزا بن، بزانن کەی و چ کاتێك گەرما دێت، کەی سەرما دێت، کەی فێنکە، کەی بەفر و رەهێلەیە. جگە لەوەی توانیویانە بە هۆی ئەستێرەکانەوە رێگە و بانی خۆیان لە سەفەر و بەڕێکردنی کاروان لە گەرمیانەوە بۆ کوێستان دیاری بکەن، چ وەك کاتژمێر و رۆژژمێر بەکاریان هێناوە چ وەك نیشانەی راست و چەپ[١].

کوردیش وەکو هەموو نەتەوە و میللەتانی دونیا بایەخ و گرنگی بە زانینی دەم و کات و زەمەن داوە. زۆر وشە و دەستەواژە وپەندی کوردی سەبارەت بە زەمەن و کات هەیە و سوودی لە زۆر لە دیاردەکانی سروشت و پەلەوەر و ئاژەڵ وەرگرتووە بۆ زانینی کات. هەروەها لەبارەی چاندن و تۆکردن و شینایی پابەندبووە بە کاتەوە.

کورد لە رێگەی هەڵهاتنی رۆژ و مانگ و ئەستێرەکانەوە، کاتی دیاریکردوە بۆ کارکردن و بەرووبووم و دورینەوە و میوەچنین، ئەوانە دەردەخەن کە دیاریکردنی کات و دەمی شتەکان، هۆیەکی گرنگ بوە لە ناو کوردەواریدا. سەبارەت بەوەش لە کوردەواریدا چەندان زاراوەی کاتژمێری کوردیمان هەیە، کە لە ژیانی رۆژانەدا بەکارهاتوونەو تا پێش پەیدابوونی کاتژمێری ئاسایی هەر باوو بون، کە زۆربەی زاراوە و ناو ناسینی کاتەکان، هەر سەبارەت بە پیشە و گوزەرانی کوردەواری بووە، رەنگە ئێستا پیر و بەساڵاچوو مابن ئەو ماوە ژمێریانەیان لا زۆر ئاسایی بێت[٢]. بە وردیش کاتیان پێ دەپێوا بۆ کاتەکانی نوێژکردن پەیڕەویان دەکرد، بۆ نموونە، دەیانگوت: (شەو گوریسە، رۆژ بارە) مەبەستی وابوو شەو بە گوریس دەپێورێ، رۆژیش

---

١ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ- ژ، ١٠١- ١٩٨٤ — ل١٢٢

٢ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣- ل١٥١

به بار، دەربارەی گوریس، شەو دەیانگوت، لە کۆنەوە حیسابی شەویان بە گرێدانی گوریس کردوە وچەند گرێیەکیان لە گوریس دایە، هەر گرێیەك بێنەك بووە[1].

لە کوردەواریدا کە دەڵێن: (خۆر بارێك یان دووبار هەڵهاتووە، یان خۆر رمێك یان دوو رم بڵندە) لەو بە دواوە ئەو بابەتە پێوانەیە وردتر کرا و دابەشکرا بە (نیوبار) یان (نیو رم) لەگەڵ رادەی پێشکەوتنی مرۆڤ و پەرەسەندنی هۆش وردەکاری خرایە، ئەو پێوەرانە بۆ کات ژماردن تا وای لێهات، گۆشەی بەرامبەر بار (باڵ) بۆ بەرزایی ئاسمان سەرنج لێبگرن.

هەروەها لە کوردەواریدا ئەستێرەکان رۆڵی کاریگەریان هەبووە بۆ دیاریکردنی کات و ئاو دابەشکردن و دەست بەکارکرن، وەك لەمانە دەردەکەوێت: ئەستێرەی کاروان کوژە، کە کاروانچی لەگەڵ هەڵهاتنی هەڵدەستن بۆ کاروان بچن. ئەستێرەی سیوەیل، لە ناوەراستی پاییزێ هەڵدیچ، کە هەلات مانای وایە: ١- قەمیش پێگەیشتووە و دەیبڕنەوە. ٢- کاتی میوە پێگەیشتنە. ئەستێرەی تەرازوو: ئەگەر رۆژ لە دەرەجەی ئەستێرەی تەرازوو ئاوابوو، زستان تەواو دەبێ، بەهاریش دەست پێدەکات لە (٢١) ی ئادار[2].

لە کوردستاندا بە هۆی لوتکەی بەرزی چیاکان و دروستبوونی گوندەکانی کوردەواری لە قەد پاڵ و بن چیاکانەوە، وای کردوە لە ئاسۆ بڕوانن و شارەزایی و پسپۆری لەم بوارەدا پەیدا بکەن، بۆ نموونە(هەفتە)کان کەلە ماوەیەکی دیاریکراوی ساڵدا هەن، کە کەش لەو ماوەیەدا زۆر سارد دەبێت و دەکەونە چلەی زستانەوە، کە هەر یەکەیان حەوت رۆژە و لە ژماردنی ڕۆژگاری ساڵ بەکاریان دێنیین. لەبەر زۆر ساردی و گرنگی ئەو روداوە سروشتی و ناسروشتیانەی کە تێیاندا ڕوویان داوە، جا ئەوانە وایان کردوە ببنە هۆیەکی ناسینەوەی زەمەن و دەمی ساڵ و ئەوانەش، بریتین لە چەند هەفتەیەك، کە هەر یەکەیان ناوی تایبەتی خۆی هەیە، وەك هەفتەی ئەلیاس واتە (پشکۆی هەوا) و هەفتەی پشکۆی ئاو و پشکۆی زەوی بەرمانگی (ڕەشە مێ) دەکەون کە مانگ کۆتایی ساڵە و کۆتایی زستانیشە لە ساڵنامەی کوردیدا[3].

---

١ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣- ل١٥١

٢ فەرهەنگی کات، ل ١٥

٣ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ- ژ، ١٠١- ١٩٨٤ — ل١٢٧

کورد بە هۆی جیاوازی ئاو هەوا و رەگەزەکانییەوە، کە باو ببارانە توانیویەتی حسێبێك بۆ ساڵنامە بکات، بە پێی کات و شەو ورۆژ هەفتە و مانگ و وەرزەکانەوە. بە هۆی ئەزمون و تاقیکردنەوەکانی باری ژیان، هەڵوێستی تایبەتی بەرامبەر بە کات و مانگ و وەرزەکان دەربڕێت.

بۆ ناسینەوەی وەرز و ساڵنامەگەری، کوردەواری زۆر بە شارەزایی زۆر ئاوی و بیٚ ئاوی و چك کردنی کانی و بیر و کاریزەکانی مەزەندە لیکردوە، لە وەرزەکاندا، ئینجا لە هەر وەرزێکیش بە جودا کەمبونەوەی ئاوی گۆمەکان و هێشتنەوەی ئاسەواری ئاستی ئاوەکە لە لیواری گۆمەکان بە شێوەی چین لەسەر یەکتری تۆز وخۆڵەپۆك... واتە هەر رۆژەی چینێك بە جۆرێك وابوە لە قەد باڵی گۆمی هەندیٚ شاخدا ئاسایی ژمارەی رۆژەکانی کەمبونەوەی ئاو دەژمیٚردرا، هەر ئەو سیستەمە لەلایەن کوردەواری بەکارهاتووە بۆ کاتژمێری رۆژانەی سەبارەت بە کەمبوونەوەی ئاوی کوپە و گۆزە[١].

هەروەها بەر لە دەرکەوتن و زۆربونی  کاتژمێر، لە کوردەواریدا، بە تێبینی کردنی نەوتی ناو چراکان کاتیان پێزانییوە، هەروەها کوردەواری لە بواری کاتژمێری پێوانی کاتەکانی شەوو رۆژ شارەزابووە، کۆنترین ئاسەوارەکان دەگەڕێتەوە مزگەوتەکان، مەبەستم مزگەوتەکانی زەردەشتی کە هورمزگا ناویان هاتووە لە سرروتەکان نوێژکردن و لەخودا پاڕانەوە، کاتژمێری وردیان کردووە و هەر چەندە، نوێژیان لە خۆر هەڵاتن و ئاوابووندا بووە، بەڵام بۆ رۆژانی هەور و باران، بێگومان بە ئاگر کاتژمێرییان کردوە[٢].

لێرەدا بۆمان روونده‌بێتەوە کەوا کۆمەڵگای کوردیش، هەر لە زووەوە هەستی بە گرنگی کات و زەمەن کردووە و بایەخی پێداوە لە پێناو ئەنجامدانی کارەکانیدا بە تایبەتی لە بواری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ژیانی رۆژانەی خۆی، بۆیە دەیان و سەدان پەند و زاراوەی جوار و جۆری لەم بوارەدا بۆ نەوەکانی جێهێشتووە.

لەلایەکی دیکەوە، سەبارەت بە بنەما و سەرەتای ساڵ و رۆژژمێری کوردی، لە کوردەواری

دا چونکە رۆژژمێر و حیساباتی گەڕی وەرز و پتر لە سەردەم زاران بووە و رۆژمێرێکی گونجاو یەکگرتوو کە داگیری بنەماو سەرەتایەکی رەسەن و نەتەوایەتی بیٚ لە ئارادا نەبوە، چەندین، کارەسات و رووداوی ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و رامیاری، وەك سەرەتا بۆ دیاریکردنی ماوەیەکی زەمەنی، کەرتێکی مێژووی دەست نیشانکراوە، وەك (ساڵی سەفەر بەرلەك) بە بۆنەی کارەساتەکانی شەڕی یەکەمی گێتی، لەم بارەیەوە، مەلا مەحموودی

١  گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣- ل١٥٣

٢  گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣- ل١٥٤

بایەزیدی نووسیویەتی: " کوردەکان مێژووی تەمەنی خۆیان  بە هۆی گەرکێن و کوێستانەوە دیاری دەکەن، چونکە مێژووی ئەوان هۆبە و ئاران و زۆزانە. بۆ نموونە دەڵێن ئێمە دوو ساڵ لە فلانە کوێستان بووین و ئەوەندە ساڵەش فلانە گوند بارگەمان خست و بەم شێوەیە تەمەن و سەربوردی خۆیان دیاری دەکەن[١]. لەناو چەند هۆز و عەشیرەتێکی ناوچە کوێستانەکانی تیلەکۆ (کورسی زستان) بە سەرەتای ساڵ و ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراوە. هەر کە زستان کۆتایی پێدەهات " کورسیەك" تەواو دەبوو، بۆ نموونە دەیانگوت: دوو کورسی لە فلانە گوند بوون، واتە دوو ساڵ یاد و زستان لەو گوندەجێگیربوین[٢].

کەموکورتی ئەم جۆرە سەرەتا کەم خایەن وزارەکیانە لەوەدایە، کە بە سەرهەڵدانی کارەسات و رووداو و گۆڕانکاریی نوێ، سەرەتای دیاریکراوی پێشوو لەبیردەکرا، رووداوی نوێ دەبوو بە سەرەتا. بۆیە پێویست بوو بۆ بڕیاری سەرەتایەکی نەگۆڕ و پڕاوپڕ بێتە ئاراوە، لە پێناو پڕکردنەوەی ئەو بۆشایی و کەلێنەدا، هەوڵی جۆراو جۆر دراوە بۆ دۆزینەوەی ساڵنامەیەکی تۆکمە کە جیگای راستی و متمانەبێ لە حیسابی مانگ و رۆژ و بۆ تۆمارکردنی رووداوە گرنگەکان، کە ئەوەش پەیوەستە بە دانانی رۆژژمێرەوە، بنەمای رۆژژمێریش ساڵێکە کە مەودای زەمەنی روداوەکانی پێ بەراورد و ئەندازە دەگرن و سەری ساڵ خاڵێکە، بریتیە لە برشگەیەکی زەمەنی و مێژوویی وەك ساڵ لەو خاڵەدا تەواو دەبێ یان دەست پێ دەکاتەوە[٣]. جگە لەمە ساڵنامە خشتەیەکە بۆ چاودێریکردنی رەوتی زەمەن بە گشتی و کەرتێکی سەروبن دیاریکراوی زەمەنی وەك ساڵ بە تایبەتی. قەوارەی رۆژژمێر و خشتەی ساڵنامە تەوەرێکە بۆ سەقام پێدان، هاوهەنگاوکردن و رێکخستنی ئەرکە کۆمەڵایەتی و تاکییەکانی مرۆڤ لە گەڵ رەوتی زەمەندا.

کوردیش خاوەنی رۆژژمێر و بنەماو سەرەتایەکی زەمەنی مێژوویی تایبەتە، کە بنەمای رۆژمێری هەتاوویە. هەموو کوردەکانی جیهان نەورۆز بە سەری ساڵ دەزانن و ساڵی هەتاوی و سروشتی و کوردی لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە خۆر دەگاتە(خاڵی بەرابەرانی بەهاری) ئەویش نەورۆز و سەرەتای مانگی خاکەلێوەیە، کە هەمان کات لە ئێراندا بە ناوی رۆژژمێری هەتاوی رەسمیەتی هەیە[٤].

---

١  گۆڤاری ، رامان، ژ- ٣٩- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٢٢

٢ گۆڤاری ، رامان، ژ- ٣٩- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٢٣

٣  گۆڤاری ، رامان، ژ- ٣٩- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٢٢

٤  گۆڤاری ، رامان، ژ- ٣٩- ساڵی، ١٩٩٩-ل ٢٢٣

به گشتی له وه‌رزه‌كانی ساڵنامه‌ی كوردیدا، گه‌لێگ لایه‌نمان به پێی سروشت و دابونه‌ریتی كورده‌واری بۆ روون بووه‌ته‌وه. كه‌واته هه‌ر له كۆنه‌وه كورد بۆ زانینی ئه‌و ماوه كاتییه‌ی تێیدا ژیاوه، هه‌وڵی ناسینه‌وه‌ی داوه و بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ش سووڕانه‌وه‌ی زه‌وی و سووڕانه‌وه‌ی هه‌یڤ و هه‌ڵهاتن و ئاوابونی ئه‌ستێره‌كانی بۆ رۆژژمێر و ماوه و كاتی شته‌كان به‌كار هێناوه.

جگه له‌مه كوردی موسڵمان له‌هه‌ر پارچه‌یه‌كدابێ بۆ به‌ڕێوه‌بردنی ئه‌رك و كاروباری ئایینی خۆی وه‌ك رۆژووی مانگی ره‌مه‌زان، رێوره‌سمی حه‌ج و قوربانی كردن و جێژنه ئایینیه‌كان، رۆژژمێری ئیسلامی و بنه‌مای ساڵی مانگی ره‌چاو ده‌كه‌ن.

# بەشی چوارەم

## (زەمەن لە ئایینەکاندا)

### - زەمەنی ئایینی:

زەمەنی ئایینی کە زەمەنی ئەزەلیەت و هەتاهەتاییە، خۆی جیادەکاتەوە لە زەمەنی کۆمەڵایەتی کە لە نێو مێژوویێکدا دروست دەبێت. مۆریس ئەڤاکس پێیوایە لە هەموو ئاینەکاندا، رابروو هەمیشە لە ئێستا ئامادەیە و هیچ ئایینێك نییە، کە رابردوو نەکات بە سەرچاوەی سەرەکی و هەمیشەیی خۆی[1]. زەمەنی سێنتەری پیرۆز لە هۆشی ئەواندا بە جۆرێك سیما دەگرێت بەوەی داخراوە و دژی زەمەنی واقعی کراوەیە. ئەم رەهەندەش بە تەوەریەتی زەمانی سینتەر وێنا دەبێتبە نیسبەتی زەمەنی تەختەوە، بەمەش گواستنەوە لە چوارچێوەی بازنەی شوێنەوە بۆ سینتەری بازنەکە روودەدات، چونکە ئێمە ناتوانین خۆمان لە سینتەری بازنەکە لابدەین بێ ئەوەی بە دەرگای ئاسماندا تێبپەڕین. ئەم مانایەی زەمەن بونیادێکی سەرفرازبوونی قیامەتی گرتۆتە خۆی، ئەمەش بە نیسبەتی هۆشی مرۆڤی ئیماندار شتێکی بنەڕەتیە و باوەڕداری ئامادە- ئێستا تێدا ناژی، بەقەدەر ئەوەی لەلایەکەوە تامەزرۆی زەمەنی یەکەمە، هەروەها لەلایەکی تریشەوە بە پەرۆشەوە چاو دەبڕێتە سەرفرازی، چونکە بە نیسبەتی رۆشنبیری ئەم سەردەمەوە حەقیقەتی سەرەکی بریتیە لەوەی ئەم زەمەنە بۆ ئامانجی کەوتنەخوارەوە و سەرفرازی ئامادەکراوە، کە باشترین زەمەنی شیاوە. لێرەدا زەمەن بەردەوام

---

١ ئایین چییە؟ نوسینی، دانیال هیرڤیۆ لیژێ، و. عادل باخەوان- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٨-ل ٢٣٢

له توێی ئەم دابڕانە پیرۆزەوە دەستپێدەکاتەوە-خۆی کاوێژدەکاتەوە- کە تێیدا روودەدەن، ئەویش سەردەمی جەژنەکان و بۆنە ئایینیەکانە، باوەڕداریش دەتوانێت بە هۆی سروتە ئایینیەکانەوە هانای بۆ ببات بۆ هێنانەوە یان دەرکەوتنی زەمەنی پیرۆز، چونکە لێرەدا زەمەن قابیلی هێنانەوەیە و لە هۆشی ئەودا دووبارەدەبێتەوە، ئەمەش مەسەلەیە کە توانی خولی زەمەن قورس بکات و ویژدانی باوەڕدار بە رەورەوەیەکەوە پەیوەست بکات و هۆشی ئێستای زیاتر و زیاتر بە خۆیەوە پێوەند بکات. لێرەشەوە یادەوەریەکەی بە زەمەنەکانی پیرۆزەوە و لە ژێر بیرۆکەی باوەڕدا دەنالێنێت و چاوەڕێی مەلەکوتی یەزدانە[1].

له کاتی ئەنجامدانی سروتە ئایینیەکاندا مرۆڤ لە کات و شوێن و جوولەیەکی جیاواز لە کات و شوێن و جوولەی ژیانی ئاسایی خۆی دەردەچێ، چونکە لە جەستە و پێوەری مرۆییانەی ژیانی مرۆڤایەتی رزگاری دەبێ، بۆیە ئەوێ (بەهەشت) ژیانێکی وێنەیی مانداری نازەمەنییە.

له خەسڵەتە هەرە دیارەکانی ئاینەکان، ئەوە بو کە تێڕوانینی تایبەتیان بۆ مێژوو هەبووە، بۆیە لێرەدا پێویستە ئاگاداری شتێکی گرنگ بین ئەویش چەمکی مێژووە لە روانگەی ئایینەکانەوە، ئایینەکان بە پێچەوانەی فەلسەفەلە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مێژوودا زیاتر بڕوایان بە زەمەن بوو و دوو جۆرە زەمەنیان دادەنا: زەمەنێکی زەینی و زەمەنێکی عەینی، زەمەنی زەینی جیهانێك بوو کە هیچ یاسا و رێسایەکی کاتی تێدا پەیڕەو نەدەکرا، کە ئەمە لە ئەفسانەکاندا خۆی دەنوێنێت[2] زەمەنی عەینیش شانۆی رووداوەکان و واقعیەتەکانی مێژووە، بۆیە ئایین لە پێش هاتنەکایەی فەلسەفە، وەك سیستەمێکی تێفکرین و بەڵگەهێنانەوەیە و زیاتر لەگەڵ زەمەنی زەینی کاری دەکرد، شتی ئەفسانەیی دەخولقاند، رووداوی سەیر و سەمەرەی باسدەکرد، دەیویست زەمەن و رووداوەکانی مێژوو و هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە بونەوە هەیە، بە ویستی خوداکان لێکبداتەوە[3]، بۆ نموونە ئەفسانە بابلیەکان لە بارەی خەلقکردنی گەردوون، بە پێی ئەم ریگەیە شیکردنەوەی خۆیان خستۆتە روو. بۆیە ئەبینین ئامانج لە تان و پۆی ئەفسانەکان جگە لە وەی دانانی سەرەتایەك بوو بۆ مێژووی جیهان، هەروەها جۆرە رێکخستنێکیش بوو لە نێوان رووداوە مێژوویەکان. ئەم شێوازە

١ گ- سەردەم- ژ ٢٨- سال- ٢٠٠٣- ل ٢٦

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠- ل ١٧٩

٣ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ١٧٩

تەفسیرە لە زانستی مێژوودا، بە (خوداناسی مێژوو) ناوبرا، لەبەرامبەردا زەمەنی عەینی و بینراو هەبوو، ئەم زەمەنە بە پێچەوانەی زەمەنی زەینی، سنووردارو دیاریکراو بوو و دەکرا لە ڕێی ئەزموونیش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەین[1].

لێکدانەوەی ئاینی بۆ زەمەن و مێژوو یەکێکە لە کایەکانی لێکدانەوەی ئایدیالیانە بۆ مێژوو و کرۆکی ڕاڤەکردنەکەشی بۆ ڕەوتی ڕووداوەکانی مێژوو ئەوەیە کە باوەڕی بە هەبوونی هێزێکی نەگۆڕ و جێگیرە لە پشت ڕووداوەکان، کە بریتیە لە ئیرادەی خودا، بەلای ئەم جۆرە لێکدانەوەیە، ئەم هێزە دەسەڵاتی بەسەر سەرجەم کاروباری مرۆڤدا هەیە و سەرئەنجامیش ئەم هێزە یاسایەکی دیاریکراو بۆ بزواندنی جوڵەکانی مرۆڤ لە هەموو کایەکانی ژیاندا دەخولقێنێت[2]. ئایینە ئاسمانیەکان لە لێکدانەوەی مێژوویدا بە گشتی تێڕوانینێکی هاوبەشیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەوەی لە گەردووندایە لە مرۆڤ و گیاندار و بێ گیان لە نەبون و عەدەمەوە خولقێنراون و ئەزەلی نین. ئەم تێڕوانینیە پێی وایە کە گەردوون بە هەموو ئەو شتانەی کە تیایدایە ئافرێندراوە لەلایەن خالقێکی مەزنەوە، کە ئەم خالقە نە زەمەن و نە شوێن سنوورداری دەکەن، بەڵکو توانایەکی گشت گیری هەیە[3]. بۆیە باوەڕبوون بەوەی کە خودا زەمەنی بەدیهێناوە شوڕشێکی لە خودی تاکدا بەرپاکرد، چونکە لێرەوە زەمەن بە بێ کۆتایی و چەند خولێکی دووبارە بوەوەی روداوەکان نەمایەوە، بەڵکو بووە یەك ڕەهەندیەکی گشتی بە دوایەکداهاتوو، کە گەڕانەوەی تیایدا نەبوو، بۆیە بوە هێڵێکی ڕاست کە کاروانی مرۆڤایەتی لە چرکەساتی یەکەم هەڵەوە بۆ پەشیماینبووبنەوەی کۆتایی دیاری دەکرد[4].

---

١ گۆڤ اری، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠- ل ١٧٩

٢ گۆڤاری، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ٢٦٩

٣ گۆڤاری، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ٢٧٤

٤ گۆڤاری، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ١٤٦

## - زەمەن لە ئایینی جوولەکەدا:

زەمەن لە روانگەی جوولەکەکان سەرەتا و کۆتایی هەیە. لە تەوراتدا ئەوە دەردەکەوێت کە بە شێوەیەکی گشتی رووداوەکانی مێژوو بە شێوەی زنجیرەیی هەر لە سەرەتای مرۆڤەوە رێکخراوە و سەرجەمی ئەوانەیان بە بوونی خوداوە بەستۆتەوە و ئاماژە بە ئامادەگی بەردەوامی خودا دەکات لە مێژوودا[1].

بەبڕوای جوولەکەکان خودا تەواوی کەرستەکانی مێژووی ئامادەکردوە (مرۆڤ- زەمەن- شوێن). هەر لە تەوراتدا هاتووە کە باوەڕهێنان بەوەی کە خودا ئافرێنەری گەردوونە باوەرێکی سەرەکی جوولەکەبوونە و باوەڕهێنان بەوەی زەمەن بە فەرمانی خودا رەوتی دەگرێتە بەر و خودا خاوەنی ئێستا و هەتا هەتاییە و بەردەوام لە هەموو مێژوودا ئامادەگی هەیە لە زەمەن و لە شوێن و هەر ئەو بزوێنەری رەوتی زەمەنە و ئامانجی خۆی لەم مێژووەدا هەیە[2].

هەندێك لە دەقە ئایینیەکانی ئەواندا ئەوە روون دەبێتەوە کە مێژوو بەردەوام لە پێشکەوتندانیە، بەڵکو مێژوو لە بزواندایە هەندێك جار بەرەو پێش و هەندێك جاریش بەرەو دواوەیە.

## - زەمەن لە ئایینی مەسیحیدا:

لێکدانەوەی ئایینی مەسیحی بۆ مێژوو زۆر لەوەی یەهودی یەوە نزیکە، کە خودا و جووڵەی مێژوو پێکەوە دەبەستێتەوە، کرۆکەکەشی هەر ئەو پرۆسەیەیە کە بە خەلق دەست پێدەکا.

بە یانەوە و لێپێچینەوە کۆتایی دێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ژێر کاریگەری فیکری چەند پیاوێکی ئایینی لێکدانەوەی مەسیحی هەندێك جیاوازی هەیە[3]. لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی زایینیەوە بیروراکانی سان- ئۆگستین (٣٥٢- ٤٣٠) لە بارەی لێکدانەوەی مێژوویی، وەك پیاوێکی ئایینی مەسیحی دەرکەوت، کە یەکەم کەس بوو تیۆری لەبارەی فەلسەفەی مێژوو، لەسەر بنەمای تیۆلۆژیای مەسیحی دانا. ئۆگستین چەند لاپەڕەیەکی کتێبەکەی

---

١ المذاهب الکبري في التاريخ- ج. ويدجيري- ترجمة ذوقان قرقوط- بيروت- ١٩٧٩- ل١٢٠

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ٢٧٥

٣ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ٢٧٦

(دانپێدانا نەکان) بۆ کێشەی (زەمەن) تەرخانکردوە، و دەڵێت: "وادەزانم زەمەن درێژبوونەوەیە، بەڵام درێژبوونەوەی چی؟ نازانم! ئایا درێژبوونەوەی گیانە؟ بە راستی چی پێوانەبکەم کاتێك دەڵێم بۆ نموونە: ئەو کاتە درێژترە لە کاتێکی تر، بە شێوەیەکی گشتی یان تایبەتی، ئەم کاتە دوو ئەوەندەی ئەوی ترە؟ ئەوا من کات دەپێوم، ئەوە دەزانم بەڵام داهاتوو ناپێوم، لەبەرئەوەی هێشتا نەهاتووە و ئێستاش لەبەر ئەوەی وادەی هاتووە، واتە بەش بەش ناکرێت و درێژ ناکرێتەوە، رابردووش لەبەرئەوەی هێشتا ئامادەنییە. جا ئیتر چی پێوانەبکەم ؟ بێگومان ئەوەم گوت ئەوە ئەو کاتە نییە کە بەسەر چووە، بەڵام ئەو کاتەیە کە دەڕوات،واتە پێوانەی کات کرداریە، بەو پێیەی کردارێکە و لە دەمێکدا دەڕوات لەبەر ئەوە زەمەن بوونێکی نییە، تەنها ئەگەر لە دەروونا کاریگەریکی بەردەوامی هەبێت[1]. ئۆگستین سێ رەهەندەکەی (زەمەن) بۆ سێ باری دەرون دەگێڕێتەوە، ئەو بارانەش یادەوەری (رابردوو) و بەئاگابون (ئێستا) وپێشبینیکردنی (داهاتوو)ن، کێ دەتوانێت بڵێت: داهاتوو لە دەروونا نایەت، ئەگەر لە دەروندا پێشبینیکردنی داهاتوو هەبێت؟ بە هەمان شێوە کێ دەتوانێت بڵێت: رابردوو هێشتا ئامادە نییە، لە کاتێکدا یادەوەری یادی رابردووی تێدایە؟ هەروەها کێ دەتوانێت بڵێت: ئێستا شوێنی نییە، لەبەر ئەوەی بە خاڵێکدا تێدەپەڕێت کە شایانی دابەشکردن نییە، ئەگەر بە ئاگابون تێیدا دەڕوات و دەبێتە ئێستا؟ داهاتوو درێژ نییە لەبەر ئەوەی ئامادە نییە، بەڵکو درێژ پێشبینیکردنی داهاتووە، رابردووش درێژ نییە، چونکە ئێستا بوونی نیە، بەڵکو درێژ یادەوەری رابردوە[2]. ئەوەش دوو واتا دەبەخشێت: یەکەمیان زەمەن دانامەزرێت تەنها بە دەروون نەبێت، دووەم زەمەن لە رەهەندگەلێك پێکنەهاتووە کە شایانی دابەشکردن بێت، بەڵکو ماوەیەکی پێکەوە گرێدراوە، بۆیە مۆرکی بنەڕەتی زەمەنیش (ماوە) و(بەردەوامیەتیە) [3]

ئۆسکار کولمان لە کتێبی(مەسیح و زەمەن) جەخت لەوە دەکاتەوە، کە بیرۆکەی ئەبەدی — نازەمەنی- شتێکی نامۆیە لە ئایینی مەسیحیدا و مەسیحیەتی بەرایی بڕوای بە شتێك نییە

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ١٤٧

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ١٤٨

٣ المذاهب الكبري في التاريخ- ج. ويدجيري- ترجمة ذوقان قرقوط — ل١٤٩

چواچێوەی زەمەندا نەبێت، هەروەها بڕوایان وابوو کە خودای ئەبەدی ئەو خودایەیە کە زەمەن لە خۆدەگرێت، زەمەنێك کە بەردەوامە و کۆتایی نایەت[1] .

لە سەدەکانی ناوەراستدا چەند خەسڵەتێکی گرنگ بۆ لێکدانەوەی مێژوو دەرکەوت کە زیاتر تێکەڵەیەك بوون لە فیکری مەسیحی و فیکری یۆنانیدا لەوانە چاودێری یەزدانی (العنایە الهیە)

چاوێری یەزدانی تیۆریایەکی هاوبەشە لە ئایینە ئاسمانیەکاندا و لە بنەمای ئایینی مەسیحیدا هەیە، بەڵام ئۆگستی یەکەم کەس بوو بردیە ناو پرۆسەی لێکدانەوەی مێژوویی، بە پێی ئەم تیۆریایەش پێویستە خودا دەستی لە رەوتی مێژوودا هەبێت بۆئەوەی رێکی بخات، و ئەگەر ئەو رێکخستنەی ئەویش نەبێت ئەوا مێژوو دەبێتە کۆمەڵێکی بیٚ سەرووبەر لە رووداوی بەسەر یەك کەلەکەبوو لە کارەساتی ترسناك، واتا بە پێی ئەم تیۆریایە مێژوو شانۆگەریەکە خودا دایناوە و مرۆڤیش نواندنی دەکەن. بۆیە ئۆگستین لە دیدگایەکی ئایینیەوە دەڕوانێتە مێژوو و دەڵێت خوا بۆ خۆی ئەم سروشتەی ئافراندوە و هەر خۆیشی دەتوانێت چۆنی دەوێت بیگۆڕێت، بەکورتی واتە خودا بڕیار لەسەر داهاتووی مێژوو دەدات. بەمەش مێژوو لای ئۆگستین لە دەوری رووداو کە (مەخلوق)ە و تاهەتایی کە خودا تاهەتاییە و ئافرێنەری زەمەنە، دەخولێتەوە و ناکرێت تاهەتایی لە روانگەی رووداوەوە وەسف بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا خودا لە چوارچێوەی مێژوی مرۆییدا بریتیە لە چاودێری یەزدانی، کاروباری مێژووی سەر زەوی لە دەستی خودا دایە و ئەو چۆنی بوێت بەرێوەی ئەبات، بە هیچ جۆرێك مێژووی لە دەرەوەی یاساکانی چاودێری دانەناوە، هەر بۆیە جیهان لای ئۆگستین تەواو گوناوە و رێکخراوە، بۆیە هەبونی رێکەوت لە رووداوەکانی مێژوو رەتدەکاتەوە. هەروەها هەر لە روانگەی چەمکی چاودێری یەزدانیەوە، بۆچونی بەدوایەکداهاتنی خولەکی لە مێژوودا رەتدەکاتەوە، پێی وایە کە رووداوەکانی مێژوو بە راستەهێلێکدا دەروات و هەر لە خەلقی ئادەمەوە سەرەتای مێژوو تا رۆژی هەڵسانەوە و کۆتایی مێژوو[2]. بە پێی ئەم تێگەیشتنەی مێژوو، کە چاودێری خودایی نەخشەی بۆ کێشاوە، ئەوە مێژوو بەیەك ئاراستەدا دەڕوا و دوایی ئامانجێکی ئەو دیوی مێژووەوە، واتە تەواوی مێژووی مرۆڤایەتی ماوەیەکە لە زەمەن، کە تێیدا نەخشەی خودا

---

١ المذاهب الكبري في التاريخ- ج. ويدجيري- ترجمة ذوقان قرقوط - - ل١٧٢

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ٢٧٧

دەربارەی رزگاربوونی مرۆڤی تێدا بەدی دێت، و گرنگترین بەشەکانی ئەم نەخشەیە بریتیت لە: (بەدیهێنانی یهان، تاوانەکەی ئادەم، لەناوچونی جیهان، زیندوبوونەوە و رۆژی لێپرسینەوە)[1].

ئەم بەشانە واتایەکی خودایی بە مێژوو دەبەخشن، بۆیە مێژووی مرۆڤ لە تێڕوانینی مەسیحیتدا بووەتە مێژووی رزگاربوون. هەروەها لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرەکەوێ، کە مەسیحیەت بەرەو لاهوتی مێژوومان دەبات، لەبەر ئەوەی دەستێوەردانەکانی خواوەند لە مێژوودا بە تایبەتی لەو کاتەی لە کەسایەتی مەسیحی مێژویدا خۆی بەرجەستە دەکات، ئامانجێکی هەیە لە دەرەوەی مێژووی مرۆڤایەتیەوە.

## - زەمەن و رەوتی مێژوو لە روانگەی ئیسلامەوە:

قورئان و فەرموودە و سونەتەکانی پێغەمبەری ئیسلام سەرچاوەی سەرەکی لێکدانەوەی ئەم ئایینەن بۆ زەمەن و رەوتی مێژوو، بە پێی لێکدانەوەی ئیسلام مێژووی مرۆڤ بە گشتی یەکەیەکی پێکەوە بەستراوە کە لە خەڵقی مرۆڤەوە دەست پێدەکات و بە رۆژی هەڵسانەوە (قیامەت) کۆتایی دێت، ئەم ماوەیەش بە چەند وێستە و قۆناغێکدا تێپەڕدەبێت.

تێڕوانینی ئەم ئایینە بۆ مێژوو تێڕوانینێکی یەکتایانەیە، واتە لە خودای گەورە زیاتر خوداوەندی تر نییە، لە روانگەی ئەم ئایینەوە خودا چەقی مێژووە و ئافرێنەریەتی و ئامادەگی بەردەوامی هەیە لە مێژوودا و هەر ئەمیش ئایندە و کۆتاییەکەی دیار دەکات، هەروەك لە قورئاندا هاتووە: " وخلق كل شيء فقدره تقدرا" واتە هەموو شتێکی خولقاندوە و ئایندەکەی دیاریکردوە، بەم جۆرە لەم ئایینەدا وەك ئایینە ئاسمانیەکانی تر ئیرادەی خودا تەوەری گشتی و رەهایە لە ژیاندا. هاوکات خودا تاهەتاییە و ئەزەلیە و لە هەموو شوێنێکدا بوونی هەیە و لەسەرجەمی جووڵەی مێژوو و کارو کرداری مرۆڤ لەسەر زەوی ئاگادارە هەر لەسەرەتای خەڵقەوە تا کۆتایی ژیان و هەمووی بە ویست و ئیرادەی ئەو بەڕێوەدەچن، کە دەڵێت: " ان الله خالق كل شيء و على كل شيء وكيل" هەروەا ەڵێت: " له ملك السماوات والاً رص و الى الله ترجع الامور" . گرنگترین و بەرچاوترین دەستێوەردانی خودا لە کاروباری مرۆڤەکاندا لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامدا، لە شەڕی (بەدر)دا بوو، کە سورەتی "ئەنفال" لەم بارەیەوە نازل بووە.

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ١٥٠

له ئاییینی ئیسلامیدا وایە کە خودا هەر سێ ڕەگەزەکەی مێژووی ڕەخساندووە (مرۆڤ، زەمەن، شوێن) کە زەمەن و شوێن بەر لە مرۆڤ خولقێنراون، مرۆڤایەتیش بە ئادەم و حەوا دەستپێدەکات و ئیدی بەمەش ڕەوتی مێژوو لە ژێر چاودێری خودا دەست پێدەکات و هەر خوداش زەمینەسازی بەردەوامی مێژوو دەکات[1]. قورئان ڕووداوەکان بە شێوەی چیرۆکی بێ مێژوو دەگێڕێتەوە و پێغەمبەرەکان ڕیز دەکات یەك لە دوای یەك.

مێژوو لە ناو قورئاندا یەکەیەکی زەمەنی نییە و ئەو دیوارەش دەڕوخێنێ کە دەکەوێتە نێوان ڕابردو و ئێستا و داهاتوو، هەروەها قورئان لە زۆر شوێندا ڕایدەگەیەنێ کە ساڵنامەکەی لە مێژوودا جێگیرەو و ڕابردووە بەرامبەر ئەو کۆمەڵە بە شەرانەی کەلە سەر ڕێگادا وەستاون. قورئان بۆ ئەوەی ڕووداوەکان والێ بکات کە خەڵکان باوەڕی پێبکەن کە بە ڕاستی ئەم چیرۆکانە ڕوویانداوە، بەدەست پاکیەوە بۆ خەڵکان چیرۆکەکان دەگێڕنەوە.

ڕاڤەی قورئان بۆ مێژوو لە دیدی خوداوەیە و لە سێ بۆچوونی زەمەنیدا دیاریان دەکات، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، هەروەها بۆچوونی چوارەم ئەوەیە کە خوا دەچێتە ناو قوڵی دەروونەوە کە توخمی پێکهاتەی دروست دەکات و بزاوتی هەمیشەیی لە بووندا دەپێکێ، ئەمەش وا لە بزوتنەوەی مێژوو دەکات کە ڕەهەندێکی ڕاستی پێبدات، ئەمەش بۆچونی خودی خودایە کە هەموو شتێکی بە زانستی خۆی داناوە، لێرەدا مێژوو لە قورئاندا یەکەیەکی زەمەنی لە دەروندا درووست دەکات و پێکهاتەکەی دەپێکێ، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو،کە ئەم سێ زەمەنە یەك دەگرن و یەك چارەنوسیشیان دەبێت، تەنانەت زەمەنی زەوی و زەمەنی ئاسمانیش چیرۆکی دروستبوون و ڕۆژی حیساب هەموویان لە خاڵی ئێستادا لە قورئاندا یەکدەگرن کە یەك بزاوت دەردەخات کە پانتایی لە گەردووندا لە ڕۆژی دروستکردنی ئاسمان و زەویەوە کە خودا خۆی دروستی کردوون دەچێت بۆ ڕۆژی حیساب. ڕۆژی حیساب دوارۆژ پیشاندەدا کە کردەوەکانی مرۆڤ لە جیهاندا دیاردەخات کە وەك چارەنوسێکی کۆتایی وایە بۆ کۆی کردەوەکانی[2].

هەر بزاوتێکی مێژوویی ئامانجی ئەوەیە ئەو پەیوەندیەی لە نێوان خودا و مرۆڤ و سروشتدا بە زەمەنیشەوە هەر توخمێك لەوانە پشت گوێ بخرێ ئەوا بە نەزانیین دادەنرێ بۆ پێگە ڕاستیەکانی بزاوتی مێژوو.

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ٢٧٩

٢ گۆڤاری دیدگا، ژمارە- ١، سالی، ٢٠٠٠- سلێمانی، ل٨٤

خودا قورئان دەکاتە نێو سوڕی هەمیشەیی مێژووەوە و ئیماندارەکەی فڕێدەداتە دەرەوەی مێژوو و بە ڕێبوار (عابر) دەیناسێنێ و سەیریان دەکات. لە قورئاندا خوا ڕەهایە و نەگۆڕە، پەیوەندی بە ژیان گۆڕان و پێشکەوتن و دواکەوتن نییە (کل شیء هالك الا وجهه) ڕاڤەیانی ئیسلام مێژوو بە لەدایکبووی قورئان دەزانن و قورئانیش جولێنەریەتی، واتە ئەو قورئانەی نەگۆڕە دەبێتە گۆڕینی مێژوو و لە هەمان کاتدا جوولاندنی مێژوو.

خودا بە هۆی سونەتە (نوامیس) ەکانیەوە خۆی دەکاتە بزاوتێکی مێژوو و مێژوویەکی کۆن لە شێوەی چیرۆکدا دروست دەکات و دەیدا بە گوێی ئەوانەی ئیمانی پێ ناهێنن[1]. خەلکان لە دەرەوەی مێژوون و عەقلیان ڕاوەستاوە و کارناکات چونکە خودا بزاوتەکانە نەك مرۆڤ. واتە مرۆڤ ڕۆڵی پێنەدراوە بۆ گۆڕین و پێشکەوتن. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ئایینەکاندا زیاتر گرنگی بە دەرخستنی ڕۆڵی خودا لە ژیانی مرۆڤدا دراوە، واتە ئەو کردارانەی کە تۆمارکراون لەلایەن هەوڵەکانی مرۆڤەوە نەبوون، بەڵکو لەلایەن کرداری خوداوە بووە. بەم شێوەیە ڕێکخستنی دەسەڵاتەکان بە شێوەیەکی هەرەمی بوو، لە خوا و ئاسمانەوە بۆ پەیامبەرەکان و و لەوانیشەوە بۆ تێکڕای فەرمانبەرەکان دادەبەزی، لێرەدا مرۆڤەکان هەموو شتێکیان بۆ خودا دەگەڕاندەوە، لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانە تا ویستەکان و هەڵسەنگاندنی جەنگەکان[2].

ئەمەش ڕەتکردنەوەی مێژووی یەکەمە و دروستکردنی مێژووی غەیبە کە دەقی ئایین دەیدا بە خۆی و دەیکا بە بەرگی خۆیدا. لۆژیکی کاکڵی ئیسلام بۆ مێژوو خودایە، واتە ئەو دروستکەری مێژووە کە خۆی لە ئێستادا دەبینێتەوە کە خۆشی کۆتایی مێژوویی دیارکردوە، بەمەش ئیرادەی خوا ناوەندی زەمەنی گشتی ڕەهایە و (کۆتایی) و (ناکۆتایی) بە فەرمانی ئەو دیاردەکرێت، ئەو خودایەش کە هەموو گەردوونە و هەموو شتێ دەزانێ و هەمیشە نەمروو و زیندووە و لە هەموو کات و شوێنێکدا هەیە. هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان مێژوو بە ڕابردوو وئێستا وەسف دەکات تا پاشەڕۆژی بۆ بێتەدی لە پێشبینینە مێژوویەکاندا کە سنووردارە بە زانستی خودا و وهزری (غەیب) کە لە ژیانی دونیادا بە سیفەتی مێژوویی وەختی دێت و دەڕوات، بەڵام مانەوە بۆ ژیانەکەی تری هەتاهەتایی یە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە غەیبکردنی مێژووە، کە پێگەی مێژووی ڕاستی زەمەنێکی دیاری کراوی لێ دەستێنێتەوە و ڕۆڵی مرۆڤ

---

١ گۆڤاری دیدگا، ژمارە- ١، سالی، ٢٠٠٠- سلێمانی، ل٨٥

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ - ل ١٢٢

دەکوژێ لە ڕووداوەکاندا و لە پەرەسەندنی مێژوو، واتە لەسەر زەوی ژیانی لێ دەستێنێتەوە و لە غەیبدا دەیداتێ و مێژووی پێشکەش دەکات. مێژوو لەسەر زەمەنێکی واقیع و دوور لە خەیاڵ دروست دەبێت نەك لەسەر پێگەی غەیب، هەروەها ڕەورەوەی مرۆڤیش بۆ هەڵبژاردنەکان لە مێژوودا لە چوارچێوەی دروستکەرەکەی ناچێتەدەر، لێرەدا روون دەبێتەوە کە ئامانجی کۆتایی بۆ بزوتنەوەی مێژوو دنیایی نییە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەڵکو لە داهاتوودایە، کە ژیانی (الاخرە) و (الابدیە) چاوەڕوانی مرۆڤ دەکات[١].

زۆربەی میللەتان دیدو بۆچوونی تایبەتی و جیاوازیان سەبارەت بە زەمەنی ئەبەدی و بێ کۆتایی هەبووە و ئەم بۆچوونانەش لە باوەڕ و کولتووری میللەتەکەدا ڕەنگی داوەتەوە،بۆ نموونە لای میللەتانی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بیرۆکەی (شای پیرۆز)باو و بڵاوبووە،کەوا پێویست دەکات ئەم شایە هەمیشە گەنج و چالاك بێت،دەنا لەناو دەچێت .لە ناو گەلە ئیسلامییەکانیشدا بیرۆکەی زەمەنی بێ کۆتایی خۆی لە کەسایەتی (خدری زیندە) دا بەرجەستە دەکات،بیرۆکەی (خدری زیندە) ش لە ناخ و باوەڕی میللی ئەو گەلانەدا چەسپاوە و جیگیر بووە.(خدری زیندە=خضرالحی) گوایە ئاوی نەمری خواردۆتەوە و ئێستا بە پێی باوەڕی میللی و ڕەشە خەڵك،بەردەوام بە دنیا دا دەسوڕێتەوە و یارمەتی کەسانی هەژارو لێقەوماو دەدات.هەندێك لێ کۆڵەرەوە ڕیشەی (خدری زیندە) دەبەنەوە سەر ئەفسانەی (تەمووز)ی سوومەری،بەپێی ئەفسانەکە پاش ئەوەی تەمووز دەکوژرێت و دەچێتە (جیهانی ژێرەوە) عەشتار بەدوای دا دەچێت و دەیهێنێتەوە سەر دنیا، هێنانەوە کەی بە کژەلهەر ساڵەی شەش مانگ لە جیهانی ژێرەوە دەبێ و شەش مانگیش دەگەڕێتەوە سەر زەوی و ئەو شەش مانگەی دێتەوە سەر زەوی، زەوی سەوزو تەڕ دەبێ.

ئەم هاتنەوەی تەموزو (سەوز-خضر) بوونەوەی زەوی، زۆر لەو سیفەتەی (خدری زیندە) دەچێ، کە بەپێی وەسفە ئاینیەکە دەڵێن:لە هەر شوێنێکی وشك و بێ گیا دانیشتبێ،کە هەڵساوە ئەو جێگایە سەوز بووە،ئەوەی کە پێك دەپێ و لێکیان نزیك دەکاتەوە،سەوز بوونی ئەو زەوییە پاش هاتنی تەمووز و دانیشتنی (خدر —خضر)[٢].

فریزەر دەڵێت: تەمووز باوەری مردن و ڕابوون یان لە ناوچوون و زیندوبوونەوەی ساڵانەی ژیانی بەر جەستە کردووە بەتایبەتی ژیانی ڕووەك،واتە پووختەی ئەو باوەڕەلە و گۆڕانکاریەی

---

١ گۆڤاری دیدگا، ژمارە- ١، سالی، ٢٠٠٠- سلێمانی، ل٨٢

٢ گەران بە دوای نەمرییدا- مولود ئیبراهیم حسن- هەولیر- ٢٠٠٢- ل ١٥٤

کەوا بەشێوەیەکی دەوری کەوا بەسەر گۆی زەوی تێدەپەڕی، خۆی دەنوێنێ .سۆمەریەکان وایان دەزانی کەوا گەشی ڕووەکەکان و سیسبوونیان پێویستە جارێکی دیکە خواوەند تەمووز هەڵستێتەوە تاوەکو ڕێکخستنی خولی ژیان دەستە بەر بکات.چیرۆکی (خچر) لە قورئان لە (سورە کهف)دا لە ئایەتی (٦٠-٨٢) باسکراوە کە لێرەدا خودا بە ـ عبدا من عبادنا-باسی (خچر) دەکات و هەروەك لە کردارو سیفەتەکانی (خچر) دا دەردەکەوێت کە تواناو هێزێکی ناسروشتی هەیەو کرداری وا ئەنجامدەدات،کە لە سروشتی مرۆڤی ئاسایی دوورەو لە سروشتی خواوەندەکان نزیك دەبێتەوە،لەبەر ئەوەی زیندووەو نەمرەو شتی نادیارو غەیب دەزانێت[1].

لە کولتووری ئیسلامیدا گەلێك حیکایەت و بەسەرهات هەن باسی (خدری زیندە) دەکەن و ڕۆڵی پیشاندەدەن لە ژیانی هەندێك کەسایەتی ناودار وەك ئەسکەندەری (ژولقەرنین).ناوەڕۆکی بەسەرهاتەکە ئەوە دەردەخات کە قەدەرو چارەنووسی مرۆڤ مردن و نەمانە،بەڵام (خچر) بە زیندوویی دەمێنێتەوە،چونکە ئاوی ژیانی خواردووەتەوە .تاکو ئێستاش ڕۆڵ و کاریگەری کەسایەتی (خدر) لە ناخی گەلە موسڵمانەکاندا ماوەتەوەو بووەتە بەرجەستە بوونی زەمەنی ئەبەدی،کە خولەکانی ژیان نوێ دەکاتەوە و کۆتایی نایەت و هەبوونێکی ئەبەدی هەیە،هەروەها نەبوونی زانیاری لە مەڕ ساڵ و شوێنی لە دایك بوونی (خضر) زیاتر (خضر)ی پیرۆزو ئەفسانەیی کردووە[2].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هزری کۆن و مرۆڤی میللی هەمیشە هیوا خوازی ئەوە بووە نەمری بەدەست بێنێت و بەسەر مەرگدا زاڵ بێت.

واتە لە ئاینی ئیسلامدا سەرلەبەری جووڵەی مێژوو کاتیە و تەنها ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنی تاهەتایی لەو دنیادا، واتە ئامانجی کۆتایی لە مێژوو ژیانی ئەو دنیایە کە چاوەڕوانی مرۆڤ دەکات.

دینە ئاسمانیەکان ویستویانە کۆتایی بە مێژوو بهێنن و دەستەمۆی کەن بۆ خۆیان ئەویش بە مەبەستی کۆنترۆڵ کردنی دەروونی مرۆڤ. مێژوو دەبووە مێژووی دوارۆژ، دەبوایە ئەمڕۆی لەیادکرابایە لە پێناو مێژووی پیرۆزی ئایندەدا.

---

١ الانسان و الزمن في التراث الشعبي- مجلة، عالم الفكر- المجلد السادس- العدد الرابع- الكويت- ١٩٧٨- ل١٩٢

٢ گەران بە دوای نەمرییدا- ل ١٦٥

# بەشی پێنجەم

## (زەمەن لە هزرو دید و بۆچونی فەیلەسوفاندا)

## باسی یەکەم

### زەمەن لە روانگەی بیرمەند و فەیلەسوفانی شارستانیەتی ئیسلام:

لەم باسەدا روانین و هەڵوێستی بیرمەند و زانایانی ئیسلام سەبارەت بە چەمك وحەقیقەتی زەمەن دەخەینەروو، فەیلەسوفەکان و زانایانی کەلام لەسەر ماهیەتی جووڵە و زەمەن و ماوە، دید و بۆچوونی جیاوازیان هەیە، بە گوێرەی زانایانی کەلام، جوووڵە بریتیە لە وردە تەکانی یەك لە دوای یەکی چرکەساتەکانی پێکەوە بەستراوی زەمەن، هەریەك لەو چرکە ساتانە کە توانای دابەشبوونی تیانییە[1]. لەو پێناسەیەدا دەردەکەوێ کە زەمەن بەچەند چرکەساتێکی یەك لەدوایەکی پێکەوە بەستراو پێکهاتووە کە هەر ئەو چرکە ساتانە قابیلی دابەشبونیان تیانەبێ. هەروەها لە ناسینی جووڵە و زەمەنەوە ماهیەتی (ماوە- مسافە))شمان بۆ دەردەکەوێ کە هەرسێکیان هاوجۆرن و پربەیەکن، لەهەر یەکێکیاندا ئەوە ساغبۆتەوە کە حەقیقەتەکەی ئاوێتەیە لەچەند بەشێکی دابەشنەکراو پێکهاتووە. کەواتە چەمکی زەمەن وچەمکی جووڵە

---

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت)- نووسینی حەمەکەریم هەورامی، بەرگی دووەم- هەولێر، ٢٠١٠ –ل ١٥٤

هاوجووتن و لەیەك دانابڕێن، چونکە زەمەن: بڕی ئەو جوولەیە کە سەبارەت بە دوو شتی دوور ونزیك دەردەکەوێ، ئەو چەند دووره ئەمە نزیکە،کەواتە زەمەن پێوەرە بۆ پێواندنی جوولە، زەمەن بێ جوولە وێناناکرێ. هەروەها جوولەش بوونی شتی جولاوە لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە، کە لە پێشەوە لەو دۆخەدا نەبوبێ، واتە تەنیا جوولاو لە هەر ساتێکدا دۆخێکی هەیە، کەبەر لەو ساتە ئەو دۆخەی نەبووە[1].

لە خالّی دابەشبوونی وردە پێکهاتەکانی (جوولە، زەمەن، ماوە) بۆچونی جیاواز هەیە، لەبەر ئەوی جوولە لە خۆیدا شتێکی هەبووە و حەقیقەتەکەی لە حەقیقەتی لە حالّەتی وەستانیدا جیایە. ئەو جوولە لە حالّەتی جوولە و بزاوتندا شتێکی بۆ دێتەدی کە بوونی بەشەکانیەتی، ئەو شتەی کە بۆی دێتە دی لە ئێستادایە یان لە رابردوو و داهاتوودایە، خۆ رابردوو لە کاتی خۆیدا وەکو ئێستا بووە، داهاتووش ئەو زەمەنەیە کە لەکاتی خۆیدا چاوەڕوان دەکرێ، ئەگەر نەکرێ شتێك بۆ جووولە و بەشەکانی لە کاتی بوونیدا رووبدا، ناکرێ ئەو شتە لە رابردوو وداهاتووش رووبدات[2].

کەواتە جوولە لە سەرەتایەوە تا بنەتای (ماوە) یەك دروستدەکات، وەنەبێ ئەو ماوەیە شتێکی نەختی بینراو بێ ئەوەی کە دیاربێ بەشی ناوەراستەکەیەتی کە بونیەتی لە (ئێستا- هەنووکە)دا، بەلاّم رابردوو و رانەبردووی پێش و پاشیدا هەردووکیان لە حوکمی نەبوون دان، مایەوە ئێستاکەی کە ئەویش بوونیەتی لە هەنووکەدا، ئەویش یان ماوەدارە یان ماوەدار نییە، لە حالّەتی یەکەمدا هەمدیسان بونی دەرەکی نییە، کەوابوو ئەوەی لێی مایەوە حالّەتی دووەمە کە ماوەدار نییە ئەویش قبولّی دابەشبوون ناکات[3]. هەمووومان دەزانیین کە (هەنووکە- ئێستا) هەیە و نکۆڵی لێ ناکرێ، گریمان نەبوو خۆنابێ بە رابردوو وداهاتووی بدەینە قەلەم، چونکە هەنووك کۆتایی رابردووە و سەرەتای داهاتوو، جا ئەگەر وادابنێین هەبوونی نەبێ ئەو کات دەبێ یان رابردوو بێ یان رانەبردوو، ئەوەش دیارە کە رابردوو خۆی نابێت بە کۆتایی بۆ خۆی، داهاتووش نابێ بە کۆتایی رابردوو، کە ئەوەمان بۆ رونبۆوە، ئەوجا دادەنێین ئەو هەنووکەیە دەبێ بە دووبەشەوە. یان ئەمەیە یەکێك لەو بەشانە پێشی ئەویتریان

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت) ـ ل٢٤٠

٢ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت- ل١٥٦

٣ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت ـ ل١٥٩

دەکەویٚ یان قەدەغەیە پێشی بکەویٚ: بەشی یەکەم نابیٚ، چونکە بەشێکی بەر بەشەکەی تری بێتە ئاراوە، وای لێدیٚ بەشی یەکەم هاتبێتە دی کەچی هێشتا بەشی دووەم دیار نییە، کە دووەمیش دێتەدی ئەوکات بەشی یەکەم رۆیشتووە و نەماوە، ئەمەش وای لێدیٚ بووتریٚ: (هەنووکە- ئێستا) نەبیٚ، خۆ ئەوەش ناکریٚ وابوترێو کەواتە ئەو جۆرە زەمەنە قبوڵی دابەشبون ناکات[1].

کەواتە ئەو هەنووکەیە کەرت ناکرێت و نابیٚ بکریٚ بە دووبەشەوە. دەکریٚ بڵێین کە هەر ساتیٚ لەو ساتانە لە ناوچوو دەبیٚ ساتێکی تر بێتە پێشەوە و جێگەی بگرێتەوە، خۆ ئەگەر نەیەت جێگەی بگرێتەوە، ئەو کات دبڕان و پچڕان لەناو زجیرەی زەمەندا روودەدات.

ئەوساتانە لەو هەنوکەدا دەبنە یاگەی تەکانەکانی جووڵە و یەك لەدوای یەك دێن و گوزەر دەکەن، کەوابیٚ پێویستە ئێمە بڕوا بە: یەك لە دوا یەکی چرکەساتەکانی زەمەن بکەین، هەروەها دەبیٚ ئەوەش لەبیرنەکەین کە هەر چرکە ساتێکی هەنووکە لەناوچرکەساتی دوای خۆیدا دەتوێتەوە وپێیەوە دەلکیٚ.

بۆ سەلماندنی یەك لەدوای یەکی چرکەساتەکانی زەمەنە. ئایا زەمەن لکاوە یان نەلکاوە؟

جاریٚ بوونی زەمەن بەچەندێکی پێکەوەلکاو نابیٚ، چونکە زەمەن جگە لە رابردوو و رانەبردوو هیچ مانایەکی دیکە نابەخشیٚ. رابردوو و رانەبردوو هەردووکیان لەچاو حاڵی حازردا بونیان نییە، هەنووکە یاگەی هاوبەشی هەردووکیانە، چونکە کۆتایی رابردووە و سەرەتای رانەبردووە، ئەگەر زەمەن لکاو بوایە دەبوایە ئەو هەنووکە دوونەبوون بە بونێك ببەستێتەوە، ئەمەش شتێکی ئەستەمە، کەواتە دەرکەوت کە زەمەن چەندێکی نەلکاوە لە چەندین چرکەی یەك لەدوای یەك پێکهاتووە. لێرەدا بۆ زانایانی کەلام دەرکەوت کە (جووڵە، زەمەن، ماوە) هەرسێکیان هاوئموونەن و قبوڵی دابەشبوون ناکەن، بەڵام بەلای فەیلەسوفانەوە قبوڵ دەکەن، هەروەها (ماوە- مسافە)ش وەکو جووڵە و زەمەن وهایە و لێیان جیانابێتەوە و لە چەندین خاڵی ورد پێکهاتووە کە قبوڵی دابەشبوون ناکەن[2]. بەوەدا دەردەکەوێت ئەو بەشە وردیلانەی زەمەن هاوتان و قبوڵی دابەشبوون ناکەن.

زانایانی کەلام نکۆڵیان لە زەمەن کردوە، لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

---

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل ١٦٢

٢ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل ١٦٤

یەکەم: ئەگەر زەمەن هەبێ و چەند بەشێکی هەبێ بە زەروری، هەندێکی پێش هەندێکی دەکەوێ، ئەم پێشکەوتنەش هەر لە زەمەندا دەبێ و لە دەرەوەی زەمەندا نابێ، ئەمە دەبێتە زنجیرە چونکە زەمەنەکەی تریش زەمەنی دەوێ، واتەئەگەر زەمەن هەبێ دەبێ هەندێ لە بەشەکانی بەر لە هەندێکی تریان بن، دیارە زەمەن ئەگەر بەو پێیە بێ فرە لایەن نییە تا بەشی هەبێ و پێکەوە خڕببنەوە، ئەو کات بوترێ ئەوەی ئەوڕۆ روویداوە لە سەردەمی تۆفانی نوحدا روویدابوو، یان بە پێچەوانەوە، بەڵکو ئەگەر زەمەن هەبێ دەبێ وەها هاتبێ کە هەندێ بەشی پاش هەندێکی تری هاتبێ کە زەمەنی پێ بژمێردرێ، ئیدی لەم حاڵەتەدا قەدەغە ئەوەی دواکەوتووە پێشبکەوێ، ئەو کات هەبوونی هەر بەشێکی زەمەنی خۆی هەیە، کەوابێ لەم حاڵەتەدا زنجیرە روونادات.

دووەم: زەمەن یان رابردوو یان ئایندەیە یان هەنوکەیە، جارێ یەکەم ودووەم بونیان نییە لە رابردوو و هاتوودا فەوتاوە، بۆ ئاینددەش بەرەو بوون دێت هێشتا نەهاتووە، بۆ سێیەمینیش یان ئەمەیە قبوڵی دابەش بون دەکات کە ئەمە دەست نادات و مەحاڵە کە بەشەکانی بە یەکەوە لە بوندا خڕببنەوە قبوڵی دابەش بون بکەن، ئەگەر وابێ دەبێ زەمەن لە چەن چرکەساتێکی یەك لەدوای یەك پێکنەهاتبێ. هەر حاڵەتێك لە زەمەندا هەبێ جووڵەش دەگرێتەوە کە جووڵەی گرتەوە مەوداش دەگرێتەوە، جا ئەگەر ئەوە راست بێ دەبێ جووڵە هەبوونی نەبێ، چونکە جووڵە بەستراوە بە بزوتنی زەمەنەوە[١]. گوتمان رابردوو و ئاینده بونیان نییە، نەبونیش لە هەنوکەدا ئەویە قبوڵی دابەش بوون ناکات، ئەگەر بکات وای لێ دێت هەر بەشێکی قبوڵی پارەبوون و لەیەك پچڕان نەکات، کەچی جووڵە لە حەقیقەتی خۆیدا بزاوتنێکە لە سەرەتایەوە تا بنەتای لە زەمەندایە، لە رابردوو و ئایندەدا نەبێ تووشی گرفتی گومان تێکەوتنی زەمەن دەبێ، زەمەنیش لە خودی خۆیدا دابەش دەبێ، ئیدی بەمە تووشی ئەدم کێشە نابین کە دەڵێ: رووداوی سەردەمی نوح دەبێتە رووداوی ئەمڕۆ!

سێیەم: ئەگەر زەمەن هەبێ نەبوونی پاش بوونی قەدەغەیە، ئەم لەپاش بوونە خۆی لەخۆیدا شتێکی زەمەنییە، چونکە پێش بوون و پاش بون لە تەك یەکدا خڕنابنەوەو ئەو پێش و پاشە لە نێوان بەشەکانی لە جۆری پێش و پاشی بەشەکانی زەمەن نییەو بۆ ئەوەی نەوترێ ئەوە لە

---

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل ٢٤٩- هـەروەها بڕوانـە، الزمـان فی الفکـر الـدینی و الفلسفی، ل ١٨١

خودی زەمەنەوە وایە، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا، خۆ ئەگەر بوترێ نەمانی زەمەن قەدەغەیە، ئەو کات وەکو زەرووری (واجب الوجود)ی لێ بێ، دیارە ئەمە ئەستەمە ونابێ، چونکە زەمەن پێکهاتەیە و قبوڵی دابەشبوونیش دەکات و بەشەکانیشی بە ئەستەم و لەسەرخۆ لەناودەچن کەچی زەرووری وانییە[1].

- ئەگەر بوترێ (بوون) گشتییە و نەمانی لە هەر سێ بەشەکەیدا، رابردوو و داهاتوو و هەنووکە،گلێربووەتەوە، بێگومان گشت لەناو بەشەکانیدایە، کەواتە نەمانی لەواندا نەمانییەتی لە گشتەکەیدا. ئەمەش وتراوە کە زەمەن تەنیا لە ناو ئەەم سێ شتەدا وێنادەکرێ: رابردوو و داهاتوو و هەنووکە، بە تایبەتی لە رابردوو و داهاتوودا، چونکە هەنووکە بەشێکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو ناوبڕێکی هاوبەشە لە نێوان رابردوو و داهاتوودا[2]. ئەگەر زەمەنی هەنووکە –ئێستا- دابەشنەکرێ، خۆ بەشەکانی دیکەی زەمەن بە تایبەتی رابردوو و لە کاتی خۆیدا ماوەیەك ئامادەبوونی هەبووە، کەچی زانیمان زەمەنی هەنووکەیی دابەش نابێ، ئیبن سینا پێیوایە، پەیوەندی نێوان هەنووك و زەمەن، وەك پەیوەندی نێوان خاڵ و هێل وایە، وەك چۆن خاڵ(پنت) بنەما و کۆتایی هەردووبەشی هێلە، بە هەمان شێوە هەنوك بنەماو کۆتایی رابردوو و ئایندەیە، واتە چەمکی هەنووك رۆڵی بە یەکگەیاندنی هەیە لە زەمەندا هەیە نەك رۆڵی جیاکەرەوە[3]. با دابنێین، هەنوکە لە چەند ووردە هەنووچکەیەك پێکدێت، کە یان قبوڵی دابەشبوون دەکات یان نایکات، ئەگەر قبوڵی کرد یان ئەوەیە هەموو بەشەکانی بەیەکەوەن، یان ئەمەیە بەشەکانی یەك لە دوای یەکن، ئەو کات وای لێ دێ کاتە ووردیلە هەنوکەیەکان هەندێکیان ئامادەبن و هەندێکیان دوابکەون، ئەوەش نابێ، کەواتە هەنووکە کەلە چەندین هەنووچکە پێکهاتبێ، ئیدی نابێ قبوڵی دابەش بوون بکات[4].

لەمەوە دەرکەوت بەشەکانی زەمەن کە لە چرکەسات پێکهاتوون نابێ دابەشبکرێن، کەواتە

---

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل٢٥٢

٢ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل٢٥٠

٣ مسقبل الفلسفه العربیه- د. خلیل احمد خلیل، بیروت- سنه، ١٩٨١ — ل٢١٥

٤ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل ٢٥١- هەروەها بڕوانە، الزمان فی الفکر الدینی و الفلسفی، ل ١٨٢

- **زەمەن بەشێوەیەكی ڕەها هەیە.**

تا ئێرە ئەو كارەی كە كردوومانە بریتیە لە دیاریكردنی هەڵوێستی زانایانی كەلام لە زەمەن و مانای زەمەن، دواتریش دیاریكردنی مانای چۆنایەتی لە ناو ساتە جیاوازەكانی زەمەنداو پەیوەندی چۆنایەتیە بەسەر چووەكان و شێوەی ئامادەبونیان لە ناو چۆنایەتی ئێستادا. بەكورتی هەوڵمانداوە ئەوە نیشانبدەین كە زەمەن لای زانایانی ئیسلام لە ڕاستیدا گۆڕانی حالەتەكانە، هەر شتێكیش كە لە زەمەنێكەوە بەرەو زەمەنێكی دیكە دەكشێت مانای دەگۆڕدرێت و شوێنیشی لە سیستمی ڕوانین و بیركردنەوەدا دەگۆڕێت.

پێویستە لێرەدا ڕوانین و هەڵوێستی زانایانی ئیسلام سەبارەت بە حەقیقەتی زەمەن بخەینەڕوو.

لەگەڵ ئەوەی كە دید و بۆچونێك سەبارەت بە بیرۆكە و حەقیقەتی زەمەن لای مرۆڤ هەیە، بەڵام كاتێك مرۆڤ دەیەوێت ئەم بیرۆكەیە شیبكاتەوە و باس بكات، ئەوا بیرۆكەكە ئاڵۆز و نارۆشن دەبێت، بۆیە حەقیقەتی زەمەن چەند لێی بكۆڵینەوە هەر بە تەواوەتی ناتوانیین دەركی پێبكەین و لە هزری مرۆڤ دوور دەكەوێتەوە، بۆیە فەیلەسوفەكان و زانایانی كەلام سەبارەت بە حەقیقەتی زەمەن ڕای جیاوازیان هەبووە و هەیە، هەریەك لەوان بیروبۆچوونی خۆی لەو بابەتەدا هەیە. ئیمامی غەزالی بەم جۆرە پێناسەی زەمەنی كردوە: (زەمەن میقداری جووڵەیە، بە پێش و پاش وەسفدەكرێ)[1]. (كیندی) فەیلەسوفیش بەم جۆرەی ناساندوە: زەمەن ماوەیەكە بە جووڵە ئەژمار دەكرێ و بەشەكانی جێگیرنین) (خوارزمی)یش لە كتێبی "مفتاح العاوم" دا دەڵێ: (زەمەن ماوەیەكە جووڵە ئەژماری دەكرات، وەكو جووڵەی ڕەوشت و ئەو شتانەی كە جوولەی تیایە)[2] ئیبن سینا سەبارەت بەم بابەتە دەڵێ: (زەمەن بێ جووڵە وێناناكرێت، كە هەست بە جووڵە ناكرێ هەستیش بە زەمەن ناكرێ، زەمەن میقداری جووڵەیە، ئەم میقدارە نەمیقداری تەنە، نەمیقداری ماوەیە، ئەگەر میقداری ماوە بوایە هەڵبەتە یەك ڕەوشتیان دەبوو[3].

١ زانستی كەلام (فەلسەفە- واچەكان- لاهووت — ل ٢٥٧-
٢ زانستی كەلام (فەلسەفە- واچەكان- لاهووت — ل ٢٥٨
٣ الزمان في الفكر الديني و الفلسفي، ل ١٨٣

زەمەن داهات (حادث)ێك نییە، بەڵكو داهاتێكی فەراهەم هێنراوە. ئەگەر سەرەتایەكی زەمەنی بۆ داهاتی هەبێ، دەبوو داهاتی دوای ئەو بێ كە نەبووە، واتە دوای زەمەنێكی پێشكەوتەی هاتبێ، هەر شتێ نابێتە سەرەتای پێشی، هەر شتێ سەرەتای پێشی نەبێ، نابێتە سەرەتای هەموو زەمەن. كەواتە زەمەن لە رووی سەرەتاوە و بنەتاوە میقداری جووڵەی بازنەییە. ئەو شتانەی لە تەك زەمەندا بن لەو دان، و ئەو شتانەی لەودان دەكرێن بە سێ بەشەوە: ١- بەشەكانی زەمەن خۆی: رابردوو و داهاتوو، قەراغی هەردووكیان كە چركە ساتەكانە. ٢- جووڵەكان. ٣- ئەو جولڕاوانەی كە لەناو جووڵەدان، لەبەر ئەوەی جولڕاوەكان لە ناو جووڵەدان، جوولەش لە زەمەن دایە، كەواتە جوولڕاوەكان لە ناو زەمەندان.

بوونی چركە ساتەكان لەناو زەمەندا وەكو بوونی (یەكە) وایە لە ناو ژمارەدا یان وەكو ئەمانە وەهایە: بوونی رابردوو وداهاتوو لە زەمەندا، بوونی بەشەكانی هەژماردەیە لە ناو ژمارەدا، بوونی شتە جوولڕاوەكان لە ناو زەمەندا بونی شتە ژمێردراوەكانە لە ژمارەدا[1].

بوونی شت لە زەمەندا دەشێ ئەو شتە دیار و ناسیاو بێ، رۆخێك لەو زەمەنی پڕكردبێتەوە، چونكە ئەو شتە ناكرێ دوور لە زەمەن بێتە دی،دیارە ئەو هاتنەدیەش لەپڕنابێ، بەڵكو بە شێوەی پلیكاندن دەبێ، وەكو جوولە وئەوەی سەر بە جووڵەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ لە ئانەكانی زەمەندا دێتە دی، كەواتە دەبێ ئان-چركەسات- كە رۆخی زەمەنە هەبێ، چونكە ناشێ شتێ نەبێ ببێتە دەفر بۆ بوونی شت.

زەمەن لە زنجیرە چركەیەك پێكهاتووە، وەكو هێڵ لە چەندین خاڵ پێكهاتووە، پێكهاتنی زەمەن بە پێكهاتنی یەك لە دوای یەكی ئەو چركە ساتانەیە، كەواتە، هەر كات بەو جۆرە وێنای زەمەن بكەین، دەبێ بڵێین زەمەن بێ چركە- ئان- نابێ.

ئەو زانایانە كە سەر بە رێبازی ئەشعەرین هەندێكیان سەبارەت بە زەمەن دەڵێن چركە ساتەكانی دیارن، بەڵام ماهیەتی زەمەن بە گشتی نادیارە، بۆیە بەم جۆرە پێناسەكەی دەكەن كە: (زەمەن نوێ بوونەوەیەتی دیارە بۆ پێوەركردنی نوێبوونەوەی شتێكی نادیار بۆ ئەوەی دیاری بكات، یان بە پێچەوانەوە پێوەرێكە لە نێوان نوێبوونەوەكاندا ئەمسەر و ئەوسەری پێدەكرێ[2]. وەكو بڵێی (كەی هاتی) لە وەڵامدا دەوترێ: لەگەڵ هەڵهاتنی رۆژدا، لەم نموونەیەدا

---

١ زانستی كەلام (فەلسەفە- واچەكان- لاهووت — ل ٢٦٥

٢ زانستی كەلام (فەلسەفە- واچەكان- لاهووت — ل ٢٥٨

زەینی کەسی پرسیارکەر بۆ هەڵهاتنی رۆژ ئامادەبونێکی هەیە و لای دیارە، لەم نمونەیەدا زەمەن نوێبونەوەی شتێکی نادیاری پێ دەپێورێ و زەمەنە دیارەکە نادیارەکە دەردەخات. جا ئەگەر ئەو برِە کاتە دیارە نوێبوەوە(زەمەن) بێ، دەبێ زەمەن حەقیقەتێکی دیار و بوونێکی واقیعی هەبێ، کەچی ئەشعەریەکان لەو باوەرِەدان کە زەمەن فاکتەرێکی وەهمییە.

بۆچونێکی دیکە سەبارەت بە حەقیقەتی زەمەن هەیە، کە پێیوایە زەمەن وەك داوێکی درێژە بە خرِیلە(بکرە)کەوەیە، کە ئێستا خاڵێکی جیاکەرەوە تیایدا لە نێوان رابردووی ئەو داوە یان خرِیلەیە، کە هێشتا بە خرِیلەکەوە ماوە و نەپچرِاوە[1].

فەیلەسوفەکان لەوانە ئەرستۆ، پێیوایە، زەمەن میقداری جووڵەی فەلەکی باڵایە، بەڵگەی ئەوەیە کە زەمەن (چەندێکی نووساوە) ئەو چەندیەتیەی کە لە زەمەندا هەیە، لەبەر ئەوەیە چونکە قبوڵی یەکسانی نایەکسانی دەکات. هەروەها یەك خولی فەلەکی یەکسانە بە زەمەنی خولێکی دیکەیەوە و کەمترە لە زەمەنی دوو خولی و پترە لە زەمەنی نیو خولی، بۆیە وتراوە، زەمەن چەندێکی نووساوە[2].

هەندێ لە فەیلەسوفان پێیان وابووە: زەمەن جەوهەرێکی سەربەخۆیە و خۆی بەخۆیەوە بەندە، نەپێویستی بە شوێن و یاگە هەیە کە خۆی پێوەی رابگرێ، نەبە جوولە تابیکات بە برِو پێی بپێوێ[3]. هەندێك لە زانایانی کەلام لایانوایە: زەمەن بوونێکی زەرورییە (واجب الوجود)ە، چونکە لەناوبردنی پاش بوون و پێش بوونی مەحاڵە، هەروەها پێشکەوتن و پاشکەوتن لە نێوان بون و نەبووندا تەنیا لە زەمەندا وێنا دەکرێ.

کەواتە بوونی زەمەن لای فەیلەسوفان لە چەندین رەهەندی جۆراوجۆردا خۆی پیشاندەدات.

### - زەمەن لای مەسیحیە چاکسازەکان و قەشە ئۆگستین:

زەمەن لای مەسیحیەتی چاخەکانی یەکەمی زایینی بریتیە لە زەمەنی راستەهێڵی و بەردەوام و یەك ئاراستەیە، هەروەها برِوایان وایە کە زەمەن دەرکەوتن و تەجەلی راستەقینە و راستەوخۆی ویست و ئیرادەی خودایە، لەم تۆرِە ئەندامی و تاکەدا، هەموو رووداوێك، رابردوو، ئێستا، داهاتوو، شوێن و

---

١ مجله ، دراسات فلسفیە- عدد، ٤- سنە، ١٩٩٩- بغداد- ل ٧١

٢ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل ٢٥٩

٣ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت — ل ٢٦١

واتای خۆی هەیە، ئەمەش بەو پێیەی ئەو ڕووداوانەی کە ڕوودەدەن ڕووداوەکانی پێشتری تیادایە و بەیەکەوە بەندن، هەروەك چۆن پەیوەستیشە بەو ڕووداوانەی دواتر ڕوودەدەن[1].

لەم بەشە بچوکەدا هەوڵدەدەین، پەیوەندی نێوان ئەبەدی و زەمەنی جیهان و زەمەنی دەروونی پیشانبدەین. زۆر لە بیرمەندە مەسیحیەکان باسی کێشە و ناکۆکی نێوان ئەم زەمەنانەیان کردوە، یەکێك لەوانە قەشە (سانت ئۆگستین)ە لە کتێبی (دانپیانانەکان) کە ویستویەتی وەڵامێکی شیاو و گونجاو و ڕازیکەر بداتەوە، سەبارەت بە پرسیاری، ئایا خودا پێش ئافراندن و خەلقکردنی زەوی و ئاسمان چی دەکرد؟[2]

سەبارەت بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئۆگستین دەلێ: ئەگەر لە کرۆك و گەوهەری خوادا شتێك یان گەوهەرێك پەیدابوو کە پێشتر نەبوو، ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەو گەوهەری ئەبەدی یە، بەڵام ئەگەر خودا ویستێکی ئەبەدی هەبێت لە ئافەریدەکردنی شتێك یان بوونەوەرێك، ئەو کاتە دەکرێ بلێین ئافەریدەکراوەکەش ئەبەدیە[3].

لە کتێبی (دانپیانانەکان) قەشە ئۆگستین، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێ: " ڕاستە کە بڵێم کاتێك کە هیچت نەخوڵقاندبوو، زەمن بوونی نەبوو، چونکە تۆ زەمەنت بەدیهێنا. زەمەنێك بوونی نەبووە کە لەگەڵ تۆ و لە ئەزەلەوە هەبووبێ، چونکە تۆ هەرگیز ناگۆڕێیت، ئەگەر زەمن هەرگیز نەگۆڕا ئەوا ئیتر زەمن نەبوو"[4].

ئەم پرسیارە کراوە بە مەبەستی گونجاندن و تەوفیقکرن لە نێوان خودایەکی سابت و نەگۆر و چەسپاو بە شێوەیەکی ڕەها، و بیرۆکەی جیهانێك لە ساتێکدا خەلقکرابێت.

بە ڕوانینی ئۆگستین ئەم پرسیارانە بە شێوەیەکی خراپ خراونەتە ڕوو، لەبەرئەوەی گریمانەی ئەوە دەکرێت، کە زەمەن بەر لە خەلقکردنی دونیا هەبووە، ئەم گریمانەیەش نادروست و ناتەواوە، چونکە زەمەن وەك بوونەوەرەکانی دیکە خەڵقکراوە[5]. کەواتە ئەگەر پێش ئافەریدەکردنی ئاسمان وزەوی، زەمەن نەبێت، ئەوا بۆچی بپرسین خودا ئەو کاتە چیدەکرد؟ بۆیە

---

١ نظام الزمان — ل٣٥٨

٢ نظام الزمان — ل٣٦٩

٣ نظام الزمان — ل٣٦١

٤ ئاشنابوون بە قەشە ئۆگستین- پۆل ستراتیرن- و. سەرهەنگ عەبدولڕەحمان- ٢٠١١- ل ٣٢

٥ نظام الزمان — ل٣٦١

ئۆگستین جەخت لەوەدەکاتەوە کە ئەگەر زەمەن نەبێت، ئان و سات بونی نییە. (دەربارەی خودا) بو ئەوەی ئەم گوزارشتەی ئۆگستین روون بێت.

مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی لە زۆربەی سەردەم و شوێن و کاتەکاندا، لە خۆی پرسیوە، زەمەن چییە؟ چۆن دەستیپێکردوە؟ بەرەو کوێ دەڕوات و دمانبات؟ ئایا زەمەن هاوشێوەی رەوتی رووبارێکە کە بەردەوام ناوەستێت و خەون و ئاواتەکانمان لەگەڵ خۆیدا دەبات؟ ئایا زەمەن وەك هێڵی شەمەندەفەر یەك ئاراستەی هەیە، یان لق و پۆپی لێدەبێتەوە و پێچاوپێچە؟

قەشە ئۆگستین یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە زۆر خۆی مژول و خەریکردوە بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، کە وەڵامەکەشی یەکێکە لە بەناوبانگترین نوسین و و پەرەگرافێك سەبارەت بەم پرسیارە نوسرابێت، کە تیایادا هاتووە: (زەمەن چییە؟ کێ دەتوانێت وەڵامی ئەمە لە وشەدا دابڕێژێت، یان بە هزرو بیر دەرکی پێبکات؟ لە گەڵ ئەوەی کە لە میانی گفتوگۆ و قسەکانماندا زۆر باسی دەکەین و تێدەگەین، هەروەها تێیدەگەین کاتێك یەکێك باسی دەکات[1]. کەواتە (زەمەن چییە؟) قەشە ئۆگستین لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، دەڵێت، ئەگەر کەسێك ئەم پرسیارەم لێ نەکات، ئەوا دەزانم زەمەن چییە، بەڵام ئەگەر بێتوو یەکێك ئەم پرسیارەم لێ بکات و بمەوێت وەڵامبدەمەوە و وباسی بکەم، ئەوا نازانم و ناتوانم وەڵامبدەمەوە.

قەشە ئەگستین، لە کتێبی (دانپیانانەکان، کتێبی شەشەم، بەشی "٤") دا سەبارەت بە کێشەی زەمەن، دەڵێت: " زەمەن چییە؟ ئەمە وا بە ئاسانی و خێرایی وەڵام نادرێتەوە، چونکە تێگەیشتن لە وەی کە زەمەن چییە کارێکی هەروا ئاسان نییە، چ جای دۆزینەوەی کۆمەڵێ دەستەواژە بۆ روونکردنەوەی. بەڵام لە گفتوگۆکانی خۆماندا دەستەواژەیەکی ئاشناتر و ئاسانتر لە (زەمەن) نادۆزینەوە، بێ سێ و دوو دەزانیین ئەم واژەیە چ مانایەکی هەیە، چ ئەو کاتەی کە خۆمان بەکاریدێنین چ ئەو کاتەی کە لە خەڵکانی ترەوە بەر گوێمان دەکەوێت. کەواتە زەمەن چییە؟ دەتوانم بە دڵنیایەوە بڵێم ئەگەر هیچ شتێ تێنەپەڕیبایە، زەمەنی داهاتوو وجودی نەدەبوو، ئەگەر رووداوێك لە رێیدا نەبواییە، زەمەنی داهاتوو بوونی نەدەبوو. بەم پۆلێنبەندیەی زەمەن، دووان لەوان رابردوو، داهاتوو، چۆن دەتوانن هەبن لە کاتێکدا کە رابردوو نەبێت و داهاتووش هێشتا نەبێ؟ بەڵام ئێستا ئەگەر هەمیشە ئێستا بوایە و هەرگیز نەجولایە تابێتە رابردوو، ئیتر ئەوە زەمەن نەبوو، بەڵکو ئەبەدیەت بوو، وێڕای ئەمە، ئەگەر ئێستا تەنیا بە هۆی ئەو واقیعەوەی کە زەمەنە و دەجووڵا تا ببێتە رابردوو، چۆن دەتوانیین، بڵێین ئێستا هەیە، لە

---

١ نظام الزمان — ل٣٦٢

کاتێکدا بەڵگەی ئەمەی کە هەیە ئەوەیە کە نەبوبێت؟ بە گوزارشتێکی تر بە باشی ناتوانین بڵێین زەمەن وجودی هەیە، مەگەر بە هۆی حاڵەتی نزیك بە روودانی لە ناوچوونی"[1].

کەچی بە راشکاوی بانگەشەی ئەوە دەکەم کە دەزانم ئەگەر هیچ شتێك روونەدات، ئەوا زەمەنێکی بەسەرچوو بوونی نییە، ئەگەر هیچ شتێك لە ناکاودا روونەدات، ئەوا داهاتوو بونی نییە، هەروەها ئەگەر هیچ شتێك نەبێت ئەوا زەمەنی ئێستا نابێت. کەواتە ئەم دوو زەمەنە(ئێستا، داهاتوو) چۆنن. سەبارەت بە رابردوو ئەوا بوونی لە ئارادا نییە، هەروەها داهاتووش هێشتا نەهاتووە و رووینەداوە، بەڵام سەبارەت بە ئێستا، ئەگەر بێتو بەردەوام حازرو ئامادەبێت و نەبێتە رابردوو، ئەو کاتە زەمەن بوونی نابێت، بەڵکو ئەمە ئەبەدیەتە. کەواتە بۆ ئەوەی زەمەن مانای هەبێت، ئەوا هەنووکە دەبێ ببێتە رابردوو[2].

لێرەدا، قەشە ئۆگستین، باسی کێشە و پەیوەندی نێوان زەمەن و هەبوون (الکینونە) دەکات و لە میانی باسەکەیدا جەخت لەوە دەکاتەوە، بۆ ئەوەی رابردوو هەبێت، پێویستە شتێك هەبێت گوزەر بکات و تێپەڕێت، هەر وەك چۆن پێویستە شتێك هەبێت بۆ ئەوەی ببێتە داهاتوو[3]. هەروەها ئۆگستن دەپرسێت، ئەو شتەی کە بۆ دامەزرانی زەمەن پێویستە دەبێ چۆن بێت، لەبەر ئەوەی ئەگەر رابردوو لە بووندا نەمابێت ئایندەش هێشتا نەهاتووە، هەنووکەش ئەگەر بەردەوام بێت دەبێتە ئەبەدی؟ بە گوزارشتێکی دیکە، چۆن دەکرێ هەنوکە بێت، چونکە بوونەوەر لێرەدا تەماهی دەکات لەگەڵ ئێستا.

زەمەن وەکو لەناوچوویەك و رێبوارێك، دەبێتە ناکیان (اللاکیان) ئەمەش لە روانگەی مەسیحیەت جیگای قبوڵکردن نییە، قەشە (ئۆگستین)یش ئەو گۆڕان و لەناوچوونەی زەمەن رەتدەکاتەوە، هەروەها دیدی پێچەوانەش کە کەینونەی تەواو و کەماڵ بە زەمەن دەدات و و تەماهی دەکات لەگەڵ ئەبەدیەتدا، مایەی قبوڵکردن نییە[4]. لەبەر ئەوەی بە روانینی ئەو زەمەن نە (کەینونە) یە و نە (لاکەینونە)یە، بەڵکو دۆخیکی ناوەند و لێلی هەیە، کە قەشە

---

١ ئاشنابوون بە قەشە ئۆگستین- پۆل ستراتێرن، وەرگێرانی لە فارسیەوە، سەرهەنگ عەبدولرەحمان- سلێمانی- ٢٠١١- ل ٣٢

٢ نظام الزمان — ل٣٦٢

٣ نظام الزمان — ل٣٦٣

٤ نظام الزمان — ل٣٦٣

ئۆگستین هەوڵیداوە، ئەم دۆخە لێکبداتەوە و راڤەیبکات. لێرەدا چەن پرسیارێك هاتۆتە کایەوە، پرسیاری یەکەم: کوا ئەو زەمەنەی کە دەڵێن درێژە؟ هەروەك دەرکەوت هەنووکە نییە،

چونکە دەبێت رابردوو و داهاتوو خۆ بە دەستەوە بدات بۆ دیتن لە جێگایەك: ئایا رابردوو ناگێڕینەوە؟ ئایا پێشبینی داهاتوو ناکەین؟ کەواتە هەردووکیان هەن، لەبەرئەوەی ناکرێ شتێك ببینین کە نەبێت، بۆیە دەبێ ئێستا لە شوێنێکدا هەبن. بەڵام چۆن دەکرێ رابردوو و داهاتوو ئامادەگی یان هەبێت، ئەگەر یەکەمیان لە بووندا نەمابێت و دووەمیشیان هێشتا نەهاتووە؟[1]

کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ئەم دوو زەمەنە هەن، سەبارەت بە خوود و دەروون، کە وێناندنی لای مرۆڤ پارێزراوە، هەروەها مرۆڤ هۆکار یان نیشانەی رووداوەکانی کە لە داهاتوودا روودەدەن دەبینێت. بۆیە رەنگە دەتوانیین بڵێین: سێ زەمەن هەن، رابردوو، ئێستا، داهاتوو، بەڵکو تەواوتر وایە بڵێین: هەنووکەی رابردوو، هەنووکەی ئێستا، هەنوکەی داهاتوو[2]. لە راستیدا ئەم سێ حاڵەتەی زەمەنە بە شێوەیەك لە شێوەکان، لە دەرووندا هەن: هەنووکەی رابردوو بریتیە لە یادەوەری، هەنووکەی ئێستاش بریتیە لە بینین، هەنوکەی داهاتووش چاوەڕوانییە.

هەنووکە یەك لە دوای یەکەکان یادەوەری و کاریگەری لە دەرووندا جێدەهێڵێت، کە بە هۆیانەوە رابردوو دەمێنێتەوەو ئامادەگی دەبێت، هەر وەك چۆن ئایندەش ئامادەیی دەبێت، لە رێگەی نیشانەکانیەوە[3].

سەبارەت بە پێوانی زەمەن، لە رواڵەتدا پێوان روون نییە، بە تایبەتی ئەگەر زەمەن لە گەڵ زەمەنی دەروونی وێکبچێت، مادەم ئێمە پرۆسیس دەکەین، دەبێ دان بە زەمەنێکی دیکەدا بنێین، کە جووت بێت لەگەڵ تەنەئاسمانیەکان؟

قەشە ئۆگستین، ئەم چارەسەرە دووردەخاتەوە و پێیوایە، کە زەمەن جوولەی تەن نییە، چونکە جوولەی تەنەکان بە زەمەن دەپێورێت، بەڵام خودی زەمەن بە جولە ناپێورێت[4]. هەروەها ئۆگستین، دەڵێ: ئێمە زەمەن دەپێوین، بەڵام چ زەمەنێك؟ لە وەڵامدا دەڵێت: بێگومان داهاتوو نییە کە هێشتا نەهاتووە، هەروەها

---

١ نظام الزمان — ل٣٦٤

٢ نظام الزمان — ل٣٦٤

٣ نظام الزمان — ل٣٦٥

٤ نظام الزمان — ل٣٦٥

رابردووش نییە، کە تێپەڕبووە، ئێستاش نییە لەبەرئەوەی درێژبوونەوەی نیە. کەواتە تەنها دەتوانیین ئەو ئەو شتە بپێوین کە لە یادەوەریدا بەردەوام دەبێت[1].

قەشە ئۆگستین، سەبارەت ئەم مەسەلەیە، لە کتێبی (دانپیانانەکان، کتێبی یازدەم، بەشی "٢٦") دا دید و بۆچوونی خۆی دەخاتە روو و دەڵێت: بە دڵنیاوە من پێوانەی زەمەن دەکەم و هەڵیدەسەنگێنم، بەڵام بە وردی نازانم ئەوەی کە پێوانەی دەکەم چییە. ناتوانم جوولەی تەنەکان لە زەمەندا پێوانە بکەم، ئایا ئەمە بە مانای پێوانەکردنی خودی زەمەن نییە؟ ئایا دەتوانم جوولەی تەنێك پێوانە بکەم کە جووڵە چەند دەخایەنێت و تەن لە چ ماوەیەکدا لە نێوان دوو پنتدا دەجولێت؟ ئەگەر وابێ، چۆن پێوانەی زەمەن بکەین؟ ئایا قۆناغە درێژەکانی زەمەن بە هۆی قۆناغێکی کورتترەوە پێوان بکەین، بە هەمانشێوەی درێژی بڕگەیەك بەم شێوەیە دەپێوین ئەوە بە بڕگەیەکی بچووکتر دەپێوین، بۆمان دەردەکەوێت کە دوو بەرامبەری ئەوە، سوود لە هەمان ڕەوش وەردەگرین کاتێ کە درێژی شیعرێك بە درێژی دێرەکانی دەپێوین، لەم شێوەیەدا ئەمە هۆکارێکی ور و رێکوپێك نییە بۆ پێوانەکردنی زەمەن، چونکە لەوانەیە دێرێکی کورت ئەگەر بە ئارامی و لەسەرخۆیی بیخوێنینەوە لە دێرێکی درێژ زیاتر بخایەنێ کە بە پەلە دەخوێنرێتەوە[2]. هەروەها دەڵێ: " کاتێ کە دەڵێم قۆناغێکی زەمەن لە قۆناغێکی تر درێژترە، یان دوو هەندەی ئەوە، چیم هەڵسەنگاندوە؟ دەزانم خەریکە زەمن دەپێوم. بەڵام پێوانەی داهاتوو ناکەم، چونکە هێشتا وجودی نییە، هەروەها ئێستاش نا، چونکە درێژە (امتداد)ی نییە و هەروەها رابردووش نا، چونکە ئیتر وجودی نییە، ئایا ئەو زەمنەی کە پێوانەی دەکەم کە لە دواهاتی تێپەڕینە، بەڵام هێشتا تێنەپەڕیوە"[3].

بە روانینی ئۆگستین، پێوانی زەمەن لە رێگەی ئەقڵەوە ئەنجامدەدرێت، مرۆڤ ئەو شتانە دەپێوێت و هەڵدەسەنگێنێت کە کەرت و پارچە دەبن و دەڕۆن و ئینتیباع و کاریگەریەك لەسەر هزرو ئەندێشەی مرۆڤ جێدەهێڵن. ئەو کاتە شتەکان یان رووداوەکان ئامادەگیان دەبێت و دەمێننەوە، هەرچەندە شتەکان دەبنە رابڕدوو[4].

---

١ نظام الزمان – ل٣٦٦

٢ ئاشنابوون بە قەشە ئۆگستین- ل ٣٦

٣ ئاشنابوون بە قەشە ئۆگستین- ل٣٧

٤ نظام الزمان – ل٣٦٦

بەم شێوەیە تێپەڕینی زەمەن تەماهی دەکات لەگەڵ چالاکی ئەقڵ، ئەو عەقڵەی کە دەرکپێدەکات و یاددەکاتەوە، هەروەها عەقڵ بابەتێکی چاوەڕوانکراو لە ڕێگەی دەرکپێکردنەوە، دەگۆڕێت و دواتر لە یادەوەریدا دەیپارێزێت، ئەو کاتە حەقیقەت و ڕاستی بە داهاتوو و ئێستا و ڕابردوو دەبەخشێت. لەبەر ئەوەی ئەگەر داهاتوو هێشتا نەهاتبێت، ئەوا چاوەڕوانکردنی ئەو داهاتووە لێرەیە، هەروەها ئەگەر ڕابردوو ڕۆیشت، ئەوا یادەوەری دەمێنێتەوە، سەبارەت بە هەنووکەش، ئەوا درێژبوونەوەی نیە[١].

قەشە ئۆگستین، بڕوای وایە کە زەمەنی دەروونی و زەمەنی مێژوو ناسنامەی گەوهەرییان بەدەرناکەوێت، ئەگەر مرۆڤایەتی وەك دەروونی تاك، وەك هەمەك و گشتێك بەهەند وەرنەگیرێت، بۆیە مرۆڤ دەبێ خاوەنی عەقڵێك بێت، چاوەڕوانبکات، دەرکبکات، یادبکاتەوە.

**- سۆفیگەری و زەمەن:**

ئەو نووسین و توێژینەوانەی سەبارەت بە بیرۆکەی زەمەن ئەنجامدراون، ئەزموونی زەمنیان لای سۆفیگەرەکان فەرامۆش کردوە. پێویستە ئەو بزانین کە سۆفیگەرەکانیش ململانێیان لە گەڵ زەمەندا هەبوە، چونکە مومارەسە و ئەزموونی خودی و ئایینی و عیرفانی لای سۆفیەکان، ئەزموونێکی دەروونییە، واتە جەستەیان باڵا دەبێت بۆ ئاستێکی نەفسی بەرز و دەیانەوێت خۆیان ئازاد و دەربازبکەن لە زەمەنی ئاسایی و مێژوویی و خۆیان دەخزێننە ناو زەمەنی ڕەها و دەچنە حاڵەتێك کە خودی سۆفیەکە ئازاد دەبێت لە گشت بابەت و شتێکی هەستیاری. بۆیە بیرۆکەی زەمەنی سۆفیگەری بریتیەلە گەشتێکی پڕ لە مەینەتی و خەڵوەت و زیکر و کۆشش و موجاهەدە، لە پێناو لابردنی پەردەی هەستیاری دنیایی و ڕوانین و بینینی جیهانی موقەدەس، کە مرۆڤی ئاسایی و دونیایی ناتوانێت درك بەو جیهانە بکات.

گەر ورد و قوڵ لەم گەشتە قورس و سامناکەی سۆفی ڕابمێنینی هەستدەکەین، ئەم گەشتە بریتیە لە بزوتن و هەوڵدان بەرەو ژیانێکی سادە و هەنگاونان و پەڕینەوەیە بەرەو نیشتەجێبوون لە جیهانێکی چۆڵ، هەڵهاتن و فڕینە بەرەو دنیایەکی ساکار و جیابوونەوەیە لە کاروانی ژیانی

---

١ نظام الزمان — ل٣٦٦

مرۆڤەکانی دیکە، ڕێرەوی سەفەری سۆفی بەرەو ڕابردووە، پێچەوانەی ئاراستەی ڕوو لە داهاتووی مێژوو، هەنگاوی ئەو ڕووەو زەمەنی ڕۆیشتووە، نەك ڕوو لە ئایندەبێت[1].

ئەم جیابوونەوەی مانای گەڕانەوە دەگەیەنێت لەم دنیا جەنجاڵ و سیخناخ لە هەروا وهۆریای کاروانی مرۆڤەکان و بارگەدانانە لە دنیایەکی دیکە کە خەیاڵی و سادەو ساکارەو لێوانلێوە لە بێدەنگی. ئەم سەفەرەی سۆفی پێچەوانەی ئاراستەی سەفەری مرۆڤەکانی دیکەیە و هاتنەدەرەوە جیابوونەوەیە لە لە ڕەوتی بەرەو پێشچوونی مێژوو و دووبارە گەڕانەوەیە بەرەو هەوارگەی دێرین[2]. سۆفی لە گەشتەکەیدا گەلێك وێستگەی سەر ڕێی گەشتەکەی جێدەهێڵێ، تا سەرئەنجام بە دۆخێك دەگات کە سۆفی لەم دۆخەدا بەو کارانە هەڵدەستێ کە دەکەونە سەرووی توانای مرۆڤی ئاساییەوە، چونکە وەك ئاماژەمان پێکرد سۆفی لە مرۆڤی ئاسایی جیادەبێتەوە و جیهانێکی دیکە بونیاد دەنێ[3].

واتە مرۆڤی سۆفی لە گەشتەکەیدا دەتوانێت لەم زەمەنە ئاساییە ڕەتبێت و بگاتە زەمەنی ڕەها. کەواتە زەمەنی سۆفیگەر هەستێکە هیواو ئامانجی مرۆڤی سۆفی لە پێناو هێنانەدی زاتی خۆی لەناو زەمەنی ڕەهادا پیشاندەدات.

واتە، زەمەنی ئاسایی و سەر زەوی شتێك بووە کە سۆفیگەرەکان ویستویانە لێی دەربازبن، هەر بۆیە سۆفیگەری ناسراو (مایستر ئیکهارت)* دەڵێ: (هیچ کۆسپێك لە ڕێگەی گەیشتن و یەکگرتن لەگەڵ خودادا نییە، تەنها زەمەن نەبێت)[4].

کەواتە لە سۆفیگەریدا زەمەنی نەفسی و زەمەنی ڕەها ئاوێتە و تێکەڵی یەك دەبن.

---

١ گ، ژیار، ژ، ١٠-١١- ساڵی ٢٠٠٢- ل ١٣٦

٢ گ، ژیار، ژ، ١٠-١١- ساڵی ٢٠٠٢- ل ١٣٧

٣ گ، ژیار، ژ، ١٠-١١- ساڵی ٢٠٠٢- ل ١٣٨

٤ فكرة الزمن عبر التاريخ –ل ١٩

* مایستر ئیکهارت، سۆفیەکی ئەڵمانییە، لە سەرەتای ژیانیدا چووە ریزی دۆمینیکانییەکانەوە، ماوەیەك لە کۆلۆنیا و پاریس خوێندی، دواتر بووە قەشەی بۆهیمیا، بە دامەزرێنەری تەسەووفی ئەڵمانی لە قەلەم ئەدرێ.

- **زەمەن لای فەیلەسوفانی یۆنان و رۆژئاوا:**

لە مێژووی فەلسەفەدا  بە تایبەتی لە سەردەمی ئەرستۆوە تاکو ئەمڕۆ کێشەی (زەمەن) هاتۆتەکایەوە و زۆر لە مێژە فەیلەسوفەکان و بیرمەندەکان هەستیان بە هەقیقەت و گرنگی زەمەن و کات کردوە، و یەکێك لە ئالۆزیەکانی چەمکی زەمەن ئەوەیە کە هەریەك لە بیرمەند و فەیلەسوف و زانایان جۆرێك لێکدانەوەیان هەیە بۆ ئەم چەمکە کە جیاوازە لەوانی تر،هەندێکیان واتێگەیشتون کە زەمەن گرنگیەکی گەورە پێکدەهێنێت لە ژیانی مرۆڤدا. ئەرستۆ زەمەنی بە "حاکمترین حاکمەکانی وەسفکردوە" لە بەرئەوەی توانای دۆزینەوە و هەڵماڵینی هەموو شتێکی هەیە، "سۆلۆن" وای بۆچووە کە زەمەن ناوەڕۆك و هەقیقەتی شتەکان دەردخات، "سیمۆنیدس" پێی وابوو زەمەن ددانی بەهێزی هەیە و هەموو شتێك دەدڕێنێت، "یۆرپیدس" زەمەنی کردۆتە باوك بۆ دادپەروەری و بەو دەرمانەی دناوە کە چارەسەری برین دەکات، "سۆفۆکلیس" پێی وابوو کە زەمەن بونەوەرێکە رۆژەکان و شەوەکانی لێ دەبێت[1] .

بە بڕوای ئەفلاتون زەمەن و ئاسمان بەیەکەوە پەیدابوون و پێکەوە و لەگەڵ یەك لەناودەچن و فەنادەبن، هەروەها رۆژ و مانگ و هەسارەکان بۆ دیاریکردن و ژماردنی زەمەن و پاراستنی هەن، حیسابەکانی زەمەنیش لای ئەفلاتون بریتین لە: رۆژ و شەو، ساڵ، مانگ[2]. واتە ئەفلاتون بڕوای وایە کە زەمەن وەك یەکە لەگەڵ جووڵەی تەنە ئاسمانیەکان. ئەو بروای وایە، کە شەو رۆژ و مانگ و وەرزەکان، پێش پەیدابوونی ئاسمان بوونیان نەبوو، چونکە ئەوانە دابەشەکردنەکانی زەمەنن. هەروەها زەمەن نەبینراو و هاوشێوەی گەوهەرێکی ئەبەدیە کە شیاوی گۆڕان و تێکچوون نییە، ئەوەی هەمیشە نەگۆڕ و سابتە، ئەو شتەیە کە لەگەڵ زەمەندا نەگەنجتردەبێتەوە و نەپیردەبێت. ئەو شتە نە ئێستا هەیە و نەلە داهاتووشدا دەبێت[3].

سەقامگیری جیهانی بینراو، حاڵەتی خەڵقکردنیبینراو دەکاتە شتێك و فیعلێك لە دەرەوەی زەمەن.

ئەرستۆ و نیوتن باوەڕیان بە زەمەنی رەها هەبوو، واتە مرۆڤ دەتوانێت بە روونی زەمەنی نێوان دوو رووداو بپێوێت و ئەو زەمەنە هەر مرۆڤێك بیپێوێت هەر یەکە، بە مەرجێك کاتژمێرێکی ورد

---

١ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢، ل١٩

٢ نظام الزمان — ل٣٤٤

٣ نظام الزمان — ل٣٤٤

بەکاربهێنرێت[1].. فەیلەسوفی ئەڵمانی (ئەمانۆئیل کانت) لە بارەی زەمەنەوە دەڵێت: " زەمەن هیچ شتێك نییە جگە لە مەرجێکی خودی بۆ پەیردنمان کە بەردەوام هەستەکییە، واتە ئەوەی کە نابێت مەگەر کاریگەربین بە بابەتگەلێك، ئەو لە خودیدا هیچ نییە، لە دەروەی خود"[2] (بەم جۆرە کانت پەسنی زەمەن دەکات کە لە خودی خۆیدا شتێك نییە، بەڵکو پەیبردنی زەینی مرۆڤە مانا دەدات بە زەمەن، هەر بۆیە کانت دەڵێت: " ناتوانیین بڵێن هەموو شتەکان لەناو زەمەندان" [3] هۆی ئەمەش ئەوەیە، ئێمە پەیبردن یزەینی رووت دەکەینەوە لە شتەکان کە مەرجە بۆ بونی زەمەن. هەروەها لە بارەی پەیوەنی نێوان زەمەن و رووداو، کانت پێیوایە، هەر رووداوێك لە خاڵێکی یاریکراوی زەمەندا رووبدات، ئەوا ئەو رووداوە دەبێتە ئەنجام بۆ ئەوەی کەلە زەمەنێکی رابردووتردا لە پێش ئەوە خاڵەوە روویداوە[4].

فەیلەسوفی بەریتانی (بەرتراند راسل)یش سەبارەت بە زەمەن، دەڵێت: ئەوەی پەیوەندیدارە بە زەمەنەوە، هەستکردنمان بە مانەوە و کەموکورتی زەمەن بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو نییە، چونکە تێپەڕینی زەمەن لامان چۆنیەك نییە، ئەو کاتەی لە ئازارو ناخۆشیدایین هەست بە درەنگ تێپەڕینی کات دەکەین، بەڵام ئەو کاتانەی لە خۆشیداین دەکەین کات بە خێرایی تێدەپەڕێت، هەندێك کاتیش هەست بە تێپەڕینی کات ناکەین وەك ئەوەی نەبێت، بۆ نموونە لە کاتی خەوتندا. هەروەك دیارە کە زەمەن لە ماوە "مدە" پێکهاتووە، بۆیە پێویستە جیاوازی لە نێوان کاتی تایبەت و کاتی گشتیدا بکەین[5].

- روانینی هیگل بۆ زەمەن: لای فەیلەسوفی ئەڵمانی فردریك هیگل زەمەن لە (سات — ئان) پێکهاتووە، هەرساتێك ساتێکی دیکە بەرزدەکاتەوە، هەروەها رەهەندەکانی زەمەن لای ئەو کە بریتین لە: رابردوو، ئێستا، داهاتوو، ئێستا ئاکامی رابردووە پێچانەوە و مەبەستی داهاتووی هەڵگرتووە، هەر وەك چۆن ئایندەی لیٚ دەردەچێت. بۆیە لای هیگل (هەنوکە) گرنگترین چرکەساتی زەمەنە و سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت: تەنها هەنووکە بونی هەیە، و پێش

---

١ موجز تاريخ الزمن- تاليف، ستيفن هوكنغ- ترجمة، باسل محمد حديسي- بغداد- ١٩٩٠- ل٤١

٢ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل٧٤

٣ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل٧٤

٤ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل٧٥

٥ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل٧٥

و دوای ئەو بوونیان نییە، بۆیە ئێستا عەینی ئاکامی رابردووە و هەڵگرێکە بۆ ئایندە-ئایندەی هەڵگرتووە- بۆیە هەنووك راستەقینەی ئەبەدی یە[1].

لەلایەکی دیکەوە، هیگل پێیوایە، کە زەمەن و رۆح پێکەوەن و رۆح لە گەوهەردا لەزەمەندایە و هەردووکیان پێکەوە، مێژووی گشتی پێکدێنن، چونکە مێژوو بە مانا بەرزەکەی، بریتیە لە رۆح کە خۆی لە رێگای زەمەنەوە دەخاتەڕوو.

لای هیگل زەمەنی رۆحی چڕ و پڕ و پەتیە و لە ناواخن و ناوەڕۆکی خۆیدا پێکهاتەکانی رۆحی و هاتنەدیەکانی واقعی هەڵگرتووە، کە لە رابردوودا هاتنەدی و تەواوبوون. هەروەها کە لە ئێستا و داهاتوودا رادەگەینرێت. ئەو پێیوایە بە تێپەڕینی زەمەن، رۆح دەگاتە پلەی کەماڵ و واقعیەت، واتە رۆح لە زەمەندا دەردەکەوێت[2]. لە روانگەی (هیگل) ەوە، ئێمە دەرك بە (شوێن) و (چرکە سات) ناکەین، بەڵام دەرك بە (ئێرە) و (ئێستا) دەکەین، رەنگە هیگل دامەزرێنەری بیرۆکەی (زەمەن- شوێن) بێت، بۆیە زەمەن لای هیگل بریتیە لە حاڵەتێکی رووت و موجەرەد بۆ هەستەکان، و دەرککردن هۆکارێکی ناهەستیە لە هەستپێکراودا. (زەمەن- شوێن) ئەبستراکتی گەردوونین، زەمەنیش خودی داهاتی دیار و لەناوچووە.

هەروەها هیگڵ، پێیوایە، کە بیرکردنەوە لە زمەن لە رووی تیۆریەوە، هەوڵێکە تا لایەنی دیاریکراو و سنورداری ئەو لە بێن بەرێ، نەك تەنیا بە گەڕانەوە بۆ رابردوو و داهاتوو، مانای راستەقینەی (هەنووکەیی) ئەو بزانێ، بەڵکە لە راستیدا بە سەرنجدان لە سەرمەدییەت کە دەست بەکاردەکات. لەم رووەوە سەرمەدیەت روو بە زەمەنە و نە سەرەتای هەیە و نەکۆتایی.

### - زەمەن لە هزری فیۆرباخدا:

لۆدفیك فیۆرباخ کە فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە، سەبارەت بە زەمەن دەڵێت: " هەروەك چۆن شت و جەستەکان تەنها پێکهاتە و دیاردەنین، بەڵکو بابەتی و حەقیقەتن و کاریگەریان لەسەر هەستەکانماندا هەیە، بەهەمان شێوە (زەمەن) و (شوێن) یش حەقیقەتێکە و کاریگەری خۆییان هەیە و و شێوە و فۆرمی واقعی و بابەتیانەی بوونن [3] بۆیە داننان بە واقعیەتی و بابەتیانەی

---

١ مجلة- دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد- ل٤٧

٢ مجلة- دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد- ل٤٧

٣ مجلة –افاق عربية، ع-٥-سنة-١٩٩٠- ل ٩٤

(زەمەن) و (شوێن) پێچەوانەی فەلسەفەی کانتە لەمەڕ (زەمەن) و (شوێن)  کە پێیوایە ئەم دوو بابەتە دوو گوتارن لە گوتارەکانی تێگەیشتنی مرۆیی و واقعی نیین، بۆیە فیۆرباخ ئەم هزرە رەتدەکاتەوە و دەڵێت: " نەفیکردنی  زەمەن و شوێن تەنها نەفیکردنی سنوری نێوانیانە، نەك نەفیکردنی وجود وبونیان، لەبەرئەوەی هەستکردنی نازەمەنی، ویستی نازەمەنی، فیکرێکی نازەمەنی، بونێکی نازەمەنی، خورافیات و قسەی پوچە، لەبەر ئەوەی زەمەن پەیوەستە بە هەستەکان، بە ویست بە هزر بە بوون، و هەرگیز بوونێك نییە بە بێ زەمەن، کەواتە زەمەنێکی رووت و موجەرەد لە ئارادا نییە [١]، لەبەرئەوەی مرۆڤ  توانای هەیە شتەکان بگۆڕێت و کاریان لێبکات و شتە موجەرەدەکان بکاتە بوونێکی سەربەخۆ، وەك بوونی (زەمەن) و(شوێن) بۆیە فیۆرباخ دەڵێ: " زەمەن و شوێن هۆکار و مەرجی سەرەکی بوونی دیاردە و شتەکانن، بۆیە رەسەن و بنەڕەتی هەموو شتە واقعیەکانی دنیا و ژیان، لە زەمەن و شوێن دایە" [٢]

فیۆرباخ بڕوای وایە کە زەمەن و شوێن شتەکان و دیاردەکان فەرزدەکەن و دەسەپێنن، بۆیە لە راستیدا زەمەن چەمکێکە لە جوولە دارێژراوە و بەندە بە شتێك کە دەجوولێت، کەواتە زەمەن و شوێن، دوو فۆرمی دیارو ساکارنین، بەڵکو یاسای ژیانن، فۆرمی ژیانن، یاسای بوون و فیکرن.

لە فەلسەفەی فیۆرباخدا زەمەن و شوێن پەیوەستن لەگەڵ یەك و بیرکردنەوە لە شوێن، واتلێدەکات بیر لە زەمەن بکەیتەوە و ناتوانین بیر لە دەرەوەی بوون بکەین، مەگەر تەنها لە میانی بەدوایەکهاتنیدا نەبێت و نەفیکردنی زەمەن و شوێن هەمیشە موڵکی بەدەستهێنانی خودی هەردوکیانە و هەر کاتێکە بمانەوێت زەمەن وشوێن رەتکەینەوە ولاببەین، ئەمە بۆ ئەوەیە زەمەن و شوێنێکی دیکە بەدەست بێنین.

فیۆرباخ پێیوایە کە زەمەن شێوە و فۆرمی گەردونە و جیهانە، هەروەها جەخت لەوە دەکاتەوە کە زەمەن لە ژیان و بوونی مرۆڤدا گرنگە، و نزیکە لە زەمەنێکی هەستی وبوونی، بۆیە پێویستە فەلسەفە لەسەر بوونی زەمەن بونیادبنرێت، و سەبارەت بە نزیکایەتی زەمەن لە زەمەنی هەستی و وجودی، فیۆرباخ، دەڵێ: " وەك باوە کات لە زەمەندا لە شێوەی هێڵێکی

١ مجلة –افاق عربية، ع-٥-سنة-١٩٩٠- ل ٩٤

٢  هەمان سەرچاوە، ل ٩٤

راستی بێ پچڕان و بێ کۆتایی خۆی دەنوێنێت". هەروەها فیۆرباخ پێیوایە، کە فەزا و زەمەن دوو شێوە نیین بۆ دەرکەوتنی بوون و بیرکردنەوە، بەڵکو مەرجنی سەرەکین بۆ ئەمانە[1].

فەیلەسوفی فەرەنسی (برگسۆن) پێیوایە کە رابردوو و ئاینده هاوتا و هاوشێوەی یەکن، لەبەرئەوەی پێوەلکانی زەمەن، رابردوو دەکاتە گەوهەری ئێستا، بە دەربڕینێکی دیکە ئێستا هیچ نییە لە دیاردەی رابردوو زیاتر، هەروەها پێیوایە کە زەمەن ژیانە[2].

(لیپینتز)ش پێیوایە کە زەمەن سیستەمی بەدوایەکداهاتنە، بۆیە زەمەن ناوەستێت بەو پەیوەندیەی لە نێوان شتە بەدوایەکداهاتووەکاندا هەن، واتە شوێنکەوتەی شتەکان،نەك پێشەنگ بێت[3].

## - زەمەن لای نیتشە:

فەیلەسوفی ئەڵمانی (فریدریك نیتشە) لە بەشی دووەمی (زەردەشت وای گوت) دەنوسێت: "تۆڵەسەندنەوە ویستێکی نەخۆشە بەرامبەر زەمەن" یان تۆڵەیە دژی زەمەن ئەو زەمەنەی کە رابردووە، لێرەدا تۆڵە بە بونی هەبووەکان و بنەڕەتی بوونەوە لەگەڵ زەمەن دا دەبەستینەوە و پەیوەندی نێوانیان دیاریدەکەین، نیتشە لە رستەیەکدا (بەرامبەر زەمەن بە ئەو کاتەی رابردووە) روونەدەکاتەوە، نیتشە لە پێناسەکردنی زەمەندا ئەم سێ رەهەندەی زەمەن لەیەکدی جیاناکاتەوە، دروستە نیتشە لەم رستەیەدا تەنها باسی رابردوو دەکات، بەڵام رابردوو چۆن پەیدا دەبێت؟ ئایا ئەو رابردووەی هەمانە لە داهاتوودا نەبووە و بووە بە ئێستا چۆتە ناو رۆخانی رابردووشەوە؟ زەمەن گۆڕانکاریەکی بەردەوامە و داهاتوو بە بەردەوامی دەبێت بە ئێستا و ئێستاش بە رابردوو. ئێستا و داهاتوو دەڕژێنە ناو رۆخانی رابردووەوە و لەوێدا بە چەقیوی دەمێننەوە و لەوە زیاتر گۆڕانکاریان تێدا روونادات[4]. نیتشە پێیوایە کە زەمەن رابردووە، لەبەر ئەوە دەبێت تۆڵەی لێ بسەنرێت، بۆچی تۆڵە دەبێت بە ویست (ویستێکی نەخۆش) مەبەستی نیتشە لە نەخۆشی توشبوونی گرانەتا نییە.ویست بە بەردەوامی هەوڵی سەقامگیرکرنی پرۆژەکانی دەات، هەوڵدانەکەی بە بەردەوامی

---

١ الزمن في الفكر الديني والفلسفي - ل ٢٤٠

٢ جدلية الزمن- غاستون باشلار- ت، د. خليل احمد خليل، بيروت- دار المجد، ١٩٩٢ — ل ١٤

٣ گ، هەژان- ل ١٤٥

٤ نیتشە و پاش تازەگەری- د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦- ل ٢١١

دەبێت بە رابردوو، هەروەها حەتمیەتی رژان لە رۆخانەی رابردودا  ویستی مرۆڤ نەخۆش دەخات. مەبەستی نیتشە لە تۆڵەسەندنەوە لە زەمەن، وەکو رابردوو ئەوە دەسەلمێنێت مرۆڤی بەرز کەسێك نیە شانازی بە رابردووە بکات و لەوێدا چەقیبێت و ناسنامەی خۆی لەسەری دابمەزرێنێت، بەڵکو مرۆڤی بەرز رقی لە رابردووە و تۆڵەی لێدەسەنێت، تۆڵەسەندنەوەکەش سڕینەوە و لەناوبردنی رابردوو نییە، خۆگەیاندنە بە داهاتوو. هەوڵدانێکی ئۆقرەنەگر و بەردەوامی رەتدانەوەی رابردووە. مرۆڤی بەرز لەم هەوڵدانەدا بە بەردەوامی خۆی دەگەیەنێتە ترۆپکە بەرزەکانی بوون و هاوکات دەیەوێت بەو بەرزییە بۆ هەمیشە بمێنێتەوە و نەمر بێت، چونکە زەمەن  و بڕانەوەی ژیان هەڕەشەکردن و لەناوبردنی بوونە بەرزەکەیە، پێش ئەوەی زەمەن ئەو بوونە لەناوبەرێت، بوونە کە دەبێت تۆڵەی خۆی بسێنیٚ و رێگەنەدات زەمەن فرسەتی پێبهێنیٚ و کاڵای مەرگی بەبەردا بکات.

بوون لای فەیلەسوفی ئەڵمانی (فریدریك نیتشە) بریتیە لە بەردەوامی، واتە بوون کۆتایی نییە، دەبوایە نیتشە ئەم بۆچونەی خۆی بسەلمێنێت، لەبەر ئەوە بیرۆکەی سەرمەدی دەخاتەڕوو، پوختەی گۆشەنیگای نیتشە سەبارەت بە گەرانەوەی سەرمەدی بەو شێوەیە، لەبەرئەوەی زەمەن بیٚ کۆتایی و بیٚ سنوورە، دەبێت لە ساتێك لە ساتەکان ئەو زەمەنە بگەڕێتەوە ئەو پێکهاتەیەی کە پێش بوونی ئەو بارەی ئێستا هەیە و بە پێی یاسای هۆکارەکان، زنجیرەی رووداوەکان و دیاردەکان بە دوای یەکتردا دێن، بوونیش هەروەك  رووداوەکان و دیاردەکان بە هەمان شێواز و دروستبوونی سیستەمی دروستبوونی دووبارە دەبێتەوە، ئیتر بەم شێوەیە سوڕی بوون بە بیٚ کۆتایی دەخولێتەوە، مادامەکینیٚ زەمەن بیٚ کۆتاییە. هەموو شتێك دەڕوات و هەموو شتێك دەگەڕێتەوە، بۆ هەمیشە چەرخی گەردون دەسوڕێتەوە، هەمووشتێك دەمرێت و زیندوودەبێتەوە، سوڕەکانی بون کۆتاییان بۆ نییە. هەمووشتێك تێکدەشکێندرێت و و سەر لەنویٚ یەکدەگرنەوە، متمانەی بوون سەرمەدیانە بە هەمان شێوە خۆی دروست دەبێتەوە[1]. ئیتر بەم شێوەیە گەڕانەوەی سەرمەدی، گوزارشت لە نەمری ئەم جیهانە دەکات کە تێیدا دەژین، ئەم جیهانە هەر ساتێك لە ساتەکانی نەمرە و  بە پێی بۆچوونی نیتشە گەڕانەوەی سەرمەدی وا لە مرۆڤ دەکات لەو مەترسیە رزگاری بێت کە لە ماوەی ژیانیدا هەڕەشەی لێدەکات، ئەو مەترسیەش مردنە.

گرنگترین ئاکامی بیرۆکەی گەڕانەوەی سەرمەدی لەوەدایە کە بەهۆی ئەو بیرۆکەیەوە مرۆڤ بەسەر زەمەندا زاڵ دەبێت، ئەوکاتەش مرۆڤ هەست بەوپەڕی ئازادی دەکات، لەبەرئەوەی

---

١ گ، رامان، ژ ٣٠، ١٩٩٨- ل١٧٦

گەورەترین و قورسترین کۆت و بەندی دەروونی مرۆڤ ئەو زەمەنەیە کە رۆیشتووە و ناگەڕێتەوە، واتە رابردووی مرۆڤ کە ئەو مرۆڤە هەستدەکات لە ئاستیدا دەستە وەستانە، بەڵام کاتێك مرۆڤ هەست بە گەڕانەوەی سەرمەدی دەکات، ئەو کاتە دەتوانێت رابردووی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، لەبەرئەوەی رێڕەوی زەمەن لە بازنەیەکی داخراودایە لە گەرانەوەی سەرمەدیدا[1] .

لە روانگەی (کیرکگارد) هەنووك و چرکەساتی ئێستا گرنگە، چونکە سەرجەم زەمەنی لەخۆدا گرتووە و جۆرێکە لە نەمری یان نازەمەنی. بە لای ئەو چرکەساتی ئێستا سەرەتای شەپۆڵی زەمەن، جا ئەگەر بەرەو رابردوو بێت یان بەرەو داهاتوو، کەواتە کیرکگارد هەنوك لە چرکە ساتدا کۆرتدەکاتەوە، هەروەها پێیوایە کە داهاتوو بریتیە لە دەرچوون(انعتاق)[2] .

زەمەن لە روانگەی شبنگلەرەوە: شبنگلەر بۆچوونی بیرمەندان لەبارەی زەمەن بە هەڵە دادەنێت، لەسەروو هەموویشیانەوە رەخنە ئاراستەی کانت دەکات، چونکە ئەو گرنگی زۆر بە کات و شوێن داوە و هۆکارێتی داوەتە پاڵیان، لەبەر ئەوەی کاتێك کانت باس لە زەمەن دەکات، هیچ ئاماژەیەکی بە ئاراستە "اتجاه" نەداوە، ئەوە چ زەمەنێکە ئاراستەی نەبێت؟[3] لای شبنگلەر زەمەن کرۆکێکی ئەندامی - زیندوو-ی تایبەتی هەیەو هەموو شتێکی زیندووش خاوەنی ژیانە یان ئاراستەیە، خاوەنی هاندان و بەخشینە. زیندوو شایستەی بەشکردن و هەڵوەشان و هەڵگەرانەوە نییە، جۆری ئەم وەسفکردنە سەر بە زەمەن و چارەنووسە. بەم جۆرە هیچ پەیوەندیەك لە نێوان زەمەن و سروشت و میکانیکیەتدا نییە، چونکە زەمەن زیندووە و سروشت و میکانیکیەت مردوون[4] .

شبنگلەر رەخنەی ئەوە لە کانت دەگرێت کە چەمکی زەمەنی شێواندوە، چونکە بەستویەتیەوە بە مێریایەوە بەو هۆیەوە چییەتی زەمەن بە تێنەگەیشتوویی ماوەتەوە و ئاراستسەشی لێ داڕنیوە، شبنگلەر پێیوایە کانت توانیویەتی بەڵگەی باش پێشکشە بکات لە پەیوەنی نێوان بۆشایی و ئەندازیاریدا، بەڵام دوور دەکەوێتەوە لە وێنەی ئەو بەڵگە هێنانەوە لە پەیوەندی نێوان زەمەن ژمێریاری یان ماتماتیکز شبنگلەر ئەو تێکەڵکردنە میتۆدی کانت لە

---

١ گ، رامان، ژ ٣٠، ١٩٩٨- ل ١٧٨

٢ ماهو الكون؟ - تاليف، المهندس، فايز العادة- دار علاء الدين، سوريا، ٢٠١٠- - ل ٩٨

٣ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر -ل ٧٦

٤ فە لسەفەی مێژوو لای شبنگلەر —ل ٧٧

نێوان زەمەن و بۆشایی (شوێن)دا کردوویەتی بە مەترسیدار دادەنێت. شبنگلەر بڕوای وایە، زەمەن بریتیە لە ۆرێك لە تەلیسم و جادوو، شتێکی خودییە، شتێکی ئەوتۆیە لەناو هەریەك لە ئێمەدا هەیە. خوێتی و چارەنوس و زەمەن وشەگەلێکن، هەر یەك لەو وشانە لە جێگەی ئەویتریان دابنرێن دروستە، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە شبنگلەر دەیەوێت زەمەن وەسفبکات، بەوەی شتێکی خودیە و بەستراوەتەوە بە کەسێتیەوە، کە هەموو خودێك لەناوخۆیدا هەڵیگرتووە، بەڵام کاتێك کە زەمەن بە جادوو و تەلیسم ناودەبات، دەبینیە نزیکە لە (ئۆگستین) کە سەرسورمان و بێتوانایی خۆی پیشاندەدات لەمەڕ زەمەن. ئەوەی شبنگلەر مەبەستیەتی لەبارەی زەمەنەوە وێنای بکات وێناکردنێکی زیندووە و دەیەوێت زەمەن لە چوارچێوەی شتە زیندووەکاندا بهێڵێتەوە، بۆ نموونە کاتێك شبنگلەر باس لەوە دەکات کە زەمەن بە روونی لە مۆسیقا و شیعردا دەردەکەوێت، گوزارشتە لەوەی زەمەن لە چوارچێوەی شتە زیندووەکاندا بهێڵێتەوە، چونکە مۆسیقا و شیعر لای ئەو زیندوویێتی دەنوێنن[1]. شبنگلەر پێی وایە هەوڵی تێگەیشتن لە زەمەن لەلایەن بیرمەندانو لە هەوڵی مرۆڤی سەرەتایی دەچێتن بۆ زاڵبوون بەسەر هێزە خراپەکارەکاندی لە رێگەی جادوو و ناولێنانیانەوە، ترسی بیریاران و فەیلەسوفان لە نهێنی زەمەن، وایلێکردون ناو وپێوەری بۆ دابنێن تا لە رێگەیەوە زاڵبن بە سەریدا[2] شبنگلەر لەناو ئەو هەموو تێڕوانینانەی بۆ زەمەن کراوە، بەچاوێکی رێزەوە سەیری بۆچونی ئۆگستین دەکات و بەقوڵترین بۆچون وەسفی دەکات لەبارەی زەمەنەوە، کە دەڵێت: " ئەگەر هیچ کەس لێم نەپرسێت دەزانم، بەڵام ئەگەر لەسەرم بێت پرسیارەکە شی بکەوە ئەوا نازانم"[3] ئەمەش مانای هەستکردنێکی خودییە بە زەمەن، شبنگلەر لەمەدا لە ئۆگستین نزیکە وەك لە هەر کەسێکی تر.

(گادامیر)یش کە فەیلەسوفێکی فەرەنسیە، یەکێکە لەوانەی بەوردی پەیوەندی نێوان زەمەن و دەرکەوتە جیاوازەکانی مانای دەستنیشانکرد، زەمەنە جیاوازەکان لە یەك دیاردەدا مانای جیاواز دەدۆزنەوە. جوودایی ساتەکان، واتە گۆڕانی رەهای پەیوەندی و جەوهەرەکان، جودایی ساتەکان کرانەوەی گۆڕانەکانە بە جۆرێك تەنها لە رێگەی چرکەی تایبەتەوە لای ئێمە

١ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر — ل ٧٩

٢ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل٧٩

٣ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر — ل ٨٠

بەرجەستە بن. چرکەیەك کە لە گێرفانی چرکەی پێشوەوە نەهاتۆتە دەرێ، بەڵکو لە ڕێگەی دابڕانێکەوە لە نێوان ئەم چرکەدا و ئەوەی دیکە هاتۆتە دەرێ، واتە ئەوەی ئێستا کە دەیزانیین دابڕانێکە لەوەی کە دەمانزانی[1].

بە باوەڕی (پۆل ریکۆر)یش گێڕانەوە ڕەسەنترین شێوەی ڕووبەڕووبونەوەیە لەگەڵ زەمەن، چونکەبیرکردنەوەی رووت (ئەبستراکت) هەرگیز توانای ئەوەی نییە، گرێ پوچەکانی زەمەن بکاتەوە، کەواتە لە ڕوانگەی ریکۆرەوە ئەدەبی داستانی (بە تایبەتی رۆمان) بە پشت بەستن بە گێڕانەوە"ئەزمونە زەمەنیە ئاڵۆزو بێ سەرو بەرو تەمومژاویەکانی مرۆڤ سەر لە نوێ دادەڕێژتەوە و ڕێکوپێکیان دەکاتەوە، بەم پێوەدانگە بێ لە ڕێگەی گێڕانەوە و پەیوەندییەکی دوو جەمسەری لە نێوان ئەززموونی مرۆڤ و زەمەندا پێکدێ، یان بابڵێین گێرانەوەبریتیە لە: "تایبەتمەندیی زەمەنی ئەزمونگەلی مرۆیی"[2] .

هەروەها جان لاك دەڵێ: شوناسی تاکە کەس بریتیە لەشوناسی ئەو زاتە خودئاگایەی کە لە ڕێگەی بەردەوامبوون لە نێو بەستێنی زەمەندا دەکەوێتە گەڕ. بە وتەکەیەکی تر تاك بە هۆی ئەو بیروباوەرەی کە لە ئەندێشەو ئاکاری ڕابردووی خۆیدا هەیەتی، پێوەندی بە شوناسی بەردەوامی خۆیەوە دەبێ[3].

هەرچەندە ناتوانین ڕابردوو بگەڕێنینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەدەستی نادەین، شەپۆڵی زەمەن بە بێ ویستی ئێمە دوریخستوینەتەوە لە ڕابردوو و بۆ ئەوەی لە مرۆڤ تێبگەین، ئەوا پێویستە ڕابردوولەیاد و فەرامۆش نەکەین، لەبەرئەوەی ڕابردوو مەزنترین گەنجینەی ئەزموونەکانی مرۆییە، بۆیە ناتوانیین دەستبەرداری بین. بۆیە ئەرکی مێژوو ڕوونکردنەوەوی گۆشە تاریکەکانی واقیعی ڕابردووە، هەروەها لە هەر چرکە ساتێکی زەمەندا هەڵی دۆزینەوەی "پاژێکی نەناسراوی بوون" دەرەخسێنێ و ئەم زنجیرە دۆزینەوانە دنیای ژیان تیشك پڕژێن دەکەن. کەواتە مێژوو لە سەر دوو ڕەگەزی "ڕابردوو" و "واقیع" یان ئاوێتەیەك لەم دوو ڕەگەزە پێ دادەگرێ[4]. واتە مێژوو دەخوازێ "هەنووکەی بون" مان بسڕێتەوە و بە نێو

---

١ رەرهەند - ژمارە-٦ - ل١٦

٢ گ رامان ژ- ٧٥ — ل ٣٠

٣ گ رامان ژ- ٧٥ — ل ٣١

٤ گ رامان ژ- ٧٥ — ل ٣٢

دالآنەکانی رابردوودا سەفەر بکەین. لەم باسەدا دوای ئەوەی رۆشنایەکی خێرامان خستە سەر روانین ودیدی فەیلەسوفان سەبارەت بە چەمکی زەمەن و رەهەندەکانی، بۆمان روونبۆوە کە فەیلەسوفان، کۆك نین لەسەر مانای یەکی دیاریکراو بۆ زەمەن، بەڵکو روانینی جیاوازیان هەیە سە بارەت بە ماناو دەلالەتی چەمکی زەمەن.

**- زەمەن لای بوونگەراکان:**

لە فەلسەفەی بوونگەراییدا دەروازەیەکی نوێ و جیاواز و فراوان بە رووی لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی زەمەن کرایەوە، هەر فەیلەسوفێك لە رەهەندێکی دیاریکراوە بە دوای واتای زەمەندا دەگەڕا. لە راستیدا زەمەن لە فەلسەفەی بوونگەراییدا رۆڵێکی زۆر تایبەت دەبینێت و بە رەهەندێکی چوارەم ناژمێردرێ کە بخرێتە سەر سێ رەهەندەکەی دیکەی شوێن.

لە روانگەی بوونگەراکان زەمەن لە دایکبوون و و مەرگ و سەرەتا و کۆتایی هەموو بونەوەرێکی مرۆیی دیاری دەکات و بوونی مرۆیی خۆی ئەکەوێتە نێوان ئەم سنورانەوە لە زەمەندا و هەر ساتێك لە ساتەکانی" ئیمکان و واقعیبوون و کەوتن" ئاماژە بۆ زەمەن دەکەن[1]. ئیمکان لە بنەڕەتدا ئاماژە بۆ ئایندە دەکات، واقعیبوون پەیوەستە بەوەی کە لە هەڵوێستی دراودا بە ئەنجام گەیەنراوە، لە کاتێکدا کەوتن واتە نقومبوون لە هەنووکەدا[2]. بە دوایەکداهاتن خۆی نیشانەیە بۆ ئەزموونێکی کۆتادار. مرۆڤ کاردەکات و چێژ دەبینێت و لە ساتێکی دیاریکراودا شتێك فێردەبێت و ئەم ئەزمونەشی بە هێڵێکی راستدا دەڕوات و لە رەوتی ژیاندا و لە هەندێك کاتی جیاوازدا هێز وتواناکانی ئەگاتە لوتکە، بولام هەرگیز ئەمانە لەیەك کاتدا بەیکەوە نابن[3]. بەڵام ئەزمونی مرۆڤقی تەنها بەدوایەکداهاتن نییە،زەماندیی مرۆڤ جۆرێکی تایبەتەتیە، جیاوازیەکی گەورەش هەیە لە نێوان پەیوەندی مرۆڤ بە زەمەنەوە لەگەڵ پەیوەندی گیانەوەرەکانن و شتەکان بە زەمەنەوە. راستە بە مانایەك لە ماناکان دەتوانیین بڵێین ئەوانیش لەناو زەمەندان و بە ساتی زەمانی بەدوای یەکدا هاتوودا تێدەپەڕن. بەڵام "شت" لە کاتی بەدوایەکداهاتنی چرکە ساتەکاندا وەکو خۆی بەردەوام ئەبێت و هەریەك

---

١ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٠١

٢ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٠٢

٣ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٠٢

لەو چرکەساتانەی رابردوو وئایندەی لە دەرەوەی ئێستادا دەمێننەوە. بەڵام لای مرۆڤ رابردوو و ئایندەی تەواو بە ئێستایەوە بەستراونەتەوە، چونکە ئێمە هەرگیز ناتوانیین مرۆڤ تەنها بە دابڕاوی لە ئێستادا وەربگرین، چونکە مرۆڤ لە رێی یادیەوە لە ئێستادا رابردووی هەڵگرتووە، هەروەها لە رێی پێشبینی و خەیاڵەوە، ئایندەی خۆی وێنا دەکات[1].

بە دیدی بوونگەراکان، ئێمە نەماندەتوانی هەبین، ئەگەر سیفەتی زەمەنمەندی مان نەبوایە، کە بە هۆیەوە، ئێستا تێدەپەڕێنین و تارادەیەك رابردوو و ئێستا و ئاینده پێکەوە کۆدەکەینەوە. کاتێك دەڵێین مرۆڤ لە زەمەنمەندیی "خەم" پێکدێ، واتە بە ئاراستەی ئیمکاندا خۆی بەرەو پێشەوە فرێدەدات. ئەمەش واتە لە دەرەوەی بونی خۆیدایە بەرەو ئایندە. کەواتە ئێمە ئەزمونە ریشەیەکەی کۆتابونی زەمەنوەندیمان بە تەنها لە بەدوایەکدا هاتندا نابینینەوە، بەڵکو لە گرژیی نێوان رەهەندەکانی زەمەنمەندیدا، یان بە چوون بەرەو کەماڵی کە دەشێ رابردوو و ئێستا و ئاینده لە خۆیدا کۆبکاتەوە، دەشێ ئەمەش بەوە وەسفبکرێ کە هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە هەتاهەتایی[2].

بە رای کیرکگۆر ئە و چرکە ساتەی کە تیایدا مرۆڤ لەبەردەمی خودا دا دەوەستێت، ئەو چرکە ساتەی تیایدا ئەزەلی لەگەڵ زەمەندا پێکدادێن، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئیماندار لە زەمەن قوتار بوە، بەڵکو واتە رەهەندێکی ئەزەلی لە ژیانیدا هەیە. هەروەکو مارتن ج هاینکن ئەڵێت" تاکە کەس لە بونیدا پێکهاتەیەکە لە زەمەن و لە ئەزەلی و بەردەوام لە پرۆسەی دروستبوندایە، تابیێت بەوەی کە دەبێت"[3]

بەم جۆرە بە بۆچوونی کیرکگۆر، ئێمە لەو چرکە ساتەدا بوونی رەسەن بەدی دەهێنیین کە لەبەردەم خوادایین. بەرامبەر ئەم تێڕوانینەی کیرکگۆر تێروانینی هایدگەر هەیە کە دەڵێت: چرکە ساتی گرنگ چرکە ساتی "رووبەڕووبونەوەمان نییە لە ئاست خودادا" بەڵکو رووبەڕووبونەوەمانە لە ئاست مەرگدا[4].

هەردوو دەستەواژەکە هێمایان بۆ کۆتابوون تێدایە، بەڵام ئەو ئەزەلیەتەی کە زەمەن تێدەپەڕێنێت و کیرکگۆر لێی دواوە، لای هایدگەر دەبێت بە جۆرێك لە ئەزەلیەت لە ناو

---

١ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٠٢

٢ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٠٣

٣ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٢٨

٤ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٢٩

زەمەندا. ئەو چرکە ساتەی کە لە هەمان کاتدا و لە یەك ویستمەندی خودادا  رابردوو و ئێستا و ئایندە کۆدەبێتەوە[1].

هایدگەر بڕوای وایە، کە تەنها مرۆڤ خۆی مێژوویە، سروشت مێژوویی نییە. کرۆکی زەمەنیش وەك هیراکلیتس ئاماژەی پێداوە، بریتی نییە لە بەردەوامی، بەڵکو گۆڕانە. ژیانیش گوزەران ناکرێ واتە تێرو تەواو نابێ، تا زەمەن تێدا نەوەستێ، یان بە دەربڕینێکی تر تا مردن ناوەڕۆکەکەی خۆی نەسەلمێنێ، کەسی هاوچەرخ خاوەنی مێژووە،لەبەر ئەوەی رابردووی هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی سەبارەت بەمن زەمەن ئامادەیە من سەر بە ئایندە وشیاو (پۆسیبڵ-مومکین)ئەبم[2].

هەروەها بە گوێرەی هایدگەر، هەنووکەیی چرکە ساتێکە لە رابردوویەکی کەڵەکەبوودا، بۆیە مێژوویەتی کارەکتەر رابردوویەکە بە ئێستا پەیوەستە. بوون لای هایدگەر بریتیە لە کات، و بابەتە وروژێنەرەکە بەلای هایدگەرەوە بریتیە لە پەیوەندی مرۆڤ بە کاتەوە، بەوەدا مرۆڤ دەتوانێت کات بناسێت و هەست بە تێپەرینی کات بەلای خۆیدا دەکات، ئەوە ناچاری دەکات بیر لە داهاتوو بکاتەوە و خۆی بە کراوەیی راگرێت. سەبارەت بە تاکەکان  ئاسۆی ئایندە، هەمیشە بریتیە لە ئاسۆی کۆتاداری، لە خۆشی و ناخۆشیدا مرۆگەل بە کۆمەڵ بەشدارن، بەڵم بە تەنیا لە مەرگی تاکانەیاندا تەنیا هەن[3].

هایدگەر زەمەن یەکسان دەکات بە بوون، زەمەن چۆنیەتییە، پانتایی نییە تا مرۆڤی تێدا بێت بەڵکو بوونی مرۆڤ خۆی زەمەنە و وەك خۆی نامێنێتەوە و دەبێت کۆتایی پێبێت[4]. هایدگەر، بڕوای وایە کە زەمەن پانتایی نییە تاکو مرۆڤی تێدابێت، بەڵکو بوونی مرۆڤ زەمەنە، یان بوونێکی بڕاوە و دینامیکیە، کە هەر گیز وەکو خۆی نامێنێتەوە و کۆتاییشی پێدێت[5].   واتە لای هایدگەر (بوون) زەمەنە، لەبەرئەمەشە هایدگەر شاکارە فەلسەفیەکەی بە (بوون و زەمەن) داناوە، توێژینەووە لەسەر (بوون) هاوکات، لەسەر (زەمەن)یشە[6]. بە دیدی هایدگەر دامەزراندنی پڕۆژەکانی بوون و ناسینی

---

١ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٢٩

٢ گ- ئایدیا، ژمارە ٨-٩- ل١٩٣

٣ رەهەند، ژ ١٩- ١٨- ل٢٩١

٤ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر — ل ٧٥

٥ فةلسةفةي بوونطةرايي — جؤن ماكواري- ل ١٣٥

٦ هایدیگەر، د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧-ل ١٥١

راستیەکانی بوون بەرزێتیە، چونکە مرۆڤ بۆ دامەزراندنی پڕۆژەکانی (ئێستا) بە جێدەهێلێت و خۆی بۆ بە داهاتوو دەگەیەنێت. لەبەر ئەمە هایدگەر بوونی مرۆڤ و زەمەن لەیەکدی جیاناکاتەوە و لەو باوەڕەشدایە لە تێگەیشتنمان لە بوونی مرۆڤ لە واتای (زەمەن) یش دەگەین، جیاوازی نێوان زەمەنی مرۆڤ و زەمەنی هەبووەکان (زەمەنی فیزیکی) لە سێ خاڵدا کۆدەبنەوە. یەکەم، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئاگامەندە، بە ئاگاییەوە روو لە داهاتوو دەکات و خۆی بەو داهاتووە دەگەیەنێت، کەچی هەبووەکان لەم رووبەرووبونەوە ئاگامەندانە بێبەشن. نەمانی درەختێك بێ ئاگابوون لە پرۆسەی گەشەکردنو گەورەدەبێت، بەردەگرێت، پیردەبێت و وشکدەکات. مرۆڤ بە پێچەوانەوەی نەمامەکەوە، بە ئاگاوە بەرەو دامەزراندنی پرۆرژەکانی دەروات و بەرەوکۆتایی دەکەوێتەرێ. دووەم، پرۆسەی گۆرانکاریەکانی بوونی مرۆڤ، کە پرۆسەی زەمەنییە،ئەم بوونە بە بەردەوای دەوڵەمەندو پڕتردەکات. پرۆسەیەکە مرۆڤ لە هەژاری بوونەوە بە دەوڵەمەندی دەگەیەنێت و کەلەبەری (نەبوون) ییەکانی پڕدەکاتەوە. سێیەم، زەمەن لە بوونی مرۆڤدا بەردەوامییە و ساتەکانی پارچە ناکرێن. بەردەوامیەکە (ئێستا)ی تیادا دەبێت بە (رابردوو) و (داهاتو)شی بە (ئێستا) . واتە (رابردوو)، (ئێستا) و (داهاتو)ی زنجیرەیەکی نەپچڕاون. ئەم سێ جیاوازیانەی نێوان زەمەن لە بونی مرۆڤدا و زەمەن بۆ سروشت (هەبووەکان) وابەستەن بەو جیاوازیە بنەڕەتیەی نێوان سروشت و مێژوو[1] .

بە بۆچوونی هایدگەر، بوونەوەری مرۆیی، لە رووی مێژووییەوە، تەنها بە هۆی زەمەنەوە مومکین دەبێت، زەمەنیش خۆی لە یەکەیەکی ئاسۆییدا بە زەمەن دەکات کە بەلای خۆیدا رایدەکێشێت، بوونەوەری مرۆیی کاتێك رەسەن دەبێت کە بوونەوەرێکی ئایندەیی بێت لە کەشفکردنی ویستمەندی ئەو ئیمکانەدا کە هەڵیبژاردوە[2]. لەبەرئەوەی بوونەوەری مرۆیی بە شێوازێك خۆی ئەخاتە زەمەنەوە کە تیایدا (رابردوو) و (داهاتو) لە ئێستادا دەبن بەیەك، ئێستاش پەردە لەسەر رووی رەسەنایەتی "ئەمرۆ" هەڵدەماڵێت بە پێیەی چرکەساتی بینینە.

دەکرێ بڵێین کاتی ئێستا خاڵی بەیەکگەیشتنی نێوان دوو رەهەندەکەی دیکەی زەمەنە کە رابردوو وداهاتووە، بۆیە هەموو چرکەیەك لە ئەزموون بەو پێیە گواستنەوەیەکە لە نێوان دوو جیهاندا، رابردووی هاوڕێ و داهاتووی هاوڕێ گوزارشت لە خۆی دەکات[3] .

---

١ هایدیگەر، د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧- ل ١٥٤

٢ فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- ل ٣٤٨

٣ هایدیگەر، د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧- ل١٤٨

بێگومان دابەشکردنی زەمەن بۆ (رابردوو)و (ئێستا) و (داهاتو) کارێکی ریژەییە، واتە سەبارەت بە مرۆڤە بە تەنها، بەڵام سەبارەت بە زەمەنی رەها ئەوا ئەو سنوورانە لە کوێدان کە جیاوازی لە نێوان ئەوەدا دەکات، کە ناومان لێناوە رابردوو و ئێستا و داهاتو؟

ئەو رابردوە کامەیە سەبارەت بە ئێمە لە کاتێکدا هەنوکەیی بووە بۆ هاوسەردەمەکانی پێش ئێمە؟ هاوکات ئەو داهاتووە بووە سەبارەت بەوانەی پێشە خۆی، تەنانەت ئەو ئێستایەی کە ئێمە ژیانی تێدا دەگوزەرێنین، ئەوە سبەینێ هەر بۆ ئێمە دەبێتە رابردوو، داهاتووس نادیاریش دەبێتە رابردوو سەبارەت بەوانەی کە مردن[1].

لەمەڕ پەیوەندی نێوان مرۆڤ و کات، شیکردنەوەی هایدگەرلەم پنتەدا بریتیە لەوەی کە ئەو هەڵهاتنی لە کات وەکو وێرانە باس کردوە، مرۆگەلی ئەمرۆ سێ چارەکی کاتی بە ئاگایی خۆیان لەبەردەم تەلەفزیۆندا بەسەر دەبەن و ترسی ئەوەشی هەیە کەوا ئەگەر تەلەفزیۆنەکە کوژایەوە ئیدی شتێکی تر لەوێدا بۆ مرۆڤ نییە، ئەمەش ترس و نیگەرانیەکی تەواوە. هەرچەندە کەسانێکی زۆر کەم هەن کە کە خۆیان دان بەوەدا بنێن کەوا ئەوان لە کات هەڵدێن، رەنگە هۆکاری ئەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ خۆی نا ئومێد ناکات

- فەیلەسوفی ناسراوی فەرەنسی (ژان پۆل سارتەر) سەبارەت بە رەهەندەکانی زەمەن، دەڵێ: " ئەوە هەر ئایندەیە بڕیاردەداتو کە ئایا رابردوو زیندووە یان مردووە" ئایندە ئازادییە، بە پێی پێناسەی ئەنتۆلۆژیانەش ئایندە پلانە، هەمیشە گۆڕاوەکە و پێشبینیەکانی ئێمەیە لە بواری کارو و خاوەنداریەتی و کەینونەدا[2]، کەواتە (رابردوو) لە راستیدا لە پلانێك و پێشبینیەکی بەرەو ئایندە بەولاوە چیدیکە نییە، کاتێکیش کە ئایندە دێتە کایەی (بوون)وە، دەچێتە رابردووشەوە و دەبێتە ئەو مادەیەی کە مێژووی لێ دروستدەکرێ، ئەمە بنچینەی روانینی بوونگەرایانەیە بۆ مێژوو و زەمەن.

سارتەر دەڵێ: " لە دوایین سنووردا، لە چرکساتی ناکۆتا بچوکی مردنما، لە رابردوو بەولاوە چیدیکە نابینم" .

- لە روانگەی (کارل یاسپرس)وە، رابردو بۆ ئێمە نەزانراوە و ئایندەش تاریك، ئەوەی مومکینە رۆشن بنوێنێت و روون بێت کاتی ئێستایە کە تیایدا دەژین، بەڵام هەر ئەم کاتەی

---

١ هایدیگەر، د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧- ل ١٤٨

٢ گ،ئایدیا، ژمارە ٨-٩، ل ١٩٣

ئێستاش نەزانراو و داپۆشراوە، لەبەر ئەوە لە کاتێکدا دەتوانین بە رۆشن بیبینین کە سەبارەت بە رابردوە کە پایە و بنەمایەتی و ئایندەش تیایدا شاردراوەتەوە زانیاری تەواومان هەبێت[1].

ئەوەی جێگای سەرەنجە لێرەدا، کە فەیلەسوفە وجودی وبوونگەرایەکان، جەخت لە گرنگی زەمەن دەکەنەوە و بروایان وایە کە بوون لە خودی خۆیدا بونێکی زەمەنیە، هەروەك سارتەر، بڕوای وایە کە سروشت مرۆییە و زەمەن مرۆییە و لە دەستدانیان، لە دەستدانی مرۆڤە، و هەستنەکردن بە زەمەن هەستنەکردنە بە سیایەت و مێژوو، ئەو کەسەی زەمەن دورخاتەوە، ئەوا خۆی لە سیاسەت جیادەکاتەوە.

داننان بە راستی و سروشتی و سەربەخۆیی زەمەن، مانای داننانە بە مرۆڤی واقیعی و رۆڵی ئەو مرۆڤە لە مێژوو و سیاسەتدا.

- بیرمەندی گەورەی میسری (عەبدولرەحمان بەدەوی)یش کە نامەی دکتۆرایەکەی لەسەر زەمەن بوو کە بە ناوی (زەمەنی بوونی) بوو، پێیوایە، زەمەن لە جەوهەردا چۆنیەتیەکی پەتیە، هیچ شتیێ لە رێساکانی چەند(کمیە)ی بەسەردا جێبەجێ ناکرێت، لەبەر ئەوە هیچ گونجانێك لە نێوان بەشەکانیدا نییە و بێگومان هەموو ساتێك لە ساتەکانی دیکە جیاوازیەکی تەواویان لە نێواندایە، جائەوە بونێکی بێ چەندێتیە و پەتی نییە[2].

بیرۆکەی سەرەکی سەبارەت بە زەمەن لای بەدەوی ئەوەیە: بوون تەنها لە سەر بنەماو بنچینەی زەمەن راڤەدەکرێت. لای ئەو دوو جۆرە زەمەن هەیە، زەمەنی رەها، زەمەنی موعەین. یەکەمیان بەوە جیادەکرێتەوە کە زروانینمان بۆ رەها گشتیە و ئەو زەمەنە سنووردارنییە[3]، (بەدەوی لە کتێبی "زەمەنی وجودی"دا زەمەن دەکاتە دوو جۆر، زەمەنی وجودی، زەمەنی خودی. ئەو پێیوایە، کە گرفتی زەمەن پەیوەندیەکی بەهێزی بە گرفتی بوونەوە هەیە. (بوون)یش لای ئەو بوونی خود، بوونی بابەت، بوونی رەسەن لای مرۆڤ، بوونی خودە یان خودی تاکە. بوونی (بابەت)یش هەموو بونەکانی دیکەیە جگە لە خود. بەدەوی پێیوایە، کە هەموو بونێك پەیوەستە بە زەمەنەوە و زەمەن نهێنی (التناهی)یە، واتە هەموو

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣،- ل ٢٥١

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣ — ل ١٤٥

٣ مجلە- دراسات فلسفیە- عدد-٤- سنە، ١٩٩٩- بغداد- ل ٤٦

بونێك بۆ فەنابوون و لەناوچوونە، بەڵام فەنابوون جیٚ بەجیٚكردنی ئیمكانە، و هەموو تەحقیق و جیٚ بەجیٚكردنێك كارە، (كار)یش خەڵقكردنە، كەواتە (التناهی) داهیٚنەر و ئافریٚنەرە[١].

بەدەوی بڕوای وایە، كە هەر لایەنێك لە لایەنەكانی بوون ئاماژە بە تابع و سروشتێكی زەمەنی دەكات، كە وەك زەرورەت وپێویستیەك لە ناواخنی بووندایە. واتە زەمەن سروشتێكی رەسەن و گەوهەرییە بۆ بوون، چۆنیەتیەكەی و بارەكانی بوون دیار و دەستنیشاندەكات[٢]. لێرەدا بە روونی دەردەكەوێت، كە زەمەن لای ئەو فاكتەر و هۆكاری سەرەكی و بنەرەتیە لە پێكهێنانی بووندا، بۆیە بڕواشی وایە پێویستە زەمەن بچێتە ناو هەموو دابەشكردنی فرمان و بڕیارەكان، كە بە ئاشكرا گوزارشت لە بوون بكات.

واتە بەدەوی لە میانی رێبازەكەیدا دەگاتە دوو ئاكام، یەكەمیان: هیچ بوونێك نییە، بە بیٚ زەمەن و بوونەكان تەنها لە ناو زەمەندا هەن و هەر شتێك زەمەنی نەبێت بوونی نییە. دووەم: هەموو ئان (ان)ێك، لە ئان و ساتەكانی زەمەنكۆك و گونجاوە بە سروشتێكی وجودی، عاتفی و سۆزی، واتە زەمەن پێكهاتەیەكی چەندی نییە، بەڵكو چۆنیەتیە[٣].

لێرەدا دەردەكەوێت، كە بەدەوی لە میانی روانگە و رێبازەكەی سەبارەت بە (زەمەن و بوون) هەوڵیداوە ئەنجامێكی گرنگ بسەلمێنیٚ، ئەویش ئەوەیە: زەمەن فاكتەرێكی گەوهەریە لە پێكهاتەی بوندا، هەروەها بنچینە و مەرجی بوونە، بۆیە هەر لەم روانگەیەوە، هەوڵیداوە، بارەكانی بوون وەك (خەلق، نیگەرانی) راڤە و شیبكاتەوە[٤].

لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت لە روانگەی ئەم فەلسەفەیە، هەموو مرۆڤێك لە كات و زەمەنێكی دیاریكراودا كە تایبەتە بە خودی خۆیەوە لە مەیدانی ژیاندا بوونی هەیە، واتە هەموو مرۆڤێك وەك چۆنتەمەنێكی دیاریكراوی هەیە، بەو جۆرەش ئەو تەمەنە پەیوەستە بە خۆیەوە واتە پیشاندان و دەركەوتنی سیفەتەكانی هەر مرۆڤێك لە تەمەنی خۆیدا جیاوازە لە كەسێكی دی.

زەمەن سروشتێكی رەسەن و گەوهەرییە بۆ بوون و چۆنیەتیەكەی و بارودۆخ و باری بوون دیار و دەست نیشان دەكات، هەروەها فاكتەرو هۆكاری سەرەكی و بنەڕەتیە لە پێكهێنانی بووندا.

---

١ مجلة- دراسات فلسفية- عدد-٤- سنة، ١٩٩٩- بغداد- ٥٢

٢ مجلة- دراسات فلسفية- عدد-٤- سنة، ١٩٩٩- بغداد- ل ٥٣

٣ مجلة- دراسات فلسفية- عدد-٤- سنة، ١٩٩٩- بغداد- ٥٥

٤ مجلة- دراسات فلسفية- عدد-٤- سنة، ١٩٩٩- بغداد- ل ٥٤

بۆیە هایدگەر، (بوون) لە (زەمەن) جیاناکاتەوە و بە دینامیکی دادەنێت. بەم رووەوە هایدگەر لە گەڵ بۆچوونە ئۆنتۆ لۆجیەکەی ئەریستۆ ناکۆکە، چونکە ئەرستۆ بوونی، وەکو پرنسیپالی یەکەم لە ناو بازنەی زەمەندا دەرهێناوە و بە نەگۆڕی داناوە[١].

لێرەدا بوونی مرۆڤ، کە مێژوویە و و زەمەن و گۆڕانکارییەکان حوکم بەسەریدا دەدەن، بوونی مرۆڤ لەبەرئەوەی لە نەبوونەوە و بەرەو نەبوونی دەروات و هەوڵی خۆتەواوکردن دەدات (کات)یەو شتێکی نەبڕاو وهەمیشەیی نییە. بەبەردەوامی ئێستا دەکات بە رابردوو و بەرەو داهاتووش لە پێناوی وەدەستهێنانی پرۆژەکانی رەوتدەکات و بوونێکە لەرابردوودا ناژی و(ئێستا)ی کورت نەفەسە و چاو لە داهاتوو دەبڕێ، بوونێکە بۆ تەواوکردنی خۆی بەرەو داهاتوو دەڕوا و لە هیچ وێستگەیەکی (ئێستا)دا خۆی راناگرێت[٢].

زەمەنی ئەم بوونە راستەوخۆ پەیوەندی بە رەسەنیەتی ئەم بوونەوە هەیە، رەسەنیەتیش بەخۆ بوون و داهێنانی پرۆژەکانە. بوونی رەسەن داهێنەری ناوەڕۆکی خۆیەتی و دەبێت بەوەی بۆخۆی دەیخوازێ. ئەگەر مرۆڤێك توانای داهێنانی ناوەڕۆکی خۆی نەبێت نارەسەنە، داهێنانی ناوەڕۆکیش لە پرۆسە بەردەوامیەکەیدا لە ناو زەمەن و کاتدایە و لە هیچ قۆناخێکی ژیاندا ناوەستێت و کۆتایی بە گەشتەکەی ناهێنێت. زەمەن بۆ ئەم بوونە بەردەوامییە و ڕەوت بەرەو داهاتوو. لەم بەردەوامیەدا مرۆڤ هەر پرۆژەیەك بەئەنجام بگەیەنێت، ئەوا ئەو پرۆژەیە داهێنانی خۆیەتی و نابێت نکۆڵی لێ بکات. نکۆڵی کردن لە پرۆژەکانی بوون چ لە رابردوو یان لە داهاتوو، مرۆڤ تووشی نارەسەنی دەکات[٣].

رابردووی ئەو چەند تاڵ بێت هێشتا رابردوی ئەوە و ئەو هێناویەتە کایەوە. نکۆڵی کردن لە داهاتووش لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە مرۆڤ بە ناچاری دەژی و خۆی بندەستی دەسەڵاتێکی دەرەکی دەکات. بوونی رەسەن خاوەنی رابردوو و ئێستا و داهاتووی خۆیەتی و بوونێکی زەمەنی و مێژووییە. بیرکردنەوەی فەلسەفی ئێمە لە (کات) باسی کاتی مرۆڤ یان ئاگامەندی زەمەن دەکات. زەمەن خولەی زەوی بە دەوری رۆژدا و چرکەکانی ژماردنی کاتە فیزیکیەکە نییە، بەڵکو تەوژمێکی نەپچڕاو و بەردەوامی ئاگامەندییە. زەمەن لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندی دایە، ئاگامەندی هەرچ ئەزمونێکی

١ بوون و داهێنان- محمد کمال- سێمانی – ٢٠٠٤- دەزگا و پەخشی سەردەم-ل٤٠

٢ بوون و داهێنان- -ل٨٢

٣ بوون و داهێنان- ل٤٨

هەبێت لە ناو کات و شوێندا ڕوودەدات و بە ئەنجام دەگەینرێت چونکە ئەم بوونە ناتەواوە و هەوڵی گەیشتن بە تەواوکۆیی دەدات. زەمەن کاتی مرۆڤانەیە و خولەی بوونی مرۆڤە[1].

مادامەکی بوونی مرۆڤ لە بنەرەتدا لەواتا بەدەر و بێ مەبەستە و ناوەڕۆکی پێشتری پێنەدراەوە، ئەوا خۆ-تەواوکردن یان ڕەوتی بونی بەرەوتەواوکۆیی پێویستیەکی ئەنتۆلۆجی یە، بەڵام نابێ ئەوە ئەو خاڵە سەرەکیە لەبیربکەین، کە مرۆڤ بونێکی (کاتی)ی هەیە و بڕاوەیە و کۆتایی دێت[2].

بوون و مردن تەواوکەری یەکدین و لەبەرئەوەی هەیە دەبێ بمرێت یان ئەو دەمرێت چونکە هەیە. (زەمەن)یەتی بوونی سەرەتا و کۆتایی لە بوونیدا پەیدا دەکات و شێوازێکی مێژوویی بە بەریدا دەکات، واتە مرۆڤ هەوڵدەدات خۆی بە دوا پلەی گەشەکردن و خۆ-تەواوکردن بگەیەنێت[3].

بە دیتنی هایگەر مرۆڤ بونێك نییە لە دەرەوەی گۆڕانکاریەکانی ناو مێژوودا بێ و وەك تەماشاکەرێك بڕوانێتە مێژوو. ئەو بوونێکی زەمەنی و مێژووی هەیە و مێژووش چیرۆکی بونی ئەوە. بوونی مرۆڤ لە ناو جیهاندا، سێ لایەنی گرنگی ئەم بوونە ڕووندەکاتەوە: جیهانگەری و کۆمەڵگەری و زەمەنیەتی بوونی[4]. ژیان و مردنی مرۆڤ لە ناو جیهاندایە و پرۆژەکانی بوونیش لێرە (لەناو جیهان)دا بە ئەنجام دەدرێن. مرۆڤیش لەناو جیهاندا تەنیا نییە و لەگەڵ کەسانی دیکە دایە و ئەوانیش پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجین بۆ بوونی. تایبەتمەندی ناوەکی و مەعنەویەکانی زۆربەی دیاردەکان، لە جەوهەردا ڕەگیان لە زەمەندا داکوتاوە.

کەواتە، زەمەن مەرجی بوونە لای هەر مرۆڤێك، هەروەها مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگەی زەمەن وکاتەوە، وەك کەسێتیەك خۆی بناسێت و ئەو کاتەی کە تاك تیایدا دەژی، دەرفەتی ئەوەی پێدەدات، وەکو بونەوەرێکی ئەخلاقی خۆی بناسێت، کە سەرقاڵی گەڕانە بەدوای حەقیقەتدا.

لە کۆتایی ئەم باسە بچوکەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە بیرمەند و فەیلەسوفان پێشڕەوی خەڵکن، چونکە خۆیان مژولی ئەوەکردوە لە پای هێنانەدی و دووبارە درووستکردنەوەی دنیایەکی مرۆڤ دۆستانە، دنیای خۆیان تێکشکاندوە تا مرۆڤ بونی خۆی بناسێت و رابمێنێت و خەون ببینێت.

---

١ بوون و داهێنان- ل١٠٦

٢ بوون و داهێنان- ل١٤٦

٣ بوون و داهێنان- ل١٤٧

٤ بوون و داهێنان- ل١٧١

# بەشی شەشەم

## (جۆرەکانی زەمەن وپێوانەکردنی کات)

بەگشتی دەتوانین بڵێین چەمکی زەمەن جەستەیەکی پڕ مانایە، چەندین توخم و پێکهێنەری جیاواز بەشدارن لە پێکهێنانی ئەم جەستەیەدا و خودی مرۆڤ لەبەردەم ئەم هێزە مەزن و گاریگەرەی زەمەن بەچۆکدا هاتووە. بە گوێرەی هەندێك رێباز و رەوتی فەلسەفی، چوار جۆرە زەمەن هەیە: زەمەنی عەقڵی، زەمەنی هەستی، زەمەنی سروشتی، زەمەنی رەها. زەمەنی عەقڵی لە زانستی فیزیادا بەندە بە راڤەکردن و لێکدانەوەی جووڵە و گۆڕان، ئەم جۆرە زەمەنە تەنها لە عەقڵی بیرمەنداندا هەیە.

زەمەنی (هەستی)یش ئەو زەمەنەیە کە رەوتی زەمەن تۆماردەکات بە گوێرەی هەستی بیرمەند، واتە شتێکی سەربار و ئیزافیە سەبارەت بە هەست و هۆشی تاك، واتە گەر مرۆڤ هەستی پێبکات، ئەوا هەستکردن بەزەمەەن لای ون دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر لە کاتی خۆشیدا لە شتێك رابمێنینی ئەوا سەعاتێك رەتدەبێت، کەچی لای ئێمە دەقیقەیەك رەتبووە، کەچی لە حاڵەتی ترس و دڵەڕاوکێدا سەعات هێواش تێدەپەڕێت و دەقیقەیەك لای مرۆڤ دەبێتە سەعاتێك[1].

تۆبۆلۆجیای زەمەن، لای چاکسازییەکانی کەنیسە، ئەوانە پێیان وایە، کە زەمەنی خولی پێکەوە لەگەڵ زەمەنی خەتی یەك ئاراستەیان هەیە و لەلایەن خواوە رێکخراوە. زەمەنی خولی لای ئەوانە بریتیە لەو زەمەنەی بونێکە کە دورخراوەتەوە لە رێگای راست[2].

---

١ دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد – ل ٧٠

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان – ل ٩٣

زەمەنی مرۆیی: بریتیە لە چالاکیەکانی مرۆڤ کە ئاراستەکانیشی پێدەدات. ..تەواوکاری لە زەمەندا پەیوەستە بە زانست و شارەزایی مێژوویی وزانینی سروشت[1].

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانیین زەمەن بۆ چەند جۆرێك دابەش بکەین، وەك:

- (زەمەنی سروشتی)یش، بریتیە لەو زەمەنەی کە زانایان جوڵەی تەنە ئاسمانیەکانی پێ ڕاڤە و تەفسیردەکەن. ئەمە زەمەنێکە کە سەربەخۆیە وپەیوەست نییە بە هەستی مرۆڤ. ئەگەر زەمەنی عەقڵی و هەستی، بەند وپەیوەست بن بە کەسێك کە عەقڵ و هەستی هەبێت، ئەوا زەمەنی سروشتی و زەمەنی ڕەها، زەمەنی گشتین و پەیوەست نیین بە تاکی مرۆڤ.

- **زەمەنی ڕەها و زەمەنی ڕێژەیی:**

- زەمەنی ڕەها: ئەو زەمەنەیە کە پشت ئەستوور بەخۆی وەستاوە و سروشتێکی جیامەندی هەیە، بە بێ گەڕانەوە بۆ شتێکی دەرەکی و بە گشتی و یێگیری لێیدەڕوات. زەمەنی ڕەها ئەو زەمەنەیە کە تەریبە لەگەڵ شوێنی ڕەها، ئەم جۆرە زەمەنەش سەربەخۆیە و بەند نییە بە هیچ شتێکی دەرەکی[2].

بە پێی گوتەی (ئیسحاق بارۆ): " ئەگەر شتەکان لە شوێنی خۆیاندا بجوڵێن یان جێگیربن، ئەگەر بخەوین یان بەخەبەربین، ئەوا زەمەن دەگەڕێتەوە بۆ ئیقاعە گشتیەکەی"[3]. دیارە مەزنترین هاندەریش بۆ بینینی زەمەن وەك ڕەهەندێکی بابەتی ڕەهای بنەڕەتی، پێشکەوتنی کاتژمێرە. بە پێچەوانەی زەمەنی ڕەها، زەمەنی ڕێژەیی یان خودی دەبینین، کە ڕووکەشی و گشتیە، پێوەرێکی هەستی دەرەکیە بۆ هەر ماوەیەك بە هۆی جوڵەوە، ئەوە ئەو کاتەیە کە لە ژیانی ئاسایی لە شێوەی ڕۆژ و مانگ و ساڵدا بەکاردەهێنرێت، لە فەلەکناسیدا بۆ پێوانەکردنی جووڵەی تەنە ئاسمانیەکان بەکاردێت، لەبەرئەوەی کاتی فەلەکناسان بە جووڵەوە بەستراوەتەوە، ئەمە لە کاتێکدا زەمەنی ڕەها، وەك ئاماژەمان پێکرد بە هیچ جووڵەیەکەوە

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٩٦

٢ دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد — ل ٧١

٣ گ (هەژان) — ژ، ٢٣- ل ١٤٤

نەبەستراوەتەوە[1]. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانیین کە بۆ یەکەمجار (نیوتن) زەمەنی بۆ (زەمەنی رەها و زەمەنی رێژەیی) پۆلێنکرد.

زانا و فەیلەسوفی بەریتانی (نیوتن) زۆر بە روونی باسی زەمەنی کردووە، ئەو کاتە چەمکێکی نوێی بۆ زەمەن راگەیاند، و بڕوای وابوو دوو جۆرە زەمەن هەیە، بە دیدی نیوتن پێویستە زەمەن، بۆشایی ئاسمان (فەزا)، دوو جوولەیان هەیە، رەها و رێژەیی، راستەقینە و روالەتی.

زەمەنی رەها: راستەقینەیە لە خودی خۆیدا و بەسروشتی خۆی، دەڕوات بە بێ ئەوەی پەیوەندی بە شتێکی دەرەکی هەبێت، هەندێك جار ئەم زەمەنە بە بەردەوامی (دەیمومەت) ناودەبرێت.

زەمەنی رێژەیی: روالەتیە، ئەمە پێوەرێکە، هەستیارە و دەرەکیە لەسەر دەیمومەت و جوڵە، مرۆڤ ئەم زەمەنە لە بری زەمەنی راستەقینە بەکاردێنێت، وەك: سەعات، رۆژ، ساڵ، مانگ. لە روانگەی نیوتن، زەمەنی رێژەیی، پەیوەستە بە بواری بینین و هەروەها بەندە بە دەرککردنی ئەو شتانەی بە چاو دەبینرێت، زەمەنی رێژەیی روالەتی هاوشێوەی ئەو زەمەنەیە کە بە (زەمەنی جۆری) ناودەبرێت، کە زەمەنی ژیانی ئاسایی و رۆژانەیە[2]. کەچی زەمەنی رەها بە دیدی نیوتن بە ئاسانی دیارناکرێت.

واتە لە فیزیای نیوتندا، گریمانەی زەمەنی رەها هەیە، واتە زنجیرەیەك جیاکاری زەمەنی لە مێژووی گەردووندا هەیە، کە بە ئاسایی وئاسانی لە رابردوی بێ کۆتایی، بەرەو داهاتووی بێ کۆتایی دەڕوات. کە دەکرێ ناوی لێ بنێین، دید ورواینینی هەستی هاوبەش بۆ زەمەن. ئەم دید و بۆچوونەش لای زۆربەی خەڵك و فیزیاناسان باو بوو، تاکو ساڵی (١٩٠٥)کە ئەنیشتاین، تیۆری رێژەیی داهێنا و کۆتایی بەم دیدە هێنا[3].

لە فەلەکناسیشدا، زەمەنی رێژەیی و زەمەنی رەها، بە هۆی هاوکێشەی زەمەن لە یەکتر جیادەکرێنەوە، چونکە رۆژەکانی سروشتی وەکو یەك نین وەیەکسان نین. زەمەنی رەها دەبێ هەمیشە هەمان رێگە و رێباز ببڕێت و رەوتبکات و بەردەوامی شتەکان واتە خودی شتەکانە[4].

---

١ ط (هێذان) — ذ، ٢٣- ل ١٤٥

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٤٠٦

٣ الكون في قشرة الجوز- ل ١٠٢

٤ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٤٠٦

- کرۆنۆزۆفیای زەمەنی خەتی و کەلەکەبویی: بریتیە لە سەرجەمی ئێستا کە سوود لە دەسکەوتەکانی رابردوو وەردەگرێت و دەسکەوتەکانی خۆیشی دەخاتە سەر، کە ئەمە دەشێ تا هەتایێ بەردەوامبێت، ئەگەر هیچ بەربەستێکی دەرەکی نەبێت[1].

## - زەمەنی خودی (دەروونی):

زەمەنێکی ئاراستەکراوە، ئەم زەمەنە ئاراستەیەکی دیاریکراوی هەیە، کە دابەشکراوە بۆ چەند قۆناغێك کە لە دوایەکتردێن لە ناو چوارچێوەی سیستەمێکی نەگۆڕدا: ساوایی، منالّی، هەرزەکاری، لاو، کالّ، پیر. هەموو مرۆڤێك هەست و دەرك بەوەدەکات کە لە دوارۆژی ژیاندا پیردەبێت و بەرەو کزی و خراپی دەچێت و کۆتایی بە ژیانی دێت، هەروەها ئەوەش دەزانێت کە هەموو ئان و ساتەکانی ژیانی دەڕۆن و بزردەبن و ناگەڕێنەوە[2]. لێرەدا دەردەکەوێت کە زەمەنی خودی، یەك ئاراستەی هەیە و بە کۆتا دێتن، بە لەدایکبوون دەستپێدەکات و بە مردن کۆتایی پێدێ.

بە دیدی (کریشنا مۆرتی) بۆ پەی بردن بە مردن دەبێت پەی بە زەمەن بەرین، کە مەبەست لە زەمەنی دەروونیە، گەڕانەوە بۆ دوێنێ، بۆ هەموو ئەو شتانەی کە زانیومانە، هەستمان پێکردوە، چێژمان وەرگرتووە، کۆمان کردۆتەوە ولە بیرەوەریدا عەمبارمان کردوە. بە بیرهێنانەوەی زەمەنی رابردوو، شێوە بە زەمەنی ئێستای ئێمە دەدات کە لە سەروەختی خۆیشی لە داهاتوودا پەرەدەستێنێ[3].

## - زەمەنی دینی (سرووتی):

ئەم جۆرە زەمەنە هەر وەك زەمەنی خودی راستەهێلی و ئاراستەکراوە، بە لەدایکبوون لەسەر زەوی و دواتر مەرگی جەستە و لە دوارۆژیشدا ژیانێکی ئەبەدی لەو دونیا چاوەڕێی دەکات، هەروەها ئەم زەمەن موژدەی ژیانی ئەبەدی دەبەخشێتە باوەڕداران، ئەمەش پێچەوانەی بیرۆکەی بەردەوامی جیهانە[4].

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٩٤

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٣٢٧

٣ گ، ئاینده، ژ- ٣٣- ل٧٧

٤ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٣٣١

- **(زەمەنی پیرۆز):**

میرسیا ئەلیادە بە وردی باسی لە رۆڵی سرووتەکان کردوە لە گواستنەوەدا لە ئاستێکی زەمەنیەوە بەوە ئاستێکی دیکە . ئەلیادە لە سەرەتاوە جیاوازیدەکات لە نێوان زەمەنی ودنیایی و زەمەنی پیرۆزدا.

میرسیا ئەلیادە پێیوایە، کە زەمەنی پیرۆز زەمەنێکی نامێژوویە (بەند و پەیوەست نییە بە هەنووکەیی مێژووی) و ئەم زەمەنە بە شێوەیەکی خولی و لە کاتی دیاریکراودا، بەردەوامی زەمەنی ئاسایی و رۆژانە دەوەستێنێت[1]. وەك لە کاتی بۆنە و سرووتە ئایینیەکان و جەژنەکان، کە لە میانی ئەو ساتە وەختەدا مرۆڤ لە زەمەنی ئاسایی دەرەدەچێت و دەڕواتە ناو زەمەنێکی دیکە و تیایدا دەژی، لە پێناو هێنانەدی کەماڵ وگەیشتن بە زەمەنی پیرۆز[2].

زەمەنی رۆژانە (ئاسایی)یش بە پێی میرسیا ئەلیادە، ئەو زەمەنەیە کە جیابوونەوە و نهێنی تیادا نییە، و ئەو زەمەنەیە کە ناخی بونی مرۆڤ پێکدەهێنێت و پەیوەستە بە بوون و ژیانی رۆژانەی مرۆیی. هەروەها لە زەمەنی ئاساییدا ئەو ئیقاع و ریتمانەی زەمەن کە مرۆڤ هەستی پێدەکات، پەیوەستن بە ژیان و ئەزموونەکانی مرۆڤ و پەیوەندیان نییە بە ئامادەگی موقەدەس[3].

ئەلیادە دەنوسێت لە نێوان ئەو دوو شێوە زەمەنەدا کەلێنێك هەیە، کە مرۆڤی ئیماندار بە یارمەتی سروتەکانەوەبە بێترس لە رەوتی زەمەنی ئاساییەوە بەرەو زەمەنی پیرۆز دەگوازتەوە.

لای ئەو جەژنەکان پرۆسەی چاککردنەوە و نوێکردنەوەی رووداوێکی پیرۆزن کە لە رابردوودا روویانداوە، مرۆڤی ئاینداریش کە لە جەژنەکەدا بەشداریدەکات بەو رێگایەوە لە زەمەنی ئاساییەوە دەگەڕێتەوە بەرەو زەمەنی ئەفسانەیی. زەمەنی پیرۆز لە دیدی ئەوە وە، ئەو زەمەنەیە کە دەکرێت تاهەتایە وبێوچان قابیلی دووبارەبوونەوە بێت، بێئەوەی بگۆڕدرێت[4].

---

١ المقدس والعادي- مرسيا الياد- ترجمة، عادل العوا- بيروت- ٢٠٠٩- ل ١٠٦

٢ المقدس والعادي- مرسيا الياد- ترجمة، عادل العوا- بيروت- ٢٠٠٩ —ل ١٠٣

٣ المقدس والعادي- مرسيا الياد- ترجمة، عادل العوا- بيروت- ٢٠٠٩- ل ١٠٦

٤ گ- رەهەند- ژ، ٦- ل ٥٧

میرسیا ئەلیادە، لای وایە، بە دووبارەکردنەوەی سالیادی خولقاندنی جیهان، زەمەن نوێ دەبێتەوە و بەردەوامی ئەگرێت، واتە زەمەن وەك "زەمەنی پیرۆز " دەستپێدەکاتەوە. هەروەها بەشداربونی ئایینی لە کۆتایی جیهان و خەلقی دووبارەی تاکەکان لەگەڵ زەمەنە هەرە سەرەتاییەکان هاوکات ئەکاتەوە. بۆیە وەك ئەوە وایە کە سەر لەنوێ بێتەوە دونیا و بە پاراستنی هێزە بیکرەکان، هەر وەك کاتی لەدایکبوونی، ژیانی سەر لەنوێ دەستپێدەکاتەوە[1].

دەبێ ئەوەمان لەیاد نەژێت کە زەمەنە پیرۆزەکان خزاونەتە دوو تۆی ئەفسانەوە و وەرگێڕی رووداو یان کارەساتی پیرۆزن. واتە رووداو یان کارەساتێك کە لە زەمەنی یەکەمدا روویداوە و هاتۆتە بوون. بەڵام گێڕانەوە و دووبارەکردنەوەی مێژووە پیرۆزەکەی رێکە لەگەڵ ئاشکراکردنی سرووت و بۆنە و ئایینێکی رەمزیدا[2].

## - زەمەنی کۆمەڵایەتی:

ئەم زەمەنە هەندێك توخمی خولی تیادایە، بە گوێرەی ئەوەی هەندێك رووداو هەموو ساڵێك دووبارەدەبێتەوە (یاددەکرێتەوە یان دەگەڕێتەوە) وەك، سەرەتای ساڵ، سەرەتای ساڵی خوێندن، .هەندێك رووداوی دیکەش چوار ساڵ جارێك دەگەرێتەوە، وەك: یاریەکانی ئۆلۆمپیات (تۆپی پێ)هەڵبژاردنی سەرۆکی ولاتان، کە لە زۆربەی ولاتان ٤ ساڵ یان ٥ ساڵ جارێك ئەنجام دەدرێت[3].

## - زەمەنی کاتژمێری ئاسایی:

گریمانەی ئەوە بکە کە لە کۆمەڵگای ئێستادا و لەم سەردەمەدا، کە سەردەمی جیهانگەراییە، رۆژێك کاتژمێر نەبێت (لابرێت) ئەو کاتە بۆت روونەدەبێتەوە کە ئەو رۆژە سەرجەم کارو چالاکیەکانی رۆژانەی خەڵك و دەوامی فەرمانگەکانی حکومەت دەوەستێت و دوچاری پشێوی دەبێت.

هەروەها هێلی هاتووچۆی ئاسمانی رادەوەستێت، لەبەرئەوەی بە بێ دیاریکردنی کاتی هەستان و نیشتنەوی فرۆکەکان ناتوانن کاربکەن، هەروەها کار گەو پیشەسازییەکان کارەکەیان

١ جەژنێك بۆ پیر- ل ٢٦٥

٢ جەژنێك بۆ پیر — ل ٢٦٥

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٣٣١

سەخت و دژوار وناریك دەبێت، بە تایبەتی کۆمپانیا گەورەکان، هەروەها تۆری دابەشکرنی کارەباش بە گوێرەی کاتژمێر کارەکانی ئەنجامدەات[1].

ئالێرەدا کاتژمێر دەوری خۆی دەبینێ لە پێشکەوتنی گەل و میللەتدا و هەروەها گرنگی کاتژمێر بەدەردەکەوێت لە هەموو بوارێکدا.

کەواتە زەمەن لە چەندین رەهەندی جۆراوجۆردا خۆی پیشاندەدات، لە ئەنجامیشدا گوزارشتکردنە لە روانین و ویست و خواز.

## - مرۆڤ و پێوانەکردنی کات

(ئەلبرتی) دەڵێت: " ئەوەی دەزانێت کات بەفیڕۆ نەدات، تاڕادەیەك دەزانێت هەموو شت و کارێك بکات. و ئەوەی دەزانێت کات بەکاربێنێت دەبێتە سەروەری هەموو شتێك و هەموو ویستێك" [2]

بێگومان پێوانەکردنی کاتەکانی رۆژ و رۆژدابەشکردن بۆ چەند بەشێك دەگەڕێتەوە بۆ سەردەم و ساتەکانی پەیدابونی مرۆڤ لەسەر زەوی، چونکە لە ژیانی سەرەتاییدا لە ژیانی راوشکاردا لە دەرەوە پێویستی بەوە هەبووە بەر لە تاریك داهاتن بگەڕێتەوە پەناگەی خۆی، لەبەر ئەوەی لە تاریکیدا پەکی دەکەوت و رێگەی لێ تێکدەچوو، هەروەها دەکەوتە بەر پەلاماری گیانەوەرە دڕندەکان، لێرەدا زانینی کات پێویست بوە تاکو بزانی چەندی دەمێنێ بۆ شەو، بەڵام ژماردنی شەو درەنگتربووە، بەڵکو ژماردنی ماوەکانی شەو لە پاش چاخی کشتوکاڵی پەیدابووە، چونکە لەو رۆژگارەدا شەوانیش وەکو رۆژ، مرۆڤ کەوتە کارو خەباتکردن لە پێناو هێنانەدی ویست و پێویستیەکانی.

سەبارەت بە گۆڕانکارییە سروشتیەکان مرۆڤی بەرایی هەستی بەو ماوەیە کردوە لە نێوان بەدوایەکداهاتنی شەو رۆژ، بڵندبونەوەی خۆر لە ئاسۆ بۆ تاقی ئاسمان، پاشان نزمبونەوە و شۆڕبوونەوەی بۆ سەر زەوی و بزربونی. هەروەها گەرمی و ساردی بەدوایەکداهاتن و شین بون و

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٣٣٢

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل٣٨٣

شکبونی رووەك و لە دایکبون و هەراشبونی بەچکەی گیانەوەران سەرەنجی مرۆڤیان راکێشاوە، هەست بە زەمەن و بەشەکانی کات بکات[1].

رەگەزیی مرۆیی بۆ ماوەی چەندین سەدە توانی رابێت لەسەر ئەو بیرۆکانەی کە پەیوەستن بە دابەشکردنی رۆژ بۆ چەند یەکەیەکی زەمەنی، و دابەشکردنی ساڵ بۆ چەند وەرزێك یان چەندین مانگ، بەڵام ئەو بیرو هزرانەی پەیوەستن بە گۆران و پەرەسەندن لە سروشتدا درەنگتر بونە مایەی قبولّکردن، تاکو سەدەی نۆزدەهەم، پێوەرێکی ورد نەبوو بۆ پێوانەکردنی رابردوو یان راڤەکردنی، لەگەڵ ئەوەی کە مرۆڤ دەیتوانی رووداوەکان بە جۆرێکی رێکوپێك تۆماربکات، بە گوێرەی پێوان بۆ چەندین ساڵ، یان بۆ چەند نەوەیەکی مرۆڤایەتی، واتە پێوەرێکی زەمەنی تەواو نەبوو و هەموو شتێك رێژەیی بوو و هەر ئاماژەکردنێك بۆ زەمەن لە چوارچێوەی ئەزمونی مرۆڤایەتی دابوو[2].

دابەشکردنی کاروبارەکان و جۆری پەیوەندییەکان و رێکخستن و دیاریکرنی کاتەکانی کارکردن و نوستن و حەسانەوە، پانتاییەکیان لە ژیانی مرۆڤی کۆن وداپۆشیوە، واتە مرۆڤ هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە، خۆرسکانە کاتەکانی بەسەر کاروباری ژیانی رۆژانە دابەشکردوە[3].

پەرەسەندن و هۆشمەندی بونی مرۆڤ و پێداویستیەکانی رۆژانەی خۆی، ناچاری کردووە گرنگی بە کات بدات، سەرەڕای لێوردبونەوەی لە مانگ و ئەستێرەو بە تایبەتی ئەستێرەکانی شەوە تاریکەکان، پتر سەرەنجی مرۆڤیان راکێشاوە، کە بیر لە هەڵهاتن و ئاوابون و سوڕانەوەیان بکاتەوە. وگۆڕان و بزوتنەوەی کەش و گەڕیانی خۆر و مانگ کە دوو دیاردەی سەرەکی گەردوونن بنەماو چاوگەی هەموو رۆژژمێرێکیان پێکهێناوە، بۆ دابەشکردنی زەمەن بەشێوەیەکی پێویست و گونجاو بە مەبەستی ئەنجامدانین و رێکو پێکردنی ئەرکەکانی و کاروبارە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان.

هەموو ئەوانە رێنمایی مرۆڤ بونە کە هەوڵبدات ژمێرەکردنی ماوە کاتییەکانی ژیانی رۆژانەی بناسێت و دەستی بەسەردابگرێت و چەندێتیی زەمەن و کاتەکان بزانێ، لە هەر ماوەیەکی رۆژدا یان شەودا. ئیدی لەبەر ئەوانە بووە پێوانەی ماوە و کاتەکانی رۆژ لای مرۆڤی

١ فكرة الزمن عبر التاريخ — ل ٩٢

٢ فكرة الزمن عبر التاريخ — ل ٢٤٣

٣ فەرهەنگی کات لە کوردەواریدا — ل ٩

کۆن و بەرایی زۆر پێویست بووە و یەکەم جاریش مرۆڤ خۆری بەکارهێناوە بۆ کات پێوان، کەوا دێتە بەر چاو خۆر لە ئاسۆ هەڵدێت و تا ئاوابوون بە چەند قۆناغێك تێپەڕ دەبێت، مرۆڤ قۆناغەکانی بڕینی ئەو ماواناشی بە تێڕامانی ئاسایی دەپێوا. لەگەڵ رادەی پێشکەوتنی مرۆڤ و پەرەسەندنی بیرو هۆش وردەکاری خرایە ئەو پێوەرانە بۆ کاتژماردن[1].

هەر بەم جۆرە شەوانیش هەیڤ یان ئەستێرەیەك، یان کۆمەلەیەك لە ئەستێران دیاری دەکرد و شەو ژمێرییان پێدەکردن بۆ زانیین و پێوانی ماوە کاتییەکانی تاریکە شەوان. پێوانەی ماوەکانی شەو ورۆژ کە بە چاو دەدیترا بە مەزەندەش بەرزایی و نزمایی خۆر یان ئەستێرەکان دەپێورا، ئەویش پێوانی کەوانەی ئاسمان بووە کە لەسەر سەری مرۆڤ هەڵدراوە، هەر وەکو نیوەگۆیەك کە بە رۆژ خۆر دەبینرێ و بە شەویش ئەستێرەکان یاخو هەیڤ ئەگەرچی پێوانەکاری هەیڤ زۆر وورد نەبووە و هەستیان پێکردبوو کە هەموو رۆژێ بڕێك لە پاش دەدا، بۆیە هەیڤ لەکاتژمێریدا هەندە گرنگی پێنە دراوە، بەڵام درەنگتر هەیڤ بۆ سالژمێری کاری پێکراوە، هەر وەك لە شارستانی هیندی و بابلیدا دەبینرێ[2].

مرۆڤی کۆن بەو جۆرە کاتژمێری بە بەرزایی ئاستەکانی خۆر پێواوە و پاشان مرۆڤ توانی لەوە، نزیکتر سوود لە خۆر وەربگرێ، بۆ پێوانەکردن ئەویش بە پێوانی سێبەری شتەکانی دەوروبەری خۆی یان جەستەی خۆی خۆر کە تازە هەڵدێ لە بەیانیان و چێشتانان سێبەرێکی درێژ بۆ هەموو شتێکی جەستەیی پەیدا دەکات و هەتا پتر بەرەو ئاسمان هەڵبکشێ بە رێژەیەکی دیاریکراو سێبەری شتەکان کورتر دەبێتەوە و مرۆڤ هەستی بەو رێژەیە کردوە تا دەگاتە نیوەڕۆ هەموو شت سێبەری لە نەمان نزیك دەبێتەوە پاشان دووبارە سێبەرەکان دەست بە درێژبونەوە دەکەن تا کاتی پێش ئاوابونی. ئەوەی جێگەی سەرنج بووە بۆ مرۆڤی کۆن سێبەری هەتاو بۆ هەر تەنێك سوڕانەوەیەتی بە شێوەیەکی بازنەیی بە دەوری تەنەکە بە بڕی نیوبازنە بەم جۆرە ئەوە یەکەمین کاتژمێری مرۆڤە کە بە کاتژمێری هەتاوی دەناسرێت. ئەو سیستەمە بۆ کاتژمێری هەتاوی پەیڕەو کراو تا ئێستاش لەلایەن زۆربەی گەلان بەکاردێ.

بەسەربردنی شەوانی ناو ئەشکەوت و پەناگەکان بە تایبەت کە مرۆڤ توانی دەست بەسەر ئاگردا بگرێ و سوودی لێ وەربگرێ بۆ برژاندن و بۆ گەرمبوونەوە و دواتر بۆ روناککردنەوە، تێبینی سووتانی

---

١ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣ — ل ١٤٩

٢ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣ — ل ١٤٩

ئاگری کردوە کە ماوەکەی چەند دەخایەنێ، ئیدی ئەوەش بوە سەرەتای ئەوەی ئاگر بەکاربێنێ بۆ کاتژمێریی ئەگەر چیش بەکارهات وەکو هێمای هەواڵ گەیاندن[1]. بەکارهێنانی ئاگر بۆ کاتژمێری بۆ ئەوە نەبوە کاتی شەوانی پێ بپێوێ و بەس، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە شەوانی زستان لەبەر باران و هەور، ئەستێرە و مانگ بەدەروە نیین. مرۆڤ ناچاربووە بیر لە هۆیەکی دیکە بکاتەوە ئەلێرەدا توانی بەئاگر ماوەکانی شەوانی بپێوێ و بزانێ چەندی ماوە بۆ بەیانی.

قاپی بەردینی لە میسردا بۆ کاتژماردن بەکارهاتوە، کوپە و گڵینە ئاو سوودی لێوەردەگیرا. بەیانیان دەچوونە سەراوێ، هەموویان پڕئاو دەکرد بۆ خواردنەوە وچێشت لێنان تەنانەت بۆ شوشتنیش...تێبینی دەکرا ئاوی ئەو کەلوپەلانە لە کورتی دەدا، بەدەڵاندنی ئاوی ناو کەلوپەلەکان..دەڵاندن و پاڵاوتنی ئاوی کوپەکە و ئەوانی دیکە بە کاتێکی دیاریکراو ئاوەکەی ناویان تەواو دەبوو، ئاستەکانی رووی ئاوی ناوەوەی تێپەڕبوونی ماوەکانی کاتی پیشاندەدا، بەڵکو لە ناوەوەی کوپەکەدا لە ئاستی جیاوازی ئاقاری ئاستەکانی پیشاندەدا، سەبارەت بەوە هەر زوو مرۆڤ ئەمەشی کردە هۆیەکی ژماردنی کات و بەڵکو سەرکەوتوترین هۆبوو، چونکە ئاسانتر بوو، ووردتریش بوو، نەوەك تەنیا بۆ رۆژ بێت، یان تەنها بۆ شەو، بەڵکو بۆ شە و ورۆژ، بەم ۆرە ئەوەش کاتژمێری ئاوی لێ پەیدابوو، هەر لە سەر سیستەمی کاتژمێری ئاوی، لە جیاتی ئاو لە شووشەی تایبەتیدا خۆڵ یاخود زیخ بەکاردەهات، کە ئەویشبە کاتژمێری خۆڵی دەناسراو تاپەیدابوونی کاتژمێری میکانیزمی، شانبەشانی کاتژمێری ئاوی لەکاردبوو، بەڵکو تا سەرەتای سەدەی بیستەم، کتژمێری زیخی لەلایەن پزیشکەکان بەکاردەهات لە پێناو زانینی لێدانی دڵ وزۆر کاری دیکەیان[2].

سەرەڕای پێوانەکردن بە باڵ یاخود بە بست، بێگومان پێوانەکردنی کاتەکان، رۆژ و رۆژدابەشکردن بۆ چەند بەشێك دەگەڕێتەوە بۆ ساتەکانی پەیدابوونی مرۆڤ وە، چونکە لە ژیانی سەرەتاییدا لە راوشکاریدا لە دەرەوە پێویستی بەوە بوو بەر لە تاریك داهاتن بگاتەوە پەناگەکەی خۆی[3].

ماوە ژمێری کاتەکانی رۆژ و شەو سەبارەت بە پێشکەوتنی مرۆڤ لە هەموو بوارەکاندا ئەویش پێشتردەکەوت و ووردتر دەبون.

---

١ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣ — ل ١٤٩

٢ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣ — ل ١٥٠

٣ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣ — ل ١٥١

جگەلەوەش سەبارەت بە بانگدان و خوێندن و دەنگی گیانەوە رو پەلەوەران کاتیان زانییوە وەکو بانگی کەڵەباب، کەڵەشێر، بۆ بەیانیان، وەڕینی سەگان،شیڕەی نێرەکەران مەبەست (زەڕینی کەران) دەنگی چۆلەکە و خوێندنی باڵندەکان دی هەریەکەیان کات و ساتێکی دیاریکراویان هەبوو، چ بە رۆژ چ بەشەو، لە کوردەواریدا وەڕینی سەگەکان، کاتێکە کەوا شەو لە کۆتاییدایە زۆر جاریش بەو کاتە وتراوە کاتی جوداکردنەوەی سەگ و گورگ، وەك بڵێن: (هێشتا شەوی مابوو سەگ و گورگ لەیەکدی جودانەدەکرانەوە)[1].

هەردەم دەستنیشانکردنی کات بە پێی پیشەی پیشەکاران دەگۆڕا و هەر کەسە بە گوێرەی پیشەکەی خۆی، کاتژمێرییان دەکرد، شوان دەیانگوت: "بەقەد دانگەیەکی لە فلانەجێگادا دانیشتم" بە مەبەستی ئەوە ماوە کاتەبووە کە رانە مەڕێکی پارچەیەکی دیاریکراوی لەوەرگەیەك یان دەغرێکیان دەخوارد، ئافرەتانیش دەیانگۆت: "هەندی بچیە سەراوێ، یان بچیە سەراوێ و بێیەوە، ئەوەندە خۆمان حەساندەوە.".. مەبەست ئەو ماوە کاتەیە کە دەخایەنێت بۆ چون و یان چوون و هاتنەوە لە ئاو هێنانی سەرکانی، یان بیرێك.

لە کوردەواری پتر گرنگی دراوە بە ئاسمانی شەوان، ئەستێرە هەڵاتن و هەڵکشان و ئاوابوونیان کە دەگوترێ (پێرو هەڵکشایە) یان گەلاوێژ، تەرازوو، سیوەیل...سەرنج دراوەتە هەڵکەوتنی رێگەی کاکێشان و حەفتەوانە، کە ئاراستەکەیان چۆنە و چۆن هەڵکەوتوونە[2]. پاشماوەیەك لە شوینی خۆیان دەترازین و بەدەو ری خۆیان خۆل دەخۆن..کەوا شەوانە بەقەدەرایی چارەگەبازنەیەك لەشوێنی خۆیاندا خول دەخۆن و دەسورێنەوە، کوردەواری سەرەنجی داوە لە کاتی تارکداهاتندا رێگەی کاکێشان رووەو کافرستانی یاخو بە ستونی لەسەر دەرزی موگناتیسی(قیبلەنوما)یە کە درەنگی شەوێ دەبینرێ. بەو جۆرە دەگوترێ (رێی کاکێشان تەواو سوڕایە) یان (حەفتەوانە سوڕایە) بە واتا کاتێکی دیاریکراو تێپەڕیوە ماوەکەی سێ بار بووە، واتە شەش کاتژمێری ئێستا، چونکە هەر بارێك دوو کاتژمێرەی ئێستا بووە.

---

١ فەرهەنگی کات لە کوردەواریدا - ٢٠٦

٢ گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣ — ل ١٥١

- **جۆرەکانی کاتژمێر:**

١- کاتژمێری هەتاوی: هەروەکو لە سەرەتا باسکرا خۆر فاکتەری سەرەکی ئەو بابەتە پێوانەیە لە بەرایی بڵندایی خۆر لە ئاسۆوە تا ناوەڕاستی ئاسمان لە وێشەوە تاکو ئاوابونی دەپێورا بەر، بەر لە هەر شت درێژی رۆژ دەکرایە دوو بەش، هەر وەکو ئێستا دانی بەیانی ودانی ئێوارە، نیوەڕۆ کاتی هەموو شتێك سێبەری دەگەیشتە ئەو پەڕی کەمی یان بەرەو نەمان، ئەو خاڵی سفری هەردوو دان بوو.

سیستەمێکی دیکەی پێوانەی هەتاوی پەیدابوو ئەویش بە سەرنجدان لە سێبەری هەتاو، کەوا تیشکی خۆریان دەپێوا بە بەراوردی تەنەکە، ئەوە سەرەڕای زانینی وەرزەکان. ئەویش بە کورت و درێژی سێبەرەکە و هاوڕێژەبوونی کە لەکاتی خۆرهەڵاتدا یان ئاوابوونیدا درێژی سێبەر یەکجار درێژە. گە لە کورت و درێژی هاوڕێژەبوونی سێبەر، کوردەواری (مرۆڤی کۆن) سەرەنجی داوەتە خولانەوەی سێبەر بە دەوری تەنەکەیدا، زۆر جار وەرزێرەکان لە هاویندا بۆ هەڵدانی رەشماڵ و چەقاندنی تێبینی سوڕانەوەی سێبەریان دەکرد[1]. هەروەك ئاشکرایە (سێبەر) لە کاتی هەڵهاتنی خۆردا فراوانە، دواتر دوای تێپەڕبونی کات، هەردوو دورایەکەی (درێژیی و پانی) کەم دەبن و کورت دەبنەوە، بە شێوەیەك لە کاتی نیوەڕۆدا، ئەم سێبەرە لە خاڵێکدا کۆدەبێتەوە، دوای نیوەڕۆش شێوەی سێبەرێکی دیکەی ئەم جەستانە پەیدا دەبن، کە ئەم جارەیان بەرەو درێژبوونەوە و فراوانبون دەچن تاکو تاریکی دادێ[2]. کەواتە دیاردەی (سێبەر) هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ دیاریکردنی (کات و ماوەکان) کە دواتر وەك ئامێرێك بۆ دەست نیشانکردنی (کات) بەکارهێنراوە، بۆ نموونە، سێبەرەکانی (درەخت، تاتە بەرد، چیا،...) بونەتە هۆکارێك بۆ ئەوەی کاتەکانی (سەرەتای بەیانی، چێشتەنگاو، نیوەڕۆ، دوای نیوەڕۆ، ئێوارە،...) دیاری بکەن.

٢- کاتژمێری ئاوی: ئاو بە پلەی دووەم دێت سەبارەت بە بەکارهێنانی بۆ مەبەستی کاتژمێرییەوە، رۆژانە سەبارەت بە کەمبوونەوەی ئاوی کوپە و گۆزە و کوندەکان، وەکو کاتژمێرێکی گەورە دەبینرا سەبارەت بە رێژەی کەمبوونەوەی ئاو لە نێویاندا یان بە دەڵاندنی ئاو. دیارە سیستەمی

---

١ (فکرە الزمن عبر التاریخ) — ل ٩٥ هەروەها بڕوانە (گ- کاروان ژ-١٧٠ - ل١٥٢

٢ فەرهەنگی کات لە کوردەواریدا — ل ١٠

ئاوژمیچری کات له چاخی کشتوکاڵی و جێنشێن بونی مرۆڤەوە بووه[1]. لەهەندێك شوێنی دنیادا ئاساواری قاپ و کوپەی بەردینی هەیه که بەکارهاتوون و ژمێرەی کاتیان پێکراوه، بەڵام پاش پەیدابوونی سواڵەت و گلێنەسازی، کوپه و گلێنه زۆر بە سەرکەوتوویی کاتژمێرییانن پیێ کراوه، چونکه کوپه له کاتی دەڵاندنی ئاودا ورده ورده ئاوەکەی لە کەمی دەدا و ئاستی نزمبوونەوەی ئاوەکه چین لەسەر چین لەسەر لێواری ناوەوەی کۆپەکەدا دیاردەبوو، بە کەمکردنەوەی رێژەی ئاوی کوپەیەك لە بەیانی تا ئێواریێ، بەم جۆره دەتوانرا کاتەکانی خۆیان پیێ بناسن.

٣- کاتژمێری ئاگری: دوای پەیدابونی ئاگر لەلایەن مرۆڤەوه، و بە تێبینیکردنی سووتانی دار و کۆلکەدار، کە بریتی بوە لە سووتانی لقەدارێك، جێگا و گرێیەکانی درەختەکان، چەشنی پلەکانی پێوەر سەرەنجی لێگیراوه، بە تێبینیکردنی ژمارەی گرێکان لەگەڵ ئەو گرێیانەی دەسووتان، رێژەی لێکدراوەتەوە بۆ زانینی کاتی تێپەڕیوو و مانەوەی کاتی داهاتوو.. هەروەها بەکارهێنانی ئاگر بۆ هەواڵنێری زۆر لە مێژه هەبوه و لە راگەیاندنی سەرکەوتنی کاوەی ئاسنگەر بەسەر زۆر داردا بە ئاگر هەواڵ بە میللەتانی ئەو دەوروبەره راگەیەنراوه[2].

هەروەها مرۆڤی کۆن گرنگی و نرخی هەتاو ومانگ وەك دوو دیاردەی گرنگ لە ژیانی مرۆڤدا،زانییوه بایەخی پێداون بۆ رۆژژمێری و دانانی ساڵنامه،یان ساڵ پێو.

لە ئاییینی ئیسلامیشدا خودا لە قورئاندا چەندین جار باسی مانگ و هەتاو و ئەستێرەکان دەکا و تەنانەت سوێندیان پیێ دەخوا، لە سورەتی ئەلشەمسدا هاتووه: " سوێندم بەخۆرەتاو و بریسکانەوەی کاتی هەڵدەکشیێ، سوێندم بە مانگ کە پاشڕەوی خۆرەتاوه". هەروەها قورئان له چەندین ئایەت و سورەتی دیکەدا باسی تایبەتمەندی و هۆکارەکانی خولڤاندنی مانگ و هەتاو و پەیوەندیان بە دیاریکرنی زەمەنەوە دووپاتدەکاتەوه و ئایەتی پێنجەم لە سورەتی (یوونس) بە شێوەیەکی رەوان دەوری مانگ و هەتاو لە حیساباتی زەمەندا دەخاتەروو: " هەر ئەو خودایەی کە هەتاوی بریسکاندەوه و مانگی درەوشاندەوه، بۆ مانگ چەند رۆژێکی دیاری کرد تا ئێوه ژمارەی ساڵەکان و حیساباتی زەمەن فێربن" هەروەها لە سورەتی بەقەرەدا (١٨٧)هاتووه:" سەبارەت بە هیلایەکان (مانگی یەك شەوە) لێت دەپرسن و تۆش بڵیێ ئەوانه بۆ دیارکردنی کاتی حه و مامەڵەی خەڵکیه".

---

[1] فکره الزمن عبر التاریخ) — ل ٩٧ هەروەها بڕوانه (گ- کاروان ژ-١٧٠ - ل١٥٣

[2] گ- کاروان ژ-١٧٠ - ل١٥٥

ئێستاکەش کە ئاستی زانست و پێشکەوتنی هۆش و هزرو و باوەڕو ئەزموونەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگەی جیهانی گەیشتۆتە ترۆپکی و ئان و سان لە گەشەکردن و فراژووبوندایە، هەتاو ومانگ هێشتا دوو پێوەری سەرەکی و بنچینەیین بۆ راگرتنی حیساباتی زەمەن و دانانی رۆژژمێر.

رۆژژمێری ساڵی مانگی لە رۆژگارێکی زۆر کۆنەوە، پێش باوبونی رۆژژمێری هەتاوی، بنەمابو و چاوگەی حساباتی زەمەن بووە، بەلام چونکە رەوتی ساڵی مانگی لەگەڵ ئالوگۆڕەکانی سروشت و بەتایبەت وەرزەکان، هاوئاهەنگی و تەبایی نییە و سەری ساڵی مانگی لە گۆڕاندایە و هەر ساڵ لە چاو ساڵی پێش خۆی (١٠ تا ١١) رۆژ لەدواوەیە، بۆیە پێویست بوو بڕیاری دۆزینەوە و دەست نیشانکردنی بنەمایەکی رێکو پێکتر بدرێ بۆ رەچاوکردنی حساباتی زەمەن و ساڵ و وەرزەکان[1]. چونکە رەوتی ساڵی هەتاوی لەگەڵ ئالوگۆڕی سروشت و وەرزەکانی ساڵدا یەك دەگرێ و رێکو پێکی زیاتری تێدایە، هەرزوو لە جێگای رۆژژمێری ساڵی مانگی دانراوە. بۆیە "ویل دیورانت" ئەم جێگۆڕکێیە بۆ زەمانێ دەباتەوە، کە مرۆڤ لە رێژەی فراژووبونی کۆمەڵایەتی خۆیدا قۆناغی راوشکاری وەلاناو وپێی نایە قۆناغی کشتوکاڵ و ئاودێری کیلگە و مەزراکان، تێگەیشت کە تیشکی هەتاو هۆی بە پیت و بەرەکەتی زەویە و گەڕو خولی هەتاو پێوەری رێك وپێکبونی وەرزەکان و کاروباری کشتوکاڵە[2].

بنەمای ساڵی (هەتاو)یش، پەیوەستە به بزووتنەوەی گەڕانی زەوی بە دەوری خۆردا کە بە "بزوتنەوەی گواستنەوەی زەوی"ناسراوە.واتە زەوی لە ماوەی (٣٦٥) رۆژ و (٥)کاتژمێر و (٤٨) خولەك و(٤٦) چرکە، جارێك بە دەوری خۆردا دەسورشێتەوە، ئەو چارەکە رۆژانەش لە هەر چوار تا پێنج ساڵدا رۆژێك پێکدێنن، رۆژە زیادەکەی ساڵی پڕ لە رۆژژمێری کوردی و ئێرانیدا دەخرێتە سەر مانگی رەشەمە، و لە رۆژژمێری هەتاوی زاییندا دەخرێتە سەر مانگی شوبات[3].

سەرەتای مێژوو و رۆژژمێریش، ساڵێکە کە مەودای زەمانی رووداوەکانی پێ بەراورد و ئەندازە دەگرن و سەری ساڵ خاڵێکە، بڕگەیەکی زەمەنی و مێژوویی وەك ساڵ لەو خاڵەدا تەواو دەبێ یان دەست پێ دەکاتەوە.

بێگومان سروشت و گۆڕانکاریە سروشتیەکان کاریگەری گرنگیان بەسەر کاتەوە هەیە، بۆ نموونە کۆمەڵگە دەشتەکیەکان وا دەڕواننە کاتی درێژبوونەوەی نێوان کازیوە و زەردەپەڕ، کەوا یەکلاکەرەوەیە،

---

١ گ –رامان- ژ- ٣٩- ل ٢٢١

٢ گ –رامان- ژ- ٣٩- ل ٢٢١

٣ مێژویا ساڵنامێ و دەمناسین دگوتنێن مەزناندا، جەمیل محەمەد شێلازی، دهۆك، ٢٠٠٧ — ال ٣٠

هەرلەبەر ئەو هۆکارە (رۆمەکان) سیستەمی "کاتژمێری کاتی" یان داناوە، کە ژمارەیەکی دیاریکراوی کاتژمێری لەخۆدەگرێت و (بە کاتژمێربوو)ش کۆمەڵەیەکی دیکەیان بۆ کاتژمێرەکانی شەو دانا، بەم شێوەیە کاتژمێریان لە هاویندا درێژتربوو وەك لە زستان، واتە کاتژمێرەکانی رۆژ و شەو لە درێژیدا یەیکسان نەبون، تەنها لە هەردوو وەرزی هاوسەنگی (بەهار و پایز)دا نەبێت[1].

ساڵنامە و رۆژمێر و ئامرازەکانی پێوانی کات و زەمەن، تەرخاندەکرێت بۆ رووداو. لەگەڵ ئەوەی کات لەسەر گریمانەی دووبارەبوونەوەی خولێك دامەزراوە کە نەگۆڕ و جێگیرە.

پێوەری کات، تۆمارکرنی ساتەکان، مێژوو، کرونۆزوفیا، چوار رێگان بۆ ئەوەی زەمەن بینراو بێت، هەر لە کاتژمێری هەتاوی و ئاوییەوە بگرە تا دەگاتە کاتژمێری ئەتۆمی، هەروەها تۆمارکرنی کات و ساتەکان، داهات (حادپ) و رووداوە یەك لەوای یەکەکان بەسەرهات و گۆڕانکارییە لەناکاوەکان تۆماردەکات. مێژووش، لە میانی زنجیرەیەك مێژوو و ناو، کە بە دوایەکداهاتنی چاخ و سەردەمەکان و دابەشکردنیان دەردەخات، هەر لە خاڵی سەرەتاوە تاکو ئێستا[2].

کەواتە زەمەنی پێوانەی کات، خولییە، ساز و کۆکە، زەمەنێکە بەبێ وەستان و دابڕان، درێژدەبێتەوە بۆ هەتاهەتاییێ.

- **مانگ و زەمەن:**

مرۆڤ بەر لەوەی لە ڕێگەی ڕۆژژمێرەوە حیسابی زەمەن بکات و بیپێوێت، بۆ پێوانی زەمەن، مانگی بەکار هێناوە، لەبەر ئەوەی مانگ هێمای گەڕانەوەی ئەبەدییە، هەروەها شێوازێك بووە بۆ بەردەوامی ژیان. مانگ دەردەچێت پاشان کامڵ دەبێت، دوای ئەوە بچووکتر دەبێتەوە و دیار نامێنێت، دواتر دووبارە دەردەکەوێتەوە،ئەمەش هاوشێوەیە لەگەڵ سووڕی ژیانی بوونەوەرەکان کە لە دایك دەبن و گەشە دەکەن و لە نادەچن. هەروەها مانگ جۆرە دوالیزمێك پیادە دەکات: ڕووناك و تاریك، پڕو بەتاڵ، کۆن و نوێ، لە دایك بوون و مردن، مانگ لە نێو بازنەیەکدا دەسووڕێتەوە: دەردەکەوێت، زیاد دەکات و دەبێتە مانگی چواردە و بۆ ماوەیەك دیارنامێنێت، بۆیە هزرو ئەندێشەی نوێبونەوەی بەردەوام دەبەخشێت بە گەل و مرۆڤە دێرینەکان . کەواتە کردارو پڕۆسەی ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر مانگدا دێت سەرنجی

---

[1] گ، هەژان، ژ- ٢٣، ل ١٤٤

[2] نظام الزمان- کریستوف بومبیان — ل٢٤

مرۆڤی بەرایی ڕاکێشاوەو پێ ی وابووە، کە مانگێك ئەزموونی (ژیان و لە دایك بوون، مەرگ و ژیانەوە) یە واتە کاتێك (هەیڤ) سێ ڕۆژ بزر دەبێت، مانای وایە بەشێوەیەکی کاتی دەمرێت و پاشان دەژییێتەوە، وەك چۆن منداڵ لە سەرەتاوە بچووکەو دوای ئەوە بەرەبەرە گەشە دەکات و گەورە دەبێت، کەواتە مانگ ڕوونترین نموونەیە بۆ نوێکردنەوەی ژیان بە بەردەوامی .

مانگ کە لە (سەرهەڵدان — مردن — ژیانەوە) دا خۆی دەنوێنێت لە گەلێك ئەفسانەو سرووتی ئایینیدا ڕەنگی داوەتەوەو تەجەللا دەکات . مرۆی کۆن مانگی بۆ پێوان و حیسابکردنی زەمەن بەکار هێناوە، چونکە مانگ بەردەوام لە گۆڕاندایەو لە چەند ڕۆژێکدا خولانەوەی خۆی تەواو دەکات . ووشەی (شهر) ی عەرەبی نزیکە لە ووشەی (سهرا) ی سریانی کە واتای (مانگ) دەبەخشێت و لە ڕەگی (سهر) وەرگیراوە کە بە واتای خولان و سووڕانەوە دێت . هەروەها مرۆڤ بایەخی بە مانگی یەك شەوە (هیلال) و مانگی چواردە (بەدر) داوە، بە تایبەتی (هیلال) کە بۆ حیسابکردنی زەمەن دەسپێکە . ڕۆژژمێری قەمەری لە لای گەل و مرۆڤی کۆن بایەخی پێدراوە؟، هۆکاری ئەم بایەخ پێدانەش بە ئەفسانەو باوەڕی کۆنەوە پێوەستە، بۆ نموونە بۆنە گرنگەکان بە پێی ڕووەکانی مانگ ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا، تەنانەت کەش گۆڕینی هاوینەو زستانەش و هاوساتی بەهاری (اعتدال الربيعی) بە وردی دەستنیشان نەکراوە، بەڵکو بەندو پەیوەست دەکران بە دەرکەوتنی (هیلال)و تەواو بوونی (بەدر)[1] .

هەروەها مرۆڤی کۆن گەشەکردن و نماکردنی ڕووەکەکانیان بە مانگ پێوەست کردووە و سیس بوون و پووکانەوەی ڕووەکەکانیان بە ونبوونی مانگ پێوەست کردووە، بۆیە نیوە ڕووناکەکەی مانگ گونجاوترین کات بووە،بۆ ئاهەنگ گێڕان بەتایبەتی کە مانگ (چواردەشەوە) بێت،بۆ نموونە جووەکان کاتی (مانگی چواردەیان) هەڵدەبژارد بۆ ئەنجامدانی جەژنەکانیان،جەژنی (خیمە) لە (١٥) ی مانگی حەوتەو جەژنی (خەپڵە) یش لە (١٥) ی مانگی یەکە،لای یۆتاییەکانیش جەژنەکانیان لە کاتی مانگی چواردە بوو.کەواتە ڕەمزییەتی مانگ بە شێوەیەکی بەردەوام تەشەنەی کردووەو ڕووەکانی مانگ بە چەندان ڕووداوی دیکەوە پێوەستن، هەروەها بە ئافرەتەوە، کەتوانای بۆ نوێکردنەوەی ژیان بە منداڵ بوون لە شێوەکانی مانگەوە لە خولەکەیدا هاتووە کە لە ناو بازنەیەکدا دەسووڕێتەوە،دەردەکەوێت،زیاد دەکات،بەردەوام بۆ سەرەتا دەگەڕێتەوە،بۆیە ئەندێشەی نوێبوونەوەی بەردەوام بە دێرینەکان دەبەخشێت.

---

١ جولة في اقاليم اللغة و الاسطورة- علي الشوك، ل ١٨٦ ، هەروەها بروانە، لغز عشتار، فراس السواح، ل ٩٤

## - سەرهەڵدانی کاتژمێر (مرۆڤ و کاتژمێر):

ڕەنگە گەورەترین هاندەر بۆ بینینی زەمەن، وەك ڕەهەندێکی بابەتیانە و و ڕەها و سەرەکی، سەرهەڵدان و پەرەسەندنی کاتژمێر بوبێت، کاتژمێر شۆڕشێکی هێناکایەوە لە بواری هەستکردنی مرۆڤ بە زەمەن، و دوای ئەم داهێنانە مرۆڤ بە هۆی کاتژمێرە حوکم و بڕیارەکانی سەبارەت بە زەمەن دەردەکرد و پێوەرەکانی پێشتر کە هەبوون بۆ زەمەن وەك مزوەلەی ڕۆژ و کاتژمێری ئاوی، بەندبوون بە ریتمەکانی مرۆڤ و سروشت، بەڵام ڕەنگە چەند ڕۆژێك خۆر هەڵنەیەت و بەدەرنەکەوێت، یان هەندێك ڕۆژی زستان،ئاوەکە ئەبێتە سەهۆڵ و ئەبەسترێت،بەڵام کاتژمێر دەتوانێت ببێتە پێوەری هەموو ریتم و ئیقاعەکان، لەگەڵ کاتژمێردا زەمەن بووە ڕەهەندێکی بابەتی نەك تەنها ڕەهەندێکی کەسی و خودی و بە گوێرەی دەربڕینی **"لویس ممفۆر"** سەعات هەڵسا بە جیاکردنەوەی زەمەن بە ڕووداوە مرۆییەکان، و یارمەتی مرۆڤی داوە لە باوەڕبوون بە جیهانی سەربەخۆی زانست. بەم جۆرە کاتژمێر بووە ڕێکخەری ژیانی مرۆڤایەتی و هەر دوای بڵاوبونەوەی سەعات مرۆڤ توانی چالاکیە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی خۆی زەبت و ڕێکبخات. ئەمەش هۆکارێك بوو بۆئەوەی مرۆڤ هەست بە زەمەن بکات و هەستی بە بەهایەکەی بکات[1].

کاتژمێژ شۆڕشێکی لە هەستپێکردنی مرۆڤ بە کات بەرپاکرد، چونکە حسابکردنی خودی بۆ کات و زەمەن شاردەوە، مەبەستمان بڕیاردانە بەسەر کاتدا بەوەی مرۆڤ لە کاردا بەدەستی دێنێت و هەستکردن بە ماندووبون بەو سیفەتەی (درێژترە، کورتترە)، بۆ ئەوەی خولەکانی کاتژمێری بابەتی جێگەی بگرێتەوە، کە بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە و یەکگرتووە و بەیەك هێڵدا دەڕوات[2]. لێرەدا پێوەرە کۆنەکانی کات وەك لێدانی دڵ و هەڵهاتن و ئاوابونی خۆر و کاتژمێری ئاوی کەلەسەر ئیقاعەکانی مرۆڤ یان سروشت دامەزرابون، وەلانران و کاتژمێرەکان بونە پێوەری ریتم و ئیقاعانە، هەر بەویش دەتوانرێت کاتی خۆر و تێکڕای لێدانی دڵ دیاربکرێت، بەم شێوەیە لە گەڵ کاتژمێردا کات بووە ڕەهەندێکی بابەتی نەك کەسی[3].

---

١ فكرة الزمن عبر التاريخ) –ل ٣٨

٢ ط، هێذان، ذ– ٢٣، ل ١٤٥

٣ گ، هەژان، ژ– ٢٣، ل ١٤٥

زەمەن وەك پێوەرێك نرخ و بەهای هەیە، كە بەردەوام دەچێتە ناو سەرجەم چالاكیەكانی مرۆڤ، بە تایبەتی ئابووری و بازرگانی.

شای فەرەنسا (شارلی یەكەم) كە لە ساڵی ١٣٧٠ ی زایینی شای ئەو وڵاتە بووە، زۆر بایەخی بە كاتژمێرداوە و لە كۆشكەكەی خۆیدا ١١ ئەسترلاب و دوو كاتژمێری هەتاوی، كاتژمێرێكی ئاوی، دوو لوولەی پڕ لە لم یان چەوی تیادابوو[١].

سەدەی چواردەمی زایینی قۆناغێكی گرنگە لە مێژووی پێوانەی كات و زەمەن، ئەمەش نەك تەنها لەبەر ئەوەی گۆڕانكاری بەسەر بونیادەكانی كاتژمێردا هات، بەڵكو لەبەر ئەوەی دید و بۆچوونەكانی مرۆڤ لەمەڕ، زەمەن، ژیان، مەرگ، رابردوو، داهاتوو، گۆڕانكاری بەسەرداهات و لەم چاخەدا سەعات چووە ناو دونیای ئەدەب و لە دەقە ئەدەبیەكاندا ناوی كاتژمێر هاتووە، هەر لەم چاخەدا قەشە (نیكۆلا ئۆریسم) جیهانی بە كاتژمێرێكی گەورەو جوان وەسفكرد[٢].

گریمانەی ئەوە بكە كە لە كۆمەڵگای ئێستادا، رۆژێك كاتژمێر نەبێت (لابرێت) ئەو كاتە بۆت روونمدەبێتەوە كە ئەو رۆژە سەرجەم كارو چالاكیەكانی رۆژانەی خەڵك و دەوامی فەرمانگەكانی حكومەت دەوەستێت و دوچاری پشێوی دەبێت.

هەروەها هێڵی هاتووچۆی ئاسمانی رادەوەستێت، لەبەرئەوەی بە بێ دیاریكردنی كاتی هەستان و نیشتنەوی فرۆكەكان ناتوانن كاربكەن، هەروەها كار گەو پیشەسازییەكان كارەكەیان سەخت و دژوار ونارێك دەبێت، بە تایبەتی كۆمپانیا گەورەكان، هەروەها تۆری دابەشكرنی كارەباش بە گوێرەی كاتژمێر كارەكانی ئەنجامدەدات[٣].

سەعات هەنگاوەكانی ژیان دیار و دەست نیشان دەكات و ژوانی كارەكانی مرۆڤ دادەنێت، كەواتە هەموو شتێك لە ژیاندا، هەر لە كاتی لەدایكبوونەوە تاكو رۆژی مردن، لە رێگەی سات و چركەكانی كاتژمێرەوە حسێب دەكرێت.

ئالێرەدا كاتژمێر دەوری خۆی دەبینێ لە پێشكەوتنی گەل و میللەتدا و هەروەها گرنگی كاتژمێر بەدەردەكەوێت لە هەموو بوارێكدا.

لە كۆتایی ئەم باسەدا دەپرسین، ئایا سەعاتەكان وەك شێوازەكانی بوونن لە پێوانەكردنی زەمەندا؟ ئایا سەعاتەكانی داهاتوو وەك ئەوەی ئێستا دەبێت؟

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان — ل ٣٨٥

٢ هەمان سەرچاوە — ل ٣٣٨

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٣٣٢

# بەشی حەوتەم

## (بوون و زەمەن)

### - دەربازبوون لە زەمەن:

زەمەن وەك گۆڕێكی كپ و خامۆش هیچ بزوتنێك ...هیچ بونەوەرو مادەیەكی لێ دەرباز نابێ.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە، ئایا مرۆڤ توانیویەتی لە زەمەن دەرباز بێت؟ ئایا مرۆڤ توانیوەتی زەمەن بووەستێنێت و بچێتە ناو ساتە جیاوازەكانی زەمەنەوە؟ لە ئەفسانەو ئاینەكاندا مرۆڤ توانیویەتی لە زەمەنی ئاسایی دەربچێت و ببڕێت و بچێتە زەمەنێكی دیكە یان (دەرەوەی زەمەن).بۆ نمونە موعجیزەی پەیامبەران و (ئیسرا و میعراجی) پێغەمبەری ئیسلام،كە ئەمە جۆرێكە لە دەربازبوون لە زەمەن. خەیاڵی مرۆڤ ڕۆڵی هەیە بۆ دەرچوون لە زەمەنی ئاسایی بۆ زەمەنی خاریق و ئەفسانەیی و گواستنەوەی ژیانی مرۆڤ لە زەمەنێكی دیاریكراوە و بۆ زەمەنی جاویدانی، كە ئەمەش دەربزبوونە لە زەمەن. لەبەر ئەوەی ڕوباری زەمەن بە بایەخترین و بەهاترین شتی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێ و لای دەبات، كە ئەویش خودی ژیانەو مەرگ دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ ژیانی لە دەست بدات،بۆیە ناچار مرۆڤ پەنای بردووەتە بەر ئەفسانە و

دین بۆ ئەوەی لە ڕێگەیانەوە بە سەر زەمەندا زاڵ بێت و بگاتە نەمری و بتوانێت لە ڕێگەی ئاینیەوە قەرەبووی ئەو ژیانە بکاتەوە کە زەمەن لێی دەستێنێت[1].

ڕاکردن لە چنگ مەرگ و مردن و هیوای نەمری و بەردەوامبوون لە ژیان بە شێوەیەك لە شێوەکان لای زۆربەی میللەتان هەبووە بۆیە لەئەفسانەی میللەتان و لە ئاینەکاندا مرۆڤ توانیویەتی لە زەمەنی ئاسایی دەربچێت و بڕواتە زەمەنێکی دیکە یان (دەرەوەی زەمەن)، یادەوەری مرۆڤ هەندێك جار هزرو هۆشی مرۆڤ ناچار دەکات بەرەو ئاینده یان ڕابردوو بگەڕێتەوەو مرۆڤ ئارەزووی ئەوەی کردووە کە لەزەمەنی ئاسایی دەربچووباو بگەیشتبایە دەرەوەی زەمەن و هەمیشە حەزی کردووە کە بیتوانیبوایە بۆ ماوەیەك لە کات و سەردەمەکانی پێشوودا ژیابا بە تتایبەتی ئەو سەردەمانەی کە کەسایەتیە دیارەکانی وەك (بوودا، مەسیح، سوکرات ...) یان تێدا ژیاوە . مرۆڤ نەیتوانیوە ڕێگایەك بۆ درێژ بوونی تەمەن یان نەمری بدۆزێتەوە، تەنیا بە وەستانی زەمەن نەبێت، چونکە بە وەستانی زەمەن مرۆڤ دەتوانێت ئەم هیوایە بێنێتە دی و ژیان نوێ بکاتەوە یان درێژە بە ژیان بدات و بەسەر زەمەندا زاڵبێت، هەروەك لە حیکایەتی (یاوەرانی ئەشکەوت) یان (گەڕانەوەی مەسیح) یان (گەڕانەوەی ئیمام مەهدی) دا ڕەنگی داوەتەوەو بەدی دەکرێت[2].

لە ڕاستیدا کۆمەڵێك ئیقاعی زەمەنی لای مرۆڤ هەبوەو ناسیویەنی لە ڕێگەی گوێگرتن لە میوزیك، کەوا لە مرۆڤ دەکات لە زەمەن بچێتە دەرەوە،یان کەوتنە داوی خۆشەویستی،یان ئەنجامدانی نوێژ و سرووتی ئاینی مرۆڤ لە زەمەنی ئاسایی مێژووی دەرچووە و چووەتە ناو زەمەنی ئێستایەکی ئەبەدی ئەو زەمەنەی کە ئەڤیندار و پەیڕەوکەرانی سرووتە ئاینیەکان تێیدا دەژین[3].

مرسیا ئەلیاد ڕەگوڕیشەی وێنە بیەکانی دەربازبوون لە زەمەن بۆ سێ خاڵ دەگەڕێنێتەوە:

**١ – ئەو وێنەی کە دەلالەتی سڕینەوەی زەمەنە،لە ئاکامدا دەلالەتیشە لە سەر ئەو درەوشانەوەی کە کاری داپچڕانی ئاستەکانی لە ئەستۆ گرتووە.**

٢ – ئەو وێنەیەی کە گوزارشتە لە و دۆخەی کە مەحاڵە لێی تێبگەیت: وەك جێگیر کردنی خۆر لە گەردووندا، نەمرکردنی هەست و شعور.

---

١ الزمن في الفكر العربي و العالمي- د. علي شلق- بيروت- ل٤٠-

٢ الزمن في الفكر العربي و العالمي- ل٤٠

٣ صور و رموز- ميرسيا الياد، ترجمة، حسيب كاسوحة- دمشق- ١٩٩٨ - ل٤٠

٣ – وێنەی (ساتی هاتوو) هەڵگری بەر بەرەکانیەکان،کە بۆخۆی پارچیەکە لە زەمەن و گۆڕاوە بۆ (ساتی درەوشانەوە) [١].

بەم پێیە خۆ دەربازکردن لە زەمەن دەربازبوونە لە مانا هەمیشەییەکانی ژیان، چونکە ژیانی ئاسایی سەرنج ڕاکێش نیە و هەرگیز ناتوانێت لە ناو مێژوودا مانای ڕاستە قینە بدۆزیتەوە،بۆیە مرۆڤە دێرینەکان وایان پێ باش بووە لە دەرەوەیدا ڕابووەستن.

## - فەنابوون و زەمەن:

ئەرکێکی سەرەکی ئایین بریتیە لە وەڵامدانەوەی نهێنی و ڕازی زەمەن، کە بریتیە لە بێ بەش کردن و مەحروم کردن و نەبوونی ئارامی لە ژیاندا هەروەها ترس لە مردن و فەنابوون، لە بەر ئەوەی مرۆڤ دەسەڵاتی لەسەر قەدەرو چارەنووس نیە،ئەمەش بووەتە مایەی نیگەرانی مرۆڤ.ئەو چارەسەریەی کە ئایین پێشکەشی مرۆڤی کردووە بریتیە لە زیندوو بوونەوەی مرۆڤ دوای  مردن و چوونە بەهەشت و بە دەستهێنانی ژیانی ئەبەدی و گەیشتن بە پلەی (نرڤانا) [٢].

لەلایەکی دیکەوە،ئێستای سروشت و مرۆڤ ئاوێتە و تێکەڵی ڕابردوو وداهاتوو دەکات،بەم شێوەیە ئەو زەمەنەی دەبێتە بەشێك لە یاسا(ناموس)ێکی باڵاترو گەورەتر بۆ نوێکردنەوەی ژیان بەشێوەیەکی هەمیشەیی و بێ کۆتایی،بەم جۆرە بەسەر مردن و فەنابووندا زاڵ دەبێ ئەمەش ئەوە دەردەخات کە هیچ شت و بونەوەرێك لە ناو ناچێت و شی نابێتەوە،بەڵکو دووبارە پێکدە هێنرێتەوە و لە دایك دەبێتەوە.لە ڕوانگەی هەندێك لە ئایینەکانەوە،خولی زەمەن هەرگیز نامرێت و فەنا نابێت،بەڵکو هەمیشە دووبارە دەبێتەوەو شتەکان لە دایك دەبن و دروست دەبنەوە،ڕەنگە هەر ئەم بڕوایە وای لە مرۆڤی چاخی بەردین کردبێت مردووەکانیان وەك حاڵەتی کۆرپەلە لەناوخاکدا بنێژن،بە هیوای ئەوەی جارێکی دیکە لە دایك ببێتەوە [٣].

وەك دیارە مرۆڤی نیاندەرتاڵ مردووەکانیان ناشتووە، ئەمەش مانای ئەوە دەدات کە مرۆڤ بیری لەوە کرووەتەوە کە پێوەندی لەگەڵ مردووەکان نابڕێت،هەروەها باوەڕکردن بە دۆنادۆن (کراس گۆڕین)لای هیندۆسەکان و ڤیتاگۆرسییەکان بەم باوەڕەوە بەندە. هەروەها میسرییە کۆنەکان لە کاتی

١  گۆڤاری  ئاینده-عدد، ٨-٩)- ل٥٤

٢  - فكرة الزمن عبر التاريخ- ل١٢

٣  - هەمان سەرچاوە-  ل ١٢

ڕێوڕەسمی ناشتنی مردووەکانیان وێنەی خواوەند (ئۆزیس)یان دادەنا،وەك هێمایەك بۆ زیندووبوونەوە و دووبارە ژیانەوە، هەروەك چۆن بە پێی ئەفسانەی میسرییەکان (ئۆزیس)مرد و دوای ئەوە جارێکی دیکە زیندوو بووەوە.کەواتە هەموو ئەو هەوڵانە هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا خۆ ڕزگاردن بووە لە مردن و ناسۆرییەکانی ژیان و نەخۆشی و ئالۆودەبوون،هەر لە سەرەتاوە ترس لە مردن و فەنابوون وای لە مرۆڤ کردووە مانایەکی باڵای یەزدانی ببەخشێتە زەمەن و بیروباوەڕەکانی لە ئەفسانەیەکدا کۆکردووەتەوە و چەمکی زەمەنی ئێستای نەوەکان دیاری بکات.مەرگ بەو مانا سەرتاپاگیرەی کە جیهانی سروشت و بوونەوەرەکانی تەنیوە لە زۆربەی ئەفسانەکاندا وێنەی پاڵەوانێکی نەمرمان بەرچاو دەکەوێت،ئەو پاڵەوانەی هەرگیز نامرێت و زەمەن چۆکی پێ دانادات .لەبەر ئەوەی مرۆڤ تەواو تامەزرۆی نەمری و ژیانێکی ئەبەدییە،شەڕی هەرە گەورەشی لەگەڵ مەرگدا تەنیا لە خەیاڵ و وێناندنە ئەفسانەییەکانی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت،بەم شێوەیە ئەفسانەو ئایینەکان هەوڵیانداوە بەسەر زەبرو سەدمەو کلۆڵی ژیاندا زاڵبن، بەوەی کە ترسیان لە مردن و زەمەن نامێنێت و دنیای ئێستا لەگەڵ جیهانی پیرۆزو ئەبەدیەت هاوجووت دەکات.واتە ئەرکێکی سەرەکی ئەفسانە و ئایین بریتییە لە زاڵبوون بەسەر فەنابوون و نیگەرانی مرۆڤ لە مەرگ و فەنابوون[1] .

زەمەن کە سیفەتی بنیات و مەدلوولی شاراوە وتێکهەڵکێش دەخاتە دووتوێی خۆیەوە لە هەمان کاتدا بەبێ مەرجی پێش وەختە و بەبێ گرنگیدان بە واتاو مەدلوولی بە زەمەن کردنی رووداو بەرجەستەی زەمەنێکی بەکێشەکراو دەکات. زەمەن لە جەوهەردا لە دەلالەتدا کاردەکات و لەگەڵ دەلالەتی بنیاتە شاراوەکانی سەردەمەوە زیندوویێتی بەخۆی دەبەخشێت و جووڵە بە خۆی دەبەخشێت[2] .

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە نەمریدا زەمەن مانای خۆی لەدەستدەدات و تەنها مردن ئیمکان بوونی زەمەن دێنێتە کایەوە. هەوڵەکانی مرۆڤیش بۆ رزگاربوون لە دەسەڵاتی سیحری زەمەن، رزگاربوون لە بەها باوەکانی زەمەن، رزگاربوون لە دووبارەبوونەوەی باری خود، هەر بەردەوام بووە.

---

١ - هەمان سەرچاوە- ل ١٣

٢ تیۆری بنیاتی شاراوە- ل٦٧

- **ئاینده و نەمری:**

هیچ بیرۆکەیەك بەقەدەر بیرۆکەی نەمری بیرو هزری مرۆڤی بەخۆیەوە خەریك ومژول نەکردوە، لەبەر ئەوەی مەرگ و فەنابوون هەڕەشە و ترسێکی گەورە بووە بۆ مرۆڤ، بۆیە مرۆڤ لە هەموو سەردەمەکاندا ئامادەبوە، کارو کۆششی گەورە بکات لە پێناو بەدەستهێنانی نەمری، ئەوە بوو ئایین توانی ئەم هیواو ئاواتەی مرۆڤ بێنێە دی، بەلاّم بە ئاست و شێوەیەکی دیکە، ئەویش لە فیردەوس. هەموو ئایینێك فیردەوسی خۆی هەیە و هەر یەك لەم ئایینانە رێباز وڕێگای دیاریکراوی داناوە و هەیە بۆ گەیشتن بەم بەهەشت و فیردەوسە، کەواتە ئەو خەونەی ئیمانداران بە گەیشتن ژیانی نەمری، هاتە دی، بەلاّم بە پەیڕەوکردن و جێبەێکردنی رێورەسمەکانی رابردوو، هیوای هێنانەدی ئاینده (زەمەنی خەون) زیاتر و مسۆگەرتردەبێت. کەواتە زەمەنی سێیەم زەمەنی خەونە قەشەنگەکانە، کە باوەڕدار هەڵگری خەونێکە بە ئاراستەی پاشەڕۆژ و کاردەکات لە پێناو گەیشتن بەو زەمەنە دورە، واتە جگە لە "ئێستا و رابردوو" ئاینده(زەمەنی سێیەم)ش بە شێکی گرنگی لە ژیان و هۆشی باوەڕدار پێکهێناوە و بەشێکی زۆر لە ژیان و سەردەمی ئێستای تەرخان کردوە بۆ بەرژەوەندی و هێنانەدی ئەو زەمەنە خەیاڵی و ئەندێشەیە[1].

لای مرۆڤی ئیماندار رابردوو بەهەشتە، ئێستاش سەردەمی جاهلیەت یان سەردەمی پەرتبوون و هەڵوەشانەوە، بەلاّم لەبەرئەوەی جولاّندنەوەی زەمەن هەرگیز جوڵەیەك نییە بەرەو دووبارەبوونەوە، لەبەر ئەوەی دووبارەکرنەوەی رابردووی بەهەشتی و دەربازبوون لە ئێستای دۆزەخی تەنها بە زیادکرنی رەهەندی سێیەم بەرقەراردەبێـ کە ئەویش رەهەندی داهاتووی بەهەشتیانەیە، ئەم رەهەندە سێیەمە مەرج نییە تەعبیر لە سەرهەڵدانی چۆنایەتییەکی نوێ بکات، بەڵکو لەوانە پرۆسەی بزواندن و تاودانیسیستەمی رابردووپەرست بێت بۆ مۆدیلەکانی خۆی، وزەدان بێت بە دەینامیکییەتی ناوخۆیتا بتوانێت تا قۆناغێکی دیکەش بڕیکات[2] . بێگومان رابردوو پەرستێك، کە دەیەوێت بەردەوامی بە رابردوو بدات تەنها ئێستای بۆ ئامادە ناکات، بەڵکو پاشە ڕۆژیشی بۆ

١ گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ٦- ل ٤٩

٢ گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ٦- ل ٤٩

ئامادەدەکات. رابردوو بۆ ئەوەی ئەو بەردەوامییە دروستبکات، هەوڵدەدات هەموو سیفەتە دزێوەکان بداتە پاڵ ئێستا، هەوڵدەدات کە دوورکەوتنەوەی ئێستا لە وێنە و ئایدیال و بەها رەسەنەکان بسەلمێنێت. نرخەکانی خۆی وەکو کۆمەڵێك نرخی بزر نیشانبدات تابیانکاتەنرخی یۆتۆپیایی. واتە ئێستا بچوکدەکاتەوەبۆ ئەوەی رێگا خۆش بکات وێنەی فیردەوسەکانی رابردووبەسەر جەستەی ئێستای هیچدا بەرەو داهاتوویەکی بەهەشتی بپەڕنەوە، هەر یەکێ لەو دوو بەهەشتەش لەسەر کوشتنی هەنووکە درووستبوون.

واتە مرۆڤی ئیماندار هەمیشە هەست بەوە دەکات کە لەناو دنیا و زەمەنێکی پیرۆزدا دەژی و لە دەرەوەی ئەو دوو زەمەنە پیرۆزە، زەمەن بێمانا و بێ دەلالەتە و بێ شێوەیە، لای ئەو تاقە زەمەنێك کە فۆرمی هەیە و مانای هەیە تەنها زەمەنی رابردووی پیرۆزە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئیمانداران تا پێیانبکرێت ئاوڕ لە لە دوواوە و لە رۆژگارە دوورەکان دەدەنەوە، لەناو وێنەکانی کەلەپور و خەیاڵەکانی رابردوو دەژین و دەخوازن دنیای ئەمڕۆ لەسەر هەمان شێوە و هەمان مۆدیلی دونیای جاران رێکبخەنەوە، هەروەها ئەوەمان بۆ روندەبێتەوە هەرچەندە مرۆڤی ئیماندار خۆی نزیکبکاتەوە لە زەمەنی دیینی، ئەوا دوردەکەوێتەوە لە زەمەنی دنیایی (واقیع) و هەرکەسێکیش لە واقعی ژیان دوربکەوێتەوە، ئەوا ناتوانێت کارا بێ لە ژیاندا.

ئایین کاتێك خۆی دروست دەکات کە یادگاری هەلومەرجە مێژوویەکان، کە منداڵدانی باوەڕەکانن، خۆی وەربگێرێتە سەر بنەمای (ترادیسیۆنێك) کە هەموو رووداوەکان دەخاتە دەرەوەی مێژوو و لە رێگەی هێزێکی نامێژوویەوە لێکیان دەداتەوە. لەم بزوتنەوەیەدا زەمەنی ئایینی، کە زەمەنی ئەزەلیەت و هەتاهەتاییە، خۆی جیا دەکاتەوە لە زەمەنی کۆمەڵایەتی کە لە نێو مێژویەکدا درووست دەبێت[١]. لە کاتێکدا کە هەموو شتەکان بە شێوەیەکی رێژەیی دەردەکەون و لە نێو (کۆنتێکستەکاندا) دروست دەبن و لە نێو زەمەندا چوارچێوەکانیان بینا دەکەن، حەقیقەتی ئایینی وەك رەها و نامێژوویی و نازەمەنی خۆی دەخاتە سەر شانۆ. لێرەدا عەشقی دین بەرەو عەشقی زەمەنە دێرینەکان وەردەگەڕێت، سۆزی مرۆڤی ئیماندار دەبێتە سۆز بۆ موقەدەسە دوورەکان.

---

١ ئایین چییە- ل٢٣١

(مۆریس ئەلڤاکس) پێیوایە لە هەموو ئایینەکاندا، رابردوو لە ئێستادا ئامادەیە و هیچ ئایینێك نییە، کە رابردوو نەکات بە سەرچاوەی سەرەکی و هەمیشەیی خۆی. ئەمە شتێکی ئاساییە، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە هزری ئیمانداری پەیوەندیەکی قوفڵدراو لەگەڵ رابردوودا دروست دەکات و پێشوازی لە فۆرمە ئایینەیکان دەکات وەك حەقیقەتی رەهای هەموو کات و شوێنێك[1].

ئەلڤاکس، پێیوایە: کۆمەڵگەی بیرچونەوە، واتە ئەو کۆمەڵگەیەی رابردووی خۆی لەبیر دەکات، کۆمەڵگەیەی لە دەستدانی شوناسە و ناتوانێت مامەڵە لەگەڵ داهاتوویدا بکات[2].

لێرەدا دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە رابردووی جوان، تێزی بەهەشتە بەسەرچوەکان رووبەرێکی گەورەی ژیان و روانینی ئیماندارانی داگیرکردوە و لای ئەو هەمیشە دۆزەخ ئێستایە و بەهەشت یان لە رابردوو یان لە داهاتوودایە . واتە ئایدۆلۆژیای باوەڕداری ئەوەیە کە ئێستا وەکو دۆزەخێکی تاریك وێنابکات. ئێستا وەك کاتی هەرەس و وێرانەیی لە قەلەم بدات.

هەروەها بەکەمنرخاندنی ئێستا و بەسووك تەماشاکردنی هەنووکە جەوهەرێکی میتافیزیکی قوڵی داوەتە گوتارەکانی ئیمانداران.

### - پێشبینی و زەمەن:

بەردەوام و بە درێژایی مێژوو، مرۆڤ ویستویەتی ئایندە و داهاتوو کۆنترۆڵ بکات و بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، یان هەر هیچ نەبێ پێشبینی بکات، و هەر ئەم مەبەستە وای کردوە کە ئەستێرەخوێنەکان (المنجم) لای گەل و میللەتە کۆنەکان باو وبلاّو بێت.

پێشبینی کردن رەهەندێکی خەیاڵیە بەرەو ئایندە لێدەدا و تێدا ئاماژە بە جیهانێك دەکا کە لەوانەیە هەمووی لەسەر بنەمای خەون و خولیا و ئاوات و ئارەزوو دامەزرابێ، بەلام لە هەمان کاتیشدا پیشاندەری راستی ویست و داخوازیەکانی دەرونی ئەو مرۆڤەیە کە خۆی نوقمی زەریای پێشبینی کردوە.

ئێمە دەزانیین یەکێك لە سێ رەهەندەکانی مێژوو، داهاتووە و مرۆڤ دەتوانێت پێشبینی داهاتوو بکات و خەیاڵی بۆی بچێت و لە پێناو ئەمەشدا سوود لە ئەزموونی رابردوو وەربگرێت. لەبەر ئەوەی توانای مرۆڤ لە دەرکپێکردن و جیاکردنەوەی شتەکان لەیەکتری، وا لە

---

١ ئاین چییە- ل٢٣٢

٢ ئاین چییە- ل٢١٧

مرۆڤ دەكات بونەوەرێكی هۆشیار بێت و كاروكردەوەكانی خۆی بنرخێنێت و هەڵبسەنگێنێت، هەر ئەم توانایەش وادەكات مرۆڤ دید و روانینێكی بۆ داهاتوو هەبێ [1]. هەروەها لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەمیشە هیوای بە ژیانێكی خۆشتر و باشتر هەبوە و بەبێ هیوا و ئومێد ژیان ئەستەم دەبێت، هیواش وەك فاكتەرێك، پەیوەندی بە داهاتوو هەیە.

وەك دیارە، هەر لەو كاتەی كە مرۆڤ لەسەر زەوی پەیدابووە حەزی كردوە، چارەنوس و ئایندەی خۆی بزانێت و و بە تاسەوە ئارەزوی ئەوەی كردوە، بزانێت داهاتوو چی بۆ ئەو داناوە یا شاردۆتەوە.

لای زۆربەی ئەو فەیلەسوفانەی باسی زەمەنیان كردوە، هەنووكە خاڵی بەیەكگەیشتنی رابردووە لەگەڵ داهاتوو، بەڵام لە روانگەی سایكۆلۆژیەوە، هەنوكە ئەوە نییە وجیاوازە لەو شتە، لەبەر ئەوەی تەنها ئێستا لە چەقی هەست و هۆشماندایە و مرۆڤ زیاتر هەست بەو شتانە دەكات كە روویانداوە و كەمتر هەست و هۆشی هەیە بەرامبەر ئەو داهات و شتانەی كە لە داهاتوودا روودەدەن، بۆ نموونە كاتێك كەسێك ددانێكی لە بەیانیەوە تا شەو ئازاری هەبووە، ئەوا ئازارەكە لە چەقی هەستی هەنووكەدایە، هەرچەندە ئەو شتانەی كە خواردویە یان خواردویەتیەوە، بۆتە رابردوو [2].

هەندێك لە بیرمەند و زانایان پێیان وایە، كە مرۆڤ ناتوانێت خۆی لە رووداوەكانی داهاتوو دەربازبكات، واتە لەو چارەنوسەی كە بۆمان داندراوە و تەنها ئەو كاتە داهات و رووداوەكە كەشف و ئاشكرادەبێت، كە دەگەینە دوا وێستگە لە روانگەی ئەمانەوە، مرۆڤ رایندەیە و لەبەردەم چارەنووس و قەدەر هیچی لەدەست نایەت، چونكە ئەو تەنها پنت و خاڵێكی شریتی زەمەنە. كەچی هەندێك زانای دیكە، دژی ئەم دید ز بۆچونەن و پێیان وایە، مرۆڤ دەتوانێت داهاتووی خۆی بگۆڕێت، چونكە ئایندە شتێكی نەگۆڕو چەسپاو و حەتمی نییە، بەلكو ئەگەر مرۆڤ ویست و ئیرادەی هەبێت، ئەوا دەتوانێت ئاراستەی رووداوەكان بگۆڕێت و خۆی لە مەترسیەكان دوربخاتەوە و ئایندەیەكی باش بۆ خۆی بونیادبنێت [3].

لای هەندێك زانا بیرۆكەی پێشبینی كردن بیرۆكەیەكی نامۆ و سەرسورهێنەرە و گومان لەو جۆرە شتە دەكەن.

---

١ - فلسفة الوعي بالزمن- مجلة (الثقافة الاجنبية- عدد، الثاني، سنة ا الثانية — بغداد- ١٩٨٢- ل ٣٩

٢ دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد- ل ٧١

٣ دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد- ل ٧١

پێشبینیکردنی داهاتوو، وادەخوازێت کە دەبێت مرۆڤ لە زەمەنی هەنوکەدا زانیاری سەبارەت بە ئایندە هەبێت[1]. پێشبینی داهاتوو، واتە کەسێك دەزانێت لە داهاتوودا چ روودەدات، پێش ئەووەی رووبدات، ئەمەش جۆرێکە لە توانا و دەرکپێکردن لە سەرەوەی هەستەکان، واتە پێشبینی بازدان و رەتبوونە بەسەر زەمەن و شوێندا[2]. گەلێك پرسیار لەم بوارەدا قیت دەبنەوە، وەك، چ دەبێت ئەگەر داهاتوومان زانی؟ ئایا دەبێ سەرەدەری و مامەڵە لەگەڵ داهاتوودا بکەین؟ ئایا دەتوانیین کاریگەریمان هەبێت لەسەر رووداوەکانی داهاتوو؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێت رێگە لە کارەساتێك بگرێت کە لە داهاتوودا روودەدات؟

هەروەها پێشبینی لە روانگەی کەلەپوری ئایینیدا، مانا و دەلالەتی دیکە وەردەگرێت و مەبەست لە (پێشبینی) وەکو کۆمەڵە ئامراز و چەکێکی ئایینی و لە روانگەی هەندێك ئایینەوە، ئەو چیرۆك و ئەفسانانەن کە دەربارەی داهاتوون و پێشبینی داهاتوو دەکەن، بە تایبەتی کۆتایی رۆژگار و کۆتاییهاتنی دونیا. ئەو چیرۆکانە بە شێوەیەك دادەرێژرێتەوە، کە دەبێتە پێشبینیەك دەربارەی داهاتوو، لە کاتێکدا لە رابردووئەم بەسەرهات یان چیرۆکە روویداوە، بەڵام بیری ئایینی دوای دەسکاریکردن و گشتاندن و گونجاندن دەیکاتە چیرۆکێك دەربارەی داهاتوو، بە تایبەتی کۆتایی رۆژگار. ئەوەش واتە واقیعی پشتی ئەو پێشبینیە، واتە ئەو چیرۆکە دوارۆژیە ببینینەوە، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ رابردوو، نەك واقعێکی دوارۆژ خەیاڵ بکەین،چونکە چیرۆکەکە لە رووداوێکی رابردوو دەرهێنراوە و کراوە بە پێشبینی بەو پێیەی رووداوەکە لە داهاتوودا روودەدات.

**- قەیرانی زەمەن لای مرۆڤی ئیماندار:**

هەموو ئایینێك لە نێو فۆڕمە رەمزیەکاندا، بەرهەمهێنەری مێژووی کۆچ و راس و گەل و رووداو جەنگ و نوێکردنەوەی ئەو ریفۆرمانەیە کە بە رەگ و یشەی کۆمەڵگاندا چونەتە خوارەوە. دینامیەتی نەریتی ئایینی لەوەدایە کە دەتوانێت، گرەوە هەنوکەیەکانی کۆمەڵگە، لە نێو ریت و ئیماندا رێك بخات. مەبەست لەو ریت و ئیمانانەیە کە لە رابردووەوە دێن و لە

١ دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد- ل ٧٣

٢ دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد- ل ٧٧

نێو ئێستا و ئێرەکانماندا درێژە بە تەمەنی خۆیان دەدەن[1]. کولتوری ئایینی، بەردەوام بانگهێشتی رابردوو دەکات بۆ بایکۆتکردنی ناشیرینیەکانی ئێستا. لێرەوە رابردوو لای ئیمانداران وەردەگێردرێتە سەر چەکی ململانێ دژ بە ئێستای رەفزکراو[2]. بۆیە ژمارەیەکی زۆری ئیمانداران تەنها یەك ئەرکیان لە ئەستۆدایە، ئەویش ئەرکی راگرتن و چەسپاندنی ئێمەیە لە رابردوودا. ئەو جۆرە لە ئیمانداره کارمەندانە بە حوکمی ئەوەی زانستەکان دەپارێزن و دەیانگەیەنن، هەمیشە لەناو قۆناغەکاندا لە نیوەی رێ وەستاون، هەمیشە لەناوەراستی زەمەنە جیاياکاندا دەژین و هەرگیز لە ئێستادا ناژین، چونکە لە "ئێستادا ژیان" مانای ئەوەیە کەلە دروستکردندا بەشداربیت[3]. ئەرکی ئەوان ئەوەیە، رابردوو، وەکو کۆمەڵێك نەریت و شێوازی ژیان و بیرکرنەوە و هەڵسوکەوت، بپارێزرێت و نەمرێت. رابردوو هەلبەت وەك چەند راستیەکی نەگۆڕ خۆیان نیشاندەدەن، چەند راستیەك کە وادێنە پێش چاو ئەزەلین و مرۆڤایەتی هەتاهەتایە پێویستی پێیانە، هەروەها ئەوان لە پێناوی بەرابردووکرنی ئێستاشدا لەکاردان؟ بەم کردارە نابنە دروستکەری مێژوو، ئەوان بەشداری ناکەن لە گۆڕینی ئاراستەی شتەکان، بەڵکو دەبنە پارێزەر و تۆمارکەر[4]. ئیمانداری نەریتپارێز کاتێك کە ئێستا تۆماردەکات بەشداریناکات لە خولقاندیا، بەڵکو بەشداری دەکات لە هەڵگرتنیا، ئێستای لە پێناو رابردوودا دەوێت.پێویستە ئەوەش بزانیین، کە ئەرکی ئیمانداران ئاڵۆزە، چونکە فەرمانیان چاندنی کەلتور و ئایدۆلۆژیاکانی رابردووە. رابردووش مانایەکی بێڕەنگ و بێدەنگ و بێشێوەو بێسنورە.

عەقڵیەتی ئیمانداریش ئەو عەقڵیە، کە لە رەفتار و کرداری رۆژانە و ئەنجامدانی سرووتە ئایینیەکان و هەڵسوکەوتی مرۆڤی ئیماندار دەبینرێ و هەست پێدەکرێ.

ئێمە دەزانیین کە زەمەن بێ لایەنە و لاگیری لە زەمەندا بە دید و بۆچونەکانی مرۆڤ. لە رووی بابەتیەوە جیاوازی زەمەنێك لەگەڵ زەمەنێکی دیکەدا نییە، مەگەر تەنها لە هزرو و باوەڕی مرۆڤەکاندا، ئێمە لێرەدا کاتێك باسی زەمەن دەکەین مەبەستمان زەمەنی روت و موجەڕەد نییە، بەڵکو مەبەستمان ئەو زەمەنەیە کە پەیوەستە بە هزر و روانینی مرۆڤەوە، بە

١ ئاین چییە- ل٢٢٦

٢ ئاین چییە- ل٢٢٩

٣ گ- رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨ — ل١٢

٤ گ- رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨ — ل١٢

تایبەتی لە ڕەهەندی ئایینی و ئیمانداریدا. واتە مەبەستە لە زەمەنە وەك چوارچێوەیەك بۆ بیرو و خواستەكانی مرۆڤ. نەك ئەو زەمەنە دەرەكیەی پەیوەستە بە سروشتەوە، كە لە پەیوەندی و هزرە مرۆییەكان داماڵراوە[1].

كەواتە لەم ڕوانگەیەوە، زەمەن و هەستكردن بە زەمەن یەك جۆر و یەك شتی بابەتیانە نییە، بەڵكو جیاوازە بە جیاوازی دید وبۆچونی خەڵكەكان و كارو پیشەكان. زەمەن لای مێژوونوسێك جیاوازە لە زەمەن لای ئافرەتێكی ماڵەوە، زەمەن لای نوسەرێك جیاوازە لە زەمەن لای بازرگانێك، زەمەن لای بێباوەڕێك یایە لە زەمەن لای باوەڕدارێك، ئەمەش ئەوە دەردەخات كە زەمەن لێرەودا خودی و ڕێژەییە[2].

كەواتە دید و ڕوانینی خەڵك و كەسەكان بۆ زەمەن، جیاناكرێتەوە لە باوەڕ و ڕێباز و ئاراستەی ژیانیان و تایبەتمەندی كارەكەیان، بۆیە گومانی تێدانییە كە ڕوانین فەلەكناسێك بۆ زەمەن جیایە لە ڕوانینی ڕۆژنامەنوسێك بۆ زەمەن. بۆیە ڕوانگە و چاودێری زەمەن لە ڕەفتار و قەناعەتی خەڵكدا ڕەنگی داوەتەوە و لە ژیانی كۆمەلأیەتیاندا بەدەردەكەوێت، هەروەك چۆن شێوازی یان كاریگەری دیاری هەیە لەسەر دید و ڕوانینی كەسەكان بۆ زەمەن، هەروەها تێگەیشتنیان بۆ زەمەن كاریگەری هەیە لەسەر ڕەفتاری كەسەكان و بە گوێرەی بۆچوونیان لەمەڕ زەمەن ڕەفتار و هەڵسوكەوت دەكەن، بۆیە زەمەن لای ئەم جۆرە كەسانە (بەتایبەت مرۆڤی باوەڕدار) بۆتە ئایدۆلۆیا یان دۆگمایەك كە ناتوانن لێی دەربازبن.

لای مرۆڤی باوەڕدار، زەمەن دەكرێتە سێ بەش: دوو زەمەنی ڕەسەن و موقەددەس، زەمەنی سێیەمیشیان زەمەنێكی نارەسەن و ناپەسەندە. ئەم سێ زەمەنە لای ئیماندا تێكەڵاوی یەكترن، واتە لەیەك كات و ساتدا لە سێ زەمەنەكەدا دەژی، زەمەنەكانیش بریتین لە: ١- ئێستای تێكچوو و سەرچاوەی خراپە: بە شێوەیەكی گشتی ئیماندار ناسازێت لەگەڵ زەمەنی ئێستا و هەنووكەدا، پێوایە ئێستا زەمەنێكی گوناهبار و تاوانبارە، چونكە زەمەنی لادانە لە بنەچەكانی ئایین، هەروەها چوونەدەرەوەشە لێی، بۆیە وەلاء و دڵسۆزی بۆ بۆ زەمەنەكانی دیكە هەیە و بڕوای وایە كە دوو زەمەنەكەی دیكە پاك و بێگەرد و موقەددەسن، كۆششكردن بۆ نزیكبونەوە لەو زەمەنە پاكانە ڕێگای ڕزگاری و دەربازبوونە. ئێستا لای ئەو ڕووبارێكی بۆگەنە

---

١ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ –ل ٨٦

٢ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ – ل ٨٧

و مرۆڤ دەبێت رووبەرووی ببێتەوە و ململانێی لەگەڵدا بکات و هەر سەهو و هەڵەیەك مرۆڤ بیکات لەم زەمەنەدا کە زەمەنی غەریزە و هەوەسە کوشندەکانە، ئەوا توشی هەلاکەت و فەوتان دەبێت. جالێرەدا پرسیارێك قیت دەبێتەوە، چۆن مرۆڤی باوەڕدار دەتوانێت لەگەڵ ئەم زەمەنەدا بسازێت؟ کەچی ئەو (ئیماندار) هیواخوازی (کەماڵ)ە. ئەو لەم زەمەنە رازی نییە، بۆیە هەوڵدەدات لەم زەمەنە رزگاری بێت و داوای زەمەنێکی دیکە دەکات، لێرەدا ئەو (مرۆڤی باوەڕدار) پەرت و پەرش کراوە لە نێوان زەمەنی واقیع و زەمەنی خەون[١].

ئیماندار ئێستا دەکات بە رابردوو و و تیایدا دەژی و زەمەن دەوەستێنێ، باوەڕی بە پەرەسەندن نییە کە یاسای ژیانە، چونکە هۆش و هزرو بیری پەیوەستە بە ساتەکانی یەکەمینی دامەزراندنی ئایینەکە، ساتەکانی دامەزراندنیش لای ئەو ساتی پاك و موقەدەس و بەرائەتە و زەمەن و ساتەکانی دیکە هیچیان ناگەنە پلە و پایەی بەرائەتی ئەو دەم وساتە زەمەنیە[٢].

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پشێوی و شپرزەیی لە ژیانیدا دروست دەبێت، چونکە ئەو حەز دەکات بگاتە ئەو چرکە ساتە و ئامادەگی هەبێت، ئەمەش ناکرێت و شتێکی ناواقعیە، بۆیە ناچار دەبێت لە خەیاڵگەی خۆیدا بەدیلی ئەم ساتە بدۆزێتەوە تاکو بگاتە زەمەنی خەونەکان. بۆیە رابردووی پیرۆز، لە ژیانی ئیمانداردا ئامادەگی هەیە و هەمیشە خەون بە رابردووەوە دەبینێت و کۆشش دەکات بۆ زیندوکردنەوەی ئەو رۆژگارە[٣].

بڕواداران هەمیشە بە دوای رەسەنایەتیدا دەگەڕێن و بڕوایان وایە کە لە قوڵایی مێژوودا، لە ئاستە هەر قوڵەکانی رابردوودا راستیەك هەیە، بۆیە رەسەنایەتی ئەو خورافەتە دروستیکردوەکە گوایە ئێمە لەم ساتەدا "جەوهەری" خۆمانمان دۆڕاندوە و دەبێت بەدەستیبهێنینەوە. لەم دیدەوە "ئێستا" ساتێکی دۆڕاوە، ساتی وونبوونە ساتی داڕمانە، راستیەکان و جەوهەرەکانیش لە رابردوودایە، بەم جۆرەجەوهەری ئێمە بەهایەك و مانایەك و رەگ و ریشەیەکی وونە کە دەبێت لە وێڵگەکانی رابردوودا بیاندۆزینەوە. ئێمە ئێستا رووتین و بۆ داپۆشینی عەورەتمان دەبێت ئەو کراسە بدۆزینەوە[٤].

---

١ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ — ل ٨٧

٢ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ — ل ٨٨

٣ التخلف الاجتماعي- مستةفا حجازي- لبنان- ١٩٧٦- ل١٦٢

٤ گ- رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨ —ل ٢٨

رابردوو به هەموو رووەکانیەوە پانایيەکی ئێجگار فراوانی هەیە لە ژیانی ئیمانداردا و لای ئەو رابردوو پێوەرە بۆ ژیانێکی سەرفراز، بۆیە کاردەکات بۆ گەڕاندنەوەی بە شێك لە فۆرم و شکلیاتی رێورەسمەکانی رابردوو، ئەمەش بۆ دەرخستنی پابەندبوونی ئیماندار بە ئایینەکەی لە پێناو بەدەستهێنانی رەزامەندی خودا. ئیماندار هیواخوازە و هەوڵدەدات، دڵ و دەروونی خۆی و خەڵکی شەحن بکاتەوە بە هێماو بەهاکانی رابردوو و زەمەنی دامەزراندن، ئەمەش بۆئەوەیە، ئەوە پیشانبدات و ئیحای ئەوە بکات کە دەکرێ زەمەنی رابردوو لە ژیانی ئێمەدا بەردەوام بێت و ئامادەگی هەبێت، بە تایبەتی لە کاتی جەژن و بۆنە ئایینیەکاندا[1]. لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە مرۆڤی باوەڕدار نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ زەمەنی ئێستادا سازبکات و بگونجێنێت، بەڵکە بە پێچەوانەوە ئیدانەی دەکات، ئەگەر بە ئاشکرا و بەقسەش وانەڵێت، ئەوا کردەوە و هەڵسوکەوتەکانی ئەو شتانە دەردەخەن کە لە ناخی دایە بەرامبەر بەو زەمەنە هەنووکەیە. لای باوەڕدار هەنووکە بیٚ بەهایە و رزیوە، لەبەرئەوەی وەك رابردوونییە، بۆیە ئێستا دەکاتە رابردوو و تیایدا دەژی، بە هیوای گەیشتن بە ئا یندە (زەمەنی خەون). و پڕوای وایە کە سەردەمی رابردوو (رەسەن) هەمووی باش و بێگەردە، بەڵام زەمەنی هەنوکە هەمووی خراپ و دزێوە، بۆیە بەردەوام رادەکات بۆ ناو رابردووی رەسەن و شکۆدار، بەڵام دەبیٚ دەرك بەوە بکەین کە رابردوو قەڵای ئەو کەسانەیە کە نە ئێستایان هەیە و نەئایندە[2]. خورافەتی رەسەنایەتی بریتیە لەو یادەوەریەی کە ئێستایەکی ئیفلیج بە گوڵە وەهمییەکانی خۆی دەڕازێنێتەوە، بریتیە لە کاراکتەرێکی ئیفلیج کە مەزنیەکی وەهمی و جوانییەکی وەهمی و ئایدیال بۆ خۆی دادەنێت، بۆیە رەسەنایەتی خوێنەوەی عەقڵ نییە بۆ مێژوو، بەڵکو خوێندنەوەی یادەوەرییە بۆ مێژوو.

لای مرۆڤی باوەڕدار رابردوو و زەمەنی رەسەن و دامەزراندن پیرۆزە، لەبەر ئەوەی ئەو کاتەیەکە ئایین لەوپەڕی بێگەردی و بەرائەت دابووە، خەڵك و کەسانی ئەو سەردەم بیٚ کێە و بیٚ گرفت ژیانیان دەبردەسەر، هەروەها ئیمان لای کەسانی ئەو سەردەم لەوپەڕی قوڵی و بەهێزیدابووە، بۆیە مرۆڤی باوەڕدار هەمیشە و بە هەموو شێوەیەك دڵسۆزی خۆی بۆ رابردوو(رەسەن) دەردەخات و هیواخوازە سەردەمی پێغەمبەر و یارانی بگەرێنێتەوە، بڕوای وایە لە سەردەمی پیرۆزدا دەتوانێت سەرزەمینی خۆی بەجێبێڵیٚ و پەیوەندی بە بوونە

١ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ — ل ٨٨

٢ التخلف الاجتماعي- مستةفا حجازي- لبنان- ١٩٧٦- ل١٦٣

پیرۆزەکانەوە بکات، هەروەها پێیوایە کە ژینگە و رووداو کەسایەتیەکانی رابردوو، هێما و نیشانەن بۆ سەردەمی تەواوی و کەماڵ و لەم روانینەیاندا پشت بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەبەستن کە دەڵێ: (خیر القرون قرنی پم الڤی یلیه) [1].

ئەم جۆرە هزرو رەفتارکردنە ژیانی ئیمانداری دووچاری پشێوی و موفارەقە کردوە، تەنانەت هەندێك جاریش فەوتاندویەتی، ئەمەش لە ئەنجامی جیاوازی و ناکۆکی لە نێوان واقیعی ژیان و دڵسۆزیەکەی بۆ رابردوو(رەسەن) و دیارنەکردنی ئینتمایەکی دیاریکراو[2].

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە هەر کاتێك نەمانتوانی لە هەنووکەدا بژین، ئەوسا دەگەڕێینەوە بۆ ئەفسانەکان، بۆ بە خورافیکردنی بوونمان، خورافەتی رەگوڕیشە، ئەو خورافەتە ترسناکەیە، کە ئێمە ناتوانین دورگەی تایبەتی خۆمان بژین، ناتوانین تەنهایی خۆمان بژین، ناتوانین ئەو راستیە قبوڵبکەین، کە هیچ کەسێ لە هیچ زەمەنێکی دیکەوە ناتوانێت، دەستی یارمەتیمان بۆ درێژبکات. رەگوڕیشە ئەو هۆکارەیە کە لە رێگایەوە دەمانەوێت لە دەرگاداخراوەکانی زەمەنی خۆمان و سات و چرکەی خۆمان دەربازبین. لە گەمارۆی ئەم ساتە خۆماان بدزینەوە، رەگوریشە وێنەی ئەو خودا و تەوتەم و باوکانەیە کە لە دەرەوەی زەمەنەوە ئامادەیان دەکەینەوە.

لە راستیدا هیچ راستییەك لە رابردووا نییە هێندە مەزن بێت کە ئێمە راستی خۆمانی بۆ بدۆڕێنین، هیچ جوانییەك لە رابردوودا نییە شایستەی ئەوە بێت بگەڕێینەوە دواوە و تیایدا نیشتەجێبین.

---

١ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ — ل ٩٢

٢ العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩ — ل ٩٣

- **زەمەن و یادەوەری***:

مرۆڤەکان چیدەکەن بۆ ئەوەی یادەوەری خۆیان بپارێزن و بگوازنەوە؟

زەمەن و یادەوەری تێکەڵاوی یەکدی دەبن، ئەم دووانە لە دوو روی دراوێك دەچن و تەواو ئاشکرایە کە یادەوەری بە بێ زەمەن بوونی نابێت. بەڵام یادەوەری شتێکی ئاڵۆزە، تا ئەو رادەیەی هیچ بەیانکردنێکی خەسڵەت و سیفەتە تایبەتیەکانی ناتوانن کۆی ئەو سەرنجانە دیاری بکەن، کە یادەوەری لە رێگایانەوە کاریگەریمان لەسەر دادەنێت.

رۆماننوس و نوسەری بە توانا (بەختیار عەلی) پێیوایە، کە مرۆڤایەتی کەلەپوری خۆی بە تەنها لەناو کتێبەکاندا هەڵناگرێت، بەڵکو ئەو کەلەپورە لەناو شێوازی زیندەگی و کارکرن و فێرکرن و پەیوەندی نەوەکان و نەتەوەکاندا دەنووسێتەوە، باشترین جێگایەکیش کەلەپوری تیادا بپارێزرێت شێوازی ژیانە نەوەکو کتێبەکان. بەم پێیە یادەوەری ژیان و مانەوەیە لە رابردودا، بۆیە ژمارەیەکی زۆری رۆشنبیران تەنها یەك ئەرکیان لە ئەستۆدایە، ئەویش ئەرکی راگرتن و چەسپاندنی ئێمەیە لە رابردوودا[1]. ئەو جۆرە لە رۆشنبیرانی کارمەندبە حوکمی ئەوەی زانستەکان دەپارێزن و دەیانگەیەنن، هەمیشە لەناو قۆناغەکاندا لە نیوەی رێ وەستاون، هەمیشە لەناوەراستی زەمەنە جیایاکاندا دەژین و هەرگیز لە ئێستادا ناژین، چونکە لە "ئێستادا ژیان" مانای ئەوەیە کەلە دروستکردندا بەشداربیت[2].

رابردوو هەلبەت وەك چەند راستیەکی نەگۆڕ خۆیان نیشاندەدەن، چەند راستیەك کە وادێنە پێش چاو ئەزەلین و مرۆڤایەتی هەتاهەتایە پێویستی پێیانە، لە پێناوی بەرابردووکرنی ئێستاشدا لەکاردان؟ بڕێکی هەرەگەورەی کاری بە ئەرشیفکردنی ئەمڕۆ لە پێناوی یادەوەریدایە، واتە "یادەوەری" شتێك نییە هەبێت و بیپارێزین، بەڵکو یادەوەری شتێکە دروستیدەکەین. بڕێکی

---

* سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە لە نووسینی ئەم بەشەدا زۆر پشتم بە لێکۆڵینەوەیەکی نووسەر ورۆماننوس بەختیار عەلی بەستووە، کە بە ناوی "یادەوەری وزەمەن" لە گۆڤاری رەهەند ژمارە -٦-دا بلاوکراوەتەوە)

١- رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٢

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٢

گەورەی مێژووی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیش، دروستکردنی یادەوەریە. زۆر جار پرۆسەی "یادەوەری" پرۆسەی هەڵگرتن و پاراستنی رووداوەکان نییە، ئەوەندەی هەڵگرتن و پاراستنی دەلالەت و ماناکانیانە[1]. واتە یادەوری هۆکاری ئەو مانا هەمیشەییانەیە کە دەبێت بەردەوام بەرجەستە ببێتەوە. یادەوەری وەك تیۆرێك وایە کە بۆتە کەرستەی سیستەمێك کە لە رێگەی چەندەها کەناڵی دیکەی لەو جۆرەوە بەردەوامی خۆی و نەمری خۆی دەگەیەنێت[2]. یادەوەری دێت بۆ ئەوەی مانایەك بدات بە ئێمە و بە خۆشی، ئەو بەتەنها نایەت تا پێمان بڵێت ژیانەکانی تر چۆن بوون و چۆن کولتوری خۆیان بونیادناوە، بەڵام نیازە سەرەکیەکەی بەتەنها ئاگادارکردنەوە نییە، بۆیە پێویستە بە قوڵی لە زنیرە ماناکانی یادەوەری بڕوانیین[3].

ئێمە کە دەڵێین، هەستکردن بە ئێستا بە ئاشکرا مەبەستمان لەم قسەیە هەستکردنە بە ژیان، واتە هەستکردنە بە ژیان هەرگیز لە رێگای هەستکردن بە رابردووەوە دەستەبەر نابێت، هەروەك چۆن لە رێگای هەستکردن بە داهاتووەوەش ئامادەناکرێت. واتە کە دەڵێم من دەژیم واتە من لە ئێستادا هەم. ئێستاش چۆنایەتییەکی عەقڵیە پتر لەوەی چۆنایەتییەکی حسی بێت. ئەگەر هەموو قورسایی ئێمەش لە ئێستادا بێت، چۆناییەتی هەستکردنی ئێمە لە ژیان نابنە دوو رەگەزی مانابەخش، بەڵکو دەبێتە خودی ژیان خۆی.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، ئایا لەناو چۆنایەتیەکی نوێدا، چۆنایەتیە بەسەر چووەکان چۆن دێن و چی دەکەن و شێوەی ئامادەبونیان چۆنە؟ ئاخۆ هەموو چۆناییەتیەکی نوێ پەراوێزێکی هەیەبۆ ناو چۆنایەیتە بەسەر چووەکان کە لە راستیدا بوونی ئەو چۆنایەتیە نوێیە لە هەناوی ئەوانەوەنەهاتۆتە دەرێ، بەڵکو دابڕانێکە لە گەڵیاندا؟ واتە رابردوو لە ئێستادا چۆن بەردەوام دەبێت؟[4] بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، بەختیار عەلی پێیوایە، بۆ ئەوەی رابردوو چالاك و زیندووبێت، دەبێت لەوە دەرچێت پشتی بە حوکمەکانی راهاتن و خووپێوەگرتن قایمبێت. دەبێت چرکەکانی رابردوو بە چ مانایەك وەکو خۆیان لەو چرکەیەدا ئامادەبن، کە ئێستا هەر ئاوێنەی چۆنایەتیەکی تێپەڕبێت، مانای ئێستای نییە، بەڵکو مردنی زەمەنە لەسەر سنورەکانی

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٣

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٣

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٤

٤ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٧

"یادگار"دا. کەواتە رابردوو بۆ ئەوەی ببێت بە بەشێك لە چۆنایەتیە کی دیکە، دەبێت بکەوێتە ێر رەحمەتی چۆنایەتییەکانی دیکەوە، سیفەتە زاڵەکانی خۆی وونبکات، بۆ ئەوەی ببێت لە بەشێك لە پێکهێنەر و بونیادنەر[1].

کەواتە "ئێستا" تەنها بەو مانایە ئێستایە کە مافی راڤەکردنی جیهانی هەیە لە دیدگایەکی ترەوە. رابردووش بەو مانایە رابردووە کە مافی راڤەکردنی یان توانای راڤەکردنی نەماوە، بەم مانایەش رابردوو ئەو زەمەنەیە کە ئەگەرەکانی ئێستا نابینێت. رابردوو هەمیشە دەتوانێت لە بەرگی جۆراوجۆردا ئامادەبێت، بەڵام ناتوانێت راڤەبکات.

بەختیار عەلی لە میانی لێکۆڵینەوەکەیدا، پەیوەندیە بنەڕەتیەکانی نێوان (رابردو) و (یادەوەری) دەخاتەڕوو و بڕوای وایە، کە رابردوو لە رێگەی یادەوەری و فێرکردن و چۆنایەتیە درۆزنەکانەوە خۆی ئامادەدەکاتەوە، تارماییەکانی خۆی دەنێرێتە ناو ساتەوەختەکانی دیکە، بەڵام ناتوانێت ئەوەی نهێنیە لە ئێستادا ئاشکرای بکات، ناتوانێت وەك چۆن جیهانی پێش خۆی دەکرد بە بابەت، جیهانی دوای خۆیشی بکات بە بابەت، رابردوو ئەو چۆنایەتییەیە کە دەیەوێت سنوورێك بۆ مانای بابەتەکان دابنێت. رابردوو دەڵێت:" گەڕان و و پشکنیین لەم راستیانە زیاترمان پێنالێت" بەڵام لە بەرامبەر ئەم رستەیەدا دەکرێ بلێین" زەمەن هەمیشە شتی زیاترماان پێدەلێت"[2].

چۆنایەتی ئێستا وەك ساتێکی تایبەتی داخراو کە لە پێش خۆیەوە بەرهەمنەهاتووە، راڤەکردنێکە جیاواز لە راڤەکرددنەکانی دیکە، ئێستا لەلایەك خۆتاقیکردنەوەی بەردەوامی زەمەنەبەسەر دراوەکانی عەقڵ و جیهاندا لەم چرکەیەداو لەلایەکی تریشەوە خۆتاقیکردنەوەیە لە بەرامبەر رابردوودا. رابردوو لە بەرامبەر زەمەنی دوای خۆیدا وەکو کڵاوی جادوبازەکان وایە، هەر جالاەی شتێکی لێ دێتە دەرێ، ئێستاش کاتێك وەك چۆنایەتیەکی جیاوازلەگەڵ زەمەنەکانی تردا دەردەکەوێت...لێرەدا دەتوانین بڵێین هەر زەمەنە و رابردووی تایبەتی خۆی هەیە، کە لە هیچ رابردوویەکی دیکە ناچێت. بەم مانایەش بێماناترین رێگا بۆ سەیرکردن و هەڵسەنگاندنی رابردوو ئەەیە کە واتێبگەین کە رابردوو جەوهەرێکی نەگۆڕ و چەسپاوی هەیە، رابردوو جەوهەرێکی نەگۆڕی نییە..زەمەنێك نییە، بە جۆرێك روویدابێت بەیەکجار مانای خۆی

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٧

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٨

دابێت بەدەستەوە، بەڵکو بابەتێکی ئەبەدی راڤەکردنە[1]. هێزی رابردوو لەوەدا دەردەکەوێت چەندە لە داهاتوودا دەتوانێت مانای دیکە ببەخشێت.. رابردوو درەوشاوەیەکی جیایە، واتە رابردوو هەڵناگیرێت و لەبەرناکرێت، بەڵکو دادەهێنرێت یان دەدۆزرێتەوە. ئەو رابردووەی کە یادەوەری و فێرکردن دەیگوازنەوە، رابردوویەکی داهێنراو نیە، رابردوویەکی دۆزراو نییە، بەڵکو رابردوویەکی وێناکراو و شێوەیەکیلە قاڵبدراوە کە بەرهەمی زەمەنێکی دیاریکراوە، کە هەڵبەت مەبەستێیەتی مانایەکی نەگۆڕ باتە رۆحی رابردوو[2].

بۆ ئەوەی ئێستا بژین دەبێت خۆمان لەو دۆخە ئازادبکەین کە هەمیشە هەر ئێمە کوڕی رابردووین، بەرەو ئەو جیهانەی کە رابردوو کوڕی ئێمەیە، ئێمە لێرەدا دەیخولقێنینەوە، ئەو خولقاندنەش چۆنایەتی ئێمەیە لە هەمان کاتدا هێزی داهێنەرانەی عەقڵ لەم ساتەدا بەرجەستە دەکاتەوە[3].

کەواتە تا ئێرە زەمەن و مانای زەمەنمان دیاریکرد، دواتریش دیاریکردنی مانای چۆنایەتی لە ناو ساتە جیاوازەکانی زەمەنداو پەیوەندی چۆنایەتیە بەسەر چووەکان و شێوەی ئامادەبونیان لە ناو چۆنایەتی ئێستادا. هەروەها هەوڵمانداوە ئەوە نیشانبدەین کە زەمەن لە راستیدا گۆڕانی حالەتەکانە، هەر شتێکیش کە لە زەمەنێکەوە بەرەو زەمەنێکی دیکە دەکشێت مانای دەگۆڕدرێت و شوێنیشی لە سیستمی روانین و بیرکردنەوەدا دەگۆڕێت.

بەم مانایە رابردوو، کایەی نەخولقاوی ئەگەرەکانە و ئێستاش داهێنانی ئەو ئەگەرانەیە بە جۆرێك چارەنووس و مانایان تەواو پابەندی ئێمە بێت. رابردوو مانایەکی بێڕەنگ و بێدەنگ و بێشێوەو بێسنورە، کە بە بێ داهێنانی ئێمە نابێتە رەنگ و دەنگ و شێوە و سنوور، واتە رابردوو لە ئێستادا بەیەکجۆر بەردەوام دەبێت، ئەویش لە رێگای خۆ فڕێدانە ناو حاڵەتی "بێشوناسی" یەوە، رابردوو بۆ ئێمە وەکو شتێکی نوێ و بێشوناس دێتەکایەوە[4].

ئاخۆ بە ئاسانی رابردوو وازمان لێدەهێنێت، چۆنایەتی خۆمان و ساتی خۆمان دروستبکەین و ژیانمان ببێتە داهێنانێکی بەردەوام؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بەختیار عەلی پێیوایە بۆ ئەوەی

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٩

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٩

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٩

٤ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٠

بگەینە ساتێك کە بکرێت تەعبیر لە جەوهەری لێکپچڕاو و جیاوازو و نابەردەوامی زەمەن بکەین، دەبێت فیکرمان، هەستمان ئامادەی ئەو پرۆسە پچڕاندنە بێت[1]. هەروەها بڕوای وایە کە سیفەتی "بەردەوام —بوون" سیفەتی ناو ناخی زەمەن نییە، بەڵکو سیفەتی توێژەکەی سەرەوەیەتی. زەمەنی راستەقینە لە ناوەوە، زەمەنی جودابوونەوەی ئەو چۆنایەتیەیە کە یەك ئاماژە بۆ یەکدی ناکەن، بەڵکو یەك یەکتری راڤەدەکەن. بەردەوامی رووکەشی رووداوەکانە، ئەوەی کە راستەقینەیە، جیابوونەوەمانە لەیەکتر، جیابوونەوەی زەمەنەکانە، ئەو زەمەنەی کە ئێستا من و تۆ بەیەکەوە گرێدەداتەوە ناوکۆیەکی رووکەش و درۆزنە[2].

هەیە" رابردوو بە ئاسانی ئەو شێوە سەدیمیە وەرناگرێت، بە ئاسانی نابێت بۆ رووبەرێکی کراوە بۆ راڤەکردن و ئەگەرکاری.. .تەنها چۆنایەتیەکی کامڵ و چڕوپڕ لە ماناو هەست و نەغمەی تایبەتی دەتوانێت ئەو راڤەکردنە پیادەبکات و رابردوو لەبەر دەستیا ببێتە بابەت و کەرەستە و تاقیگە. بە مانایەکی فراوانتر دەگمەنە مرۆڤێك بدۆزینەوە لە هەنووکەدا بژی، دەگمەنە پیاوێك بدۆزینەوە ئێستایەکی چڕ و دابڕاو و ناچوون یەك بژی لەگەڵ ساتەکانی دیکەدا.

ئێستا نیشتەجێیەکی داخراوە، بەڵام "ئێستایەکی بەتاڵی داخراو" دەکەوێتە بەر رەحمەتی یادەوەریەوە، بۆیە لە دواجار کاتێك دژی شێواندنی زەمەن قسەدەکەین، بە جۆرێك لە جۆرەکان دژی یادەوەری قسەدەکەین...زۆرن ئەوانەی کە "ئێستایەکی بەتاڵی داخراو" یان هەیە و یادەوەری زەمەنەکانیان پڕدەکات لە تارمایی رابردوو، پڕیدەکات لە خێوەی سەردەمەکانی رابردوو. ئێستایەکی بەتاڵی داخراو لە ماڵێك دەچێت کە دیوارەکانی، دەرگاکانی، پەنجەرەکانی، تارمایی دروستبکات، سەرچاوەی دروستکردنەکەش "یادەوەری" یە[3]. یادەوەری ساتەکان خۆیان ئەو تارماییانە هەڵدەهێنن، چونکە هیچ شتێك، هیچ قەوارەیەك، هیچ سەنگێك، هیچ مەتریاڵێك، ئەو بەتاڵییە بە چۆنایەتی دیکە پڕبکاتەوە، لەبەر ئەوە تەنها یادەوەرییە دەتوانێت ئەو ئێستایەکێ بەتاڵ پربکاتەوە، تەنها یادەوەریە، لەبری سەنك و مەتریاڵەکانی جیهان، وێنە و رەنگ و وەهمی رابردوو دەوروژێنێتەوە[4]. یادەوەری وەکو وێنە و

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢١

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢١

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢١

٤ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٢

یادگار سەیری رابردوو دەکات، لە کاتێکدا عەقڵ وەکو کەرەستە و بابەت سەیریدەکات. بۆ ئەوەی لە حوکمی ئێستا رابکەین یادەوەری گەورەترین هێزی هەڵهاتنە، چونکە گرێدراوە بە زەمەنەکانی ترەوە، زەمەنێك کە بۆ ئەوەی گرێبەندبین پێوەیناچارین بەسەر تەرمی ئێستای خۆمادا بازبدەین[1].

یادەوەریش دووبارەبونەوەیەکی چۆنیەکی زەمەنە، زەمەنێکە چۆنایەتی خۆی دۆڕاندوە و ناشتوانێت بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی خاو و سەدیم..بەڵام یادەوەری کە کەرستەی رابردووە بۆ پەڕینەوە بەرەو ئێستا، شارێگەی گەڕانەوەکانە. رابردوویەك کە یادەوەری پاڵپشتێتی، پتر بایەخ بە زیندووراگرتنی یادەوەری دەدات، نەوەکو بە رۆحی ئێستا و هەنووکە. رابردوو لەناو سیستەمی فیکری ئێمە و سیستەمی ژیانماندا چەندین ئەفسانە و چەندین دەزگای گەورەی هەیە[2].

بابزانیین چۆن رابردوو چرکەکان تێکەڵاو دەکات؟ چۆن دەیەوێت زەمەن بکات بە هێڵکی درێژبوونەوەی چوونیەك؟ چۆن چۆنایەتیە جیاوازەکان لەناو یەك یەکەدا دەتوێنێتەوە؟ چۆن لە ژێر ئایدۆلۆژیایەکی ئەستووردا دەیەوێت تایبەتمەندی ئێمە و رۆحی ساتەکانمان بکوژێت، هەموو چۆنایەتیەکان بکات بە بەشێك لە خۆی، بۆئەوەی ئێمە بەردەوام خەریکی ئەرشیفی جیهان ببین نەوەك بە خودی ژیانەوە سەرقاڵبین، خەریکی بژارکرنی زەمەن بین لەو ساتە وەختانەی کە وەکو تیشکێك راستی چۆنایەتی خۆمانمان پێدەڵێن و ژیانمان لا ئاشکرادەکەن و و زەمەنمان بۆ یەکلادەکەنەوە، بەڵام ئەفسانەکاان عەقڵمان دەگۆڕن بۆ ئەو ئامێرەی هەمیشە ئاوڕ لە رابردوو دەداتەوە و جیهانیش دەکەن بە پەرستگایەك کە پڕیەتی لە تارماییەکانی رابردوو[3].

بۆ پیادەکردنی دیمەنی رابردووی جوان یادەوەری چەندەها میکانیزم بەکاردەهێنێت، چەندەها ئەفسانە دەخاتە گەڕ، چەندان شێوەی بەردەوامی و خۆدووبارەکردنەوەپیادە دەکات [4]. بە دڵنیبیایەوە هەر کاتێك نەمانتوانی لە هەنووکەدا بژین، ئەوسا دەگەڕێینەوە بۆ ئەفسانەکان، بۆ بە خورافیکردنی بوونمان، خورافەتی رەگوڕیشە، ئەو خورافەتە ترسناکەیە، کە ئێمە ناتوانیین دورگەی تایبەتی خۆمان بژین، ناتوانیین تەنهایی خۆمان بژین، ناتوانیین ئەو راستیە

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٢

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٢

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٢

٤ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٣

قبولْبکەین، کە هیچ کەسێ لە هیچ زەمەنێکی دیکەوە ناتوانێت، دەستی یارمەتیمان بۆ درێژبکات. رەگوریشە ئەو هۆکارەیە کە لە رێگایەوە دەمانەوێت لە دەرگاداخراوەکانی زەمەنی خۆمان و سات و چرکەی خۆمان دەربازبین[1].

ئێستا ئێمە لێرەدا لە نێو دوو هێزداین لەنێوان" عەقڵ" و "یادەوەری" دا، عەقڵ ئەو تاکە هێزەیە کە دەتوانێت لە ئێستادا لە هەنووکەدا بمانچەقێنێ. یادەوەریش ئەو هێزەیە کە دیوارەکانی ئێستا دەگۆڕێتە سەر پێشانگایەك بۆ نیشاندانەوەی وەهمەکان، ئێمە لە "ئێستا" دا خۆمان و یادەوەریمانیین، خۆمان و ئەو تارماییانەیین کە هەر لەناو خۆماندان، خۆمان و تاکبوونەوەمانیین لەگەڵ بووندا.

ئەو بەردەوامیەی کە لەگەڵ باپیرەکانماندا هەمانە، بەردەوامیەکی وەهمیە، هیچ یەکێ لە باپیرانمان ناتوانێت دەستبهێنێت و بروسکەیەك لە ژوورسەری ئێمەوە بگرێتەوە، "ئەفسانەی رەگوریشە" لەسەر ئەوە بونیادنراوە کە وێنەیەکی بەردەوام بدرێت بە زەمەن، بیرۆکەی سولالە لە راستیا بیرۆکەیەکە دژی زەمەن و دژی ئێستایە[2].

رابردووپەرست و ئایدۆلۆژیستەکانی دەیانەوێت وامانپیشانبدەن، ئەو شتەی کە رەگوریشەیان نییە، بوونێکی هەڵپچڕاو و لێکترازاویان هەیە. چەمکی رەگوریشە دێت بۆ ئەوەی هێزێك بەخشێتە ئێستا، هێزێك کە ئێستا لە توانایدانییە بەرهەمیبهێنێت، بەڵکو دەبێت "هەڵیبگۆزێت" یادەوەریش ئەو دەفرەیە کە هێزمان لە بنکی سولالەکانەوە بۆ "هەڵدەگۆزێ" سەرکەوتنی وەهمیمان پێشکەش دەکات، شوێنێکمان بۆ دەکاتەوە، هێلێکمان بۆ جیادەکاتەوە لە ناو زەمەندا، لەو رێچکەیەوە چۆنایەتیمان وەردەگرین، لەو رێچکە زەمەنییەوە وەریدەگرین کە رەگوریشەمان پیارۆیشتوون[3]. سولالە ماڵێکە لەرابردوودا، لە راستیدا فیکری رەگوریشە حوکمی شوێنی هەیە لەناو زەمەنی رابردووا، یادەوەری لەسەر ئاستی زەمەن ئیش دەکات.

رەگوریشە هەڵقولانێکی ئەزەلییە، وێنەی کانیەکە کە بوونێکی رەهای هەیە، هەرچیەك کە بەرهەمدێتلەوەوە بەرهەمدێت، لەو شوێنەوە هەڵدەقولێت، بۆیە دەکرێت بڵێین یادەوەری

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٣

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٤

٣ ر ەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٤

دەیەوێت وێنەیەکی یەکگرتووی شوێنێکی بنچینەیی و زەمەنێکی بنچینەیی بخولقێنێت[١]. لێرەوە رەگوڕیشیە زەمەنی بنچینەیی ئێمەیە واتە ئەو سەرەتای زەمەنە کە دەبێت بەردەوام دووبارەیبکەینەوە، زەمەنێکە زەمەنی ئێمە لەوەوە دێت و جگە لە قولپێك لە قولپە کانییە ئەزەلیەکەی ئەو هیچی تر نییە، ئێمەش هەناسەیەکی کورتی ئەو دەریایەین کە هەر خێرا لەناو ریزی هەناسەکانسا وون دەبین[٢]. رەگوریشە زەمەنمان لە یاددەباتەوە، چونکە زەمەنێکی وەك یەك زەمەن نییە، بەڵکو وێنەیەکە لەوەوبەر کەوتۆتە گەڕ، وەستانێکە دووبارەدەبێتەوە. بەم جۆرە خودی زەمەن دەبێتە درۆیەکی گەورە، چونکە دووبارەبوونەوەی وەستان وادەکات "زەمەن" شەپۆلێکی گۆڕدراو نەبێت، بوونێکی بزۆك و پڕناکۆکی نەبێت.

دەکرێ بڵێین. یادەوەری چەمکێکی رۆحیە. هەر ئەوەندەی مرۆڤ کەوتە دەرەوەی زەمەنەوە، دەستەوەستان دەبێت لە تێگەیشتنی پەیوەندیەکەی بە جیهانی دەرەوە. بەو پێیەی کە مرۆڤ بونەوەرێکی ئەخلاقییە، یادەوەریەکی پێبەخشراوە، کە هەستی بێزاری و نارەزایی تێدا دەوروژێنێت. یادەوەری وامان لێدەکات خێرا کاریگەریمان لەسەر دروست ببێت و رووبەروی ئازار ببینەوە.

یادەوەری کە لە جەوهەردا لەسەر کوشتنی ئێستا دروستبووە، بە جۆرێك دەمانگێرێتەوە بۆ رابردوو کە لە سنورێکی ئەوتۆدا بەندبین، بە ئاسانی مانا کۆنەکان، هێزە کۆنەکان، بتوانن راڤەمانبکەن[٣].

دەتوانیین جیاوازی بکەین لە نێوان "زەمەنی یادەوەری" و "زەمەنی کردار"، کە دوو زەمەنی تەواو لەیەکتر جیاوازن، پێوانەکانیان جودایە، هەستپێکرنیان جودایە، لە زەمەنی کرداردا جیهان جیهانی چۆنایەتیەکان و لەیکدابرانە، جیهانی نەرێکردنە، جیهانی راستکرنەوەیە، بەڵام زەمەنی یادەوەری، دووبارەکردنەوەیە بە جلە پشتیەوە هێڵی پەرەسەندنی زەمەن وەکو هێڵێکی بەردەوام و نەپساو دەردەکەوێت. لە نێوان ئەم دوو زەمەنەشدا دوو جۆر ئیقاعی جیاواز هەیە، دوو جۆر سیستمی راڤەکردن و بیرکردنەوە هەیە، زەمەنی کردار ئاوێنەی زەمەنی عەقڵ و زەمەنی راستەقینەی مرۆڤە لە ناو شتەکاندا، زەمەنی سەرکێشیە، لە کاتێکا زەمەنی یادەوەری زەمەنی پشوو و لەسەریەکنانەوەی وێنەکانە[٤].

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٤

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٥

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٥

٤ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٣٦

کاتێك ماناكان لەیەك فۆرم و لەیەك جەوهەردا وەستان، لێرەدا ژیان دەبێتە یادكرنەوەیەكی بەردەوام و ماناكانیش دەبنە كەرەستەی زیندانیكردنی فیكر.

له راستیدا یادەوەری رەهەندی وەستاوی شتەكانمان نیشاندەدات، ماناكانیشی تەنها دیوی وەستاوی دونیا دەبینێت، هەر كاتێكیش لە ماناوە گواستمانەوە بەرەو پرسیاركردن و تێگەیشتن لە مێژووی مانا، واتە لە یادەوەرییەوە كەوتویینەتە سەر دونیای چالاكیەكانی عەقل[1].

یادەوەری لە رێگەی ئەو سرووتەكانیەوە، دەیەوێت پێمان بڵێت، كە ئەو پەیوەندییە رۆحیانە پەیوەندی ئەزەلین و چۆنایەتی جەوهەرین و بەردەوام دووبارەدەبنەوە.

ئەوەی كە چۆنایەتیەكان دەگۆڕێت، شكاندنی سرووتەكانە، باوەڕنەبوونە بە پایەداربونی هیچ پەیوەندییەك، مەرگی یادەوەری بە ناو مەرگی سرووتەكاندا تێدەپەڕێت، سروتەكانیش دوا سەنگەری گرنگی یادەوەرین، ئازادبوونی مرۆڤیش تا ئەندازەیەكی زۆر ئازاددبوونی رۆحی و رەمزییە لە سرووتەكان[2].

مادەكانی یادەوەری ئەو هەموو رووداو و رەمز و زانیاری و شوێنانەیە كە هەریەكەیان ئاماژە بۆ بەشێكی دیاریكراوی رابردوو دەكەن. یادەوەری سیستمێكی تۆماركردنە كە چەنددەها هەلومەرجی كۆمەڵایەتی و سیاسی و كولتووری لە دارشتنیا بەشداری دەكەن[3].

ئەركی یادەوری ئەوەیە كە مرۆڤەكان لە دەوری یەك وێنە سەبارەت بە رابردوو كۆبكاتەوە، مادەی یادەوەری وێنەی ئەو جیهانەمان پێدەبەخشێت كە دەبێت بونیادی بنێینەوە.

كاتێك یادەوەری كاردەكات بۆ ئەوەی ئەو بابەت و وێنانەی لامان عەمبار و پارێزراوە، پاكبكاتەوە لە شتە لاوەكی و نەویستراوەكان، ئەمە مانای وایە مرۆڤ یادەوەری بە بابەتێك دانانێت، بەڵكو دەبێتە (بەها)یەك یان (دەلالەت)ێك، واتە گەلێك جار رابردوو لە دید و روانینی ئێمەدا دەبێتە بیرۆكەیەك، كە خۆمان دروستمان كردوە و ئەو مانایەی پێدەبەخشین كە خۆمان ئارەزووی دەكەین[4].

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٣٩

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٤٣

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٤٤

٤ مجلة العربي- عدد، ١٤٧- ١٩٧١- ل ٢٥

کەچی یادەوەری لای شپنگلەر بەو مانایەباوە نایەت، کە تێکڕای خەڵکی بەکاری دەهێنن: تەنها بریتی بێت لە کانگای شت گەلێکی رابردوو، بەڵکو بریتیە لە وێناکردن کە دەتوانێت ساتە وێکچوو و ماوە و بەردەوامیەکان بڕێت، وەك پنتێك وابێت لە نێوان رابردوو وداهاتوودا.

بە کورتی یادەوەری لای ئەوپایەیەکی سەرەکیە بۆ وێناکردنی مێژوویی و پەی بردنی مێژوو، زیاتر لەوەش مەعریفەی خودی و باوەڕە سەرەکیەکانیشمان بە هۆی یادەوەرییەوە دەبن و دەمێننەوە، بەم جۆرە یادەوەری هەم رووداوەکان بە زیندوی دەهێلێتەوە و دەیان پارێزێت و هەم وێناکردنێکی تایبەتیان پێدەبەخشێتب[1].

لە روانگەی تێڕوانینێکی دیکەدا، یادەوەری مێشکی سێ جۆرە: یادەوەری راستەوخۆ، یادەوەری ناوەند، یادەوەری دوور. ئێمە دەتوانین دەرك بە یادەوەری ناوەند بکەین، هەتا ئەگەر هەست بە زەمەنیش نەکەین، واتە ئەگەر وا دابنێین زەمەن رێکخستنی داهاتەکانە لە مێشکدا، ئەوا ئەو شتە بەسەر میکانیزمی یادەوەری راستەوخۆ و دووردا ناسەپێت و بەشێوەیەکی ساکار ماوەیەکی زۆر لەبەر دەستدا نییە بۆ تەرتیبکردن لەم دوو یادەوەریەدا[2]. مۆسیقا پەیوەستە بە یادەوەری، هەروەها زەمەن گونجاوە لەگەڵ ئیقاع و ریتمەکانی یادەوەری، هەروەك چۆن هەر کارێکی هونەری شوناسی خۆی هەیە، بە هەمان شێوەش یادەوەری شوناسی مرۆڤە[3]. رەنگە مێشك وەك زەمەنێکی بچووکراو بێت و بتوانێت زەمەن بگەڕێنێتەوە بۆ دواوە.

یادەوەری بە سەر مێژوودا زاڵ ئەبێت، ئەرکی مێژووش بریتیە لە یادخستنەوەی رابردوو بە شێوەیەکی ئەزموونی لێگەڕایی (استقرائی)

کەواتە ئێمە تا رادەیەکی باش بەرئەنجامی یادەوەرییەکانمانین، ئەو یادەوەریانەی کە بە جۆرێکی قوڵ لە ناخودئاگادا پەناه بووە و درووست بووە، هەروەها ئەو یادەوەریانەی کە لە رووی دەروونیەوە هەمان کاتەکەیە.

---

١ فەلسە فەی مێژوو لای شپنگلەر- مەریوان عەبدول- ل ٥٤

٢ (ماهو الکون — ل ٩٧

٣ (ماهو الکون — ل ١٠١

## - زەمەن و بەردەوامی:

بەردەوامی بەشێکە لە زەمەن و ماوەی ئەو زەمەنەیە کە ڕووداوێکی دیاریکراو دەیخایەنێت، بیرۆکەی زەمەن لە بیرۆکەی بەردەوامی دەست پێدەکات، بیرۆکەی بەردەوامی (الدیمومە)یش بەرهەمی ئەزموونێکی ناوەکییە[1]. لای فەیلەسوفی فەرەنسی (هینری برگسۆن) لە نێوان بەردەوامی و ڕێژبوونەوەدا، گەلێك جیاوازی هەیە، درێژبوونەوە سیفەتی شوێنە، بە تەنها شوێنەکە پەلدەکوتێت و بەسنوورە دوور و نزیکەکاندا بلاو دەبێتەوە، بەلام کاتێك سیفەتی درێژبوونەوە دەدەینە زەمەن سیفەتێکی دیکەی لێ دەستێنینەوە، ئەویش بەردەوامیە. درێژبوونەوە زالبوونی چۆنایەتیەکە کە خۆی دووبارەدەکاتەوە، لە کاتێکدا بەردەوامی زیادکردنی شێوەی چۆنایەتیەکانە[2].

برگسۆن دەڵێت: "بەردەوامی ئەو قولاییەی ناو ناخی شتەکانە کە تیایدا هەرگیز هیچ چۆنایەتیەك بۆ جارێکی دی بە وێنەی پێشووی خۆی دووبارە نابێتەوە". واتە بەردەوامبوون بە مانا برگسۆنیەکەی گۆڕانی بێپشووی چۆنایەتی شتەکان و وێنەکان و ساتەکان و هەستەکانە، بەلام درێژبوونەوە چەقبەستنە لەناو چۆنایەتیەکدا کە بەردەوام خۆی دووبارە دەکاتەوە و خۆی درێژدەکاتەوە[3].

لای برگسۆن خەسڵەتی بەردەوامی تایبەتە بە زەمەن، بە پێی نموونەی بەندۆڵی کاتژمێر، برگ سۆن لای وایە لەم نموونەیەدا ئێمە زەمەنی لێدان ناژمێرین، بەلکو ڕێکخستنێکی دیکەی ناو شوێن پێوانە دەکەین و وەکو زەمەن وەریدەگرین[4].

هەروەها برگسۆن دەنوسێت: " گەر زەمەن نێوەنێك بێت، کە دۆخەکانی هۆشیاریمانی بە لێکدابڕاوی و یەك لە دوا یەك لە خۆگرتبێت، بە جۆرێك کە بژمێردرێن و لە سەرێکی دیکەشەوە گەر دەرئەنجامان دەربارەی ژمارەکانئەوەبێت کە هەرچیەك ژمێردرا ئەوا لە شوێندا

---

١ الزمان في الفكر الديني –ل ٢٤٢

٢ ڕەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٤

٣ ڕەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٤

٤ ڕەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٥٤

پەلی کوتاوە، کەواتە گەر زەمەن وەکو نێوەندێك وەربگرین کە تیایدامرۆڤ بتوانێت بژمێرێتو جیابکاتەوە، ئەوا لەو حاڵەتەدا زەمەن چ شتێك نییە جگە لە شوێن[1].

پێویستە لێرەدا دیاریبکەین، کە ئایا زەمەن بەردەوامییە، یاخود زەمەن پارچە پارچە و یەکە یەکە و کەرتکەرتە؟ ئەو پرسیارە لەم سەدەیەدا ﴿برگسۆن- باشلار- روبینال﴾ هەوڵیانداوە بەوردی وەڵامیبدەنەوە. ئاشکرایە وەڵامی برگسۆن لایەنگیری ئەو بۆچوونەیە کە " زەمەن" لە قوڵاییدا بەردەوامیەکی تەواوە و هەرگیز بەش بەش ناکرێت و شەپۆلێکی لێکنەپچڕاوە. لای برگسۆن تەنها لە رێگەی رامانێکی رۆحی قوڵەوە دەگەینە ئەو ئاستەی کە دەست بخەینە سەر رەوتی نەپچڕاوی زەمەن، لای ئەو تەنها لە ئاستە رووکەشەکاندا زەمەن زەمەنێکی پچڕپچڕە[2]. بەڵام روانینی "رۆبینال" دواتریش "باشلار" تەواو پێچەوانەی ئەو دید و روانینەیە، لە زۆر جیگادا دژایەتی رۆبینال، وەکو یەکەیەکی جیا و گۆشەگیر سەیری "چرکە" دەکات، لای ئەو هەموو چرکەیەك لە چرکەکان بوونێکی تایبەتە. بوونێکە هەڵواسراو لە نێوان، عەدەمی رابردوو و عەدەمی داهاتوو[3].

ئەگەر لای برگسۆن "چرکە" دابەشکردنێکی دەستکرد و نادروستی زەمەن بێت، لای رۆبینال بەستنەوەی چرکە بە پێش خۆی و دوای خۆی بەستنەوەیەکی دەستکردە. لێرەوە هەموو چرکەیەك خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە تایبەتمەندی داخراو، واتە ساتەکان یەك لەوی دیکەدا ناتوێنەوە، ئەوەشی کە رێگا لەو بەریەککەوتن و توانەوەیە دەگرێت نوێبوونەوەی بەردەوامی چرکەکانە.

بەڵام لای باشلار ئەو چۆنایەتیە جیاجیایانەی بیرۆکەی "بەردەوام- بوونی" برگسۆن دەیخاتە بەردەستمان، جگە لە چەند تارماییەکی دیارینەکراو هیچی تر نین و هەر جۆرێك لە بەردەوامبوون کە لە ناو "ئێستا"دا نەژی دروستکەری وەهمە[4].

واتە باشلار بەردەوامی لە زەمەندا دەبەستێتەوە بە راهاتن و خوپێوەگرتن.

---

١ هنري برغسون- الطاقة الروحية- ترجمة علي مقلد - بيروت — ٢٠٠٦ —ل ٣٠

٢ هنري برغسون- الطاقة الروحية- ترجمة علي مقلد - بيروت — ٢٠٠٦ — ل ٣١

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٤

٤ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٥

له راستیدا بیرۆکەی "بەردەوام- بوون" ی زەمەن بە بێ گۆڕانی چۆنایەتیەکان مانای نییە، هەر یەك لە ﴿برگسۆن و رۆبینال﴾یش پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرن، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئێمە چۆن چۆنایەتی جیاجیای چرکەکان ەبینین و هەست پێدەکەین؟ هەڵبەت هەستکرنی ئێمە بە چرکە جیاوازەکان لە رێگەی "ئێستا"وەیە، ئێمە هەمیشە کە دەژین لە "ئێستا"دا دەژین، مردنیش مانای لە "ئێستا" نەبوون، ئەوەشی کە لە ئێستادا نییە لە هیچ زەمەنێکی تردا نییە، چونکە پێشتر و دواتر..رابردوو و داهاتوو، دوو جۆرە حاڵەتی ناو یادەوەری یان عەقڵن[1].

واتە هیچ هەستکردنێك بە زەمەن چڕی و سەنگ و ئامادەیی ئێستای نییە، ئێمە مەحکومین بە ئێستا، لە دەرەوەی "ئێستا" بوونیش تەنها کەینونەیەکی شێولومان بۆ دروست دەکات، بەم مانایە وەکو باشلار دەڵێت: " لە گەردووندا ئامێرێك نییە بەردەوام بژەنێ" دەنگێك نییە ئەبەدی کە لەو سەری زەمەنەوە بێ گۆڕان بێت، بەڵکو " هەر ساتێك و ئاوازێك" ئەوەیە تێگەیشتنی راستەقینە لە زەمەن. باشلار هەمەرەنگی چرکەکان بە جەوهەرێکی تایبەتی خودی زەمەن لە قەڵەمدەدا، برگسۆنیش هەروا سەیری هەمەڕەنگی زەمەنی دەکرد[2]. زەمەنی هەمەڕەنگ، جیاوازی چرکەکان، بەردەوام- بوونی چۆنایەتیەکان، خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە.

لەبەرئەوەی زەمەن زنجیرەیەك تاکبونەوەی بەردەوامە لەگەڵ بووندا، زەمەن هیچ مانایەکی نییە جگە لەوەی جیاکرنەوەیەکی بەردەوامە لە رەگوڕیشە، کە باس لە زەمەن دەکەین واتە باس لە یەکترازانی خۆمان دەکەین، یەکترازانمان لەگەڵ ریشەکانماندا، زەمەن مانای ئەوەیە کە هیچ نەوەیەك ناتوانێت وەڵامی نەوەیەکی تر بداتەوە، هیچ راستیەك بە هەمان وێنەی رابردوو دووبارە نابێتەوە. بۆ ئەوەی بگەین بە راستی خۆمان، بە هەنووکەیی خۆمان دەبێت باوەڕمان بەوە هەبێت کە ئێمە درێژبوونەوە نین، لەو ساتەشدا کە دەبین بە درێژبوونەوە، ئیدی راستی خۆمان وونکردوە[3].

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٥

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ١٥

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٣

ئەو بەردەوامیەی کە لەگەڵ رابردوودا هەمانە، بەردەوامیەکی وەهمیە، "ئەفسانەی بەردەوامی رەگوڕیشە" لەسەر ئەوە بونیادنراوە کە وێنەیەکی بەردەوام بدرێت بە زەمەن، بیرۆکەی سولالە لە راستیا بیرۆکەیەکە دژی زەمەن و دژی ئێستایە[1].

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە کەلتوور و زەینیەتی مرۆڤی کۆمەلگەی ئاییینی و نەریتی، کەلتووری رابردوو پەرستیە و لاواندنەوەی رابردوو بەشێکی زۆری زەینی ئێمەی داگیرکردوە، ئەمەش رێگرە لە بەردەم داهاتووبینین و ئاییندە خوازیدا. بینین و کارکردن بۆ دروستکردنی مێژوو لە داهاتوودا، کاری ئەم جۆرە مرۆڤانە نییە، چونکە مێژوو بەلای ئەوانەوە هەمیشە ئەوەیە کە لە رابردوودا روویداوە.

## - زەمەن و شوناس:

لەم بەشە بچووکەدا دەمانەوێت، پەیوەندی نێوان زەمەن و شوناس باس بکەین و بخەینە روو. شوناس ئەو کۆتەیە کە زەمەن دەیکاتە دەستمان، چۆنایەتیش ئەو ئازایەیە کە هەر زەمەن پێمانیدەبەخشێ. شوناس دیوارێکە لە پاشەڕۆژمان جیادەکاتەوە و بەردەوام ئاراستەی ئەو شتانەمان دەکات کە لە رابردوودا روویداوە. بەردەوام ئاراستەی ئەو وێستگەیەمان دەکات کە لەوەوبەر شکۆی ئێمەیان دروستکردوە[2].

شوناس بریتیە لە وەستانی زەمەن لەناو قولاّیی کەسێتی ئینساندا. چۆنایەتیش بریتیە لە رەوکردن بە ناو زەمەنی راستەقینەدا، بە ناو دابڕانەکانی زەمەندا. بە بێ دابڕانێك لە ناو کاراکتەری مرۆڤدا، ئەمەش دۆخێکی ئێجگار تراژیدیە کە بوونەوەرەکان لە ناو زەمەنێکی دابڕاودا کاراکتەرێکی دانەبڕاویان هەبێتب[3].

بەم جۆرە شوناس لە ساتێك لە ساتەکانا لە پەرەسەندن دەوەستێت، ئیتر ساتەکانی داهاتوووەکو کۆمەڵێ قاوغی بۆش یان وەکو هێلێکی چوونیەك سەیردەکرێت، لێرەوە بۆ ئەو پیاوانەی کە بە کاراکتەری نەگۆڕەوە بەرامبەر زەمەن دەوەستن، ئەمرۆ و سبەینێ و دووسبەی وەکو یەك وایە، لێرەوە دەکرێت بڵێم کاتێك شوناس وەکو راستی بالاّی من، وەکو وێنەی

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٤

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٧

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٧

ئایدیالی من دێته مەیدان، ئیتر وێنەی زەمەنێکی لێکنەپچڕاو لەتەك خۆیدا دەهێنێت، نیگاری زەمەنێکی نەگۆڕ و بەردەوام بەرپادەکات[١]. بۆیە ڕەنگە مەسەلەی شوناس هۆکاری سەرەکی بێت لە دروستبوونی ئەفسانەی " زەمەنی لێکنەپچڕاو" دا کە بزاوت لە قولاّیی کاراکتەری مرۆڤدا دەوەستێنێت. "شوناس" بریتیە لەو ساردییە، لەو حالّەتەی کە چیتر بوونی ئێمە تازەبوونەوەکانی دونیا نایدرەوشێنێتەوە[٢]. کاتێك باس لە شوناس دەکرێ، پەنادەبردرێتە بەر مێژوو، وەك رابردوویەکی دێرین بۆ سەرهەڵدانی لە شوێن و زەمەنێکی دیاریکراودا و کاتێك مرۆڤ دەگەرێتەوە بۆ رابردوو، لە ساتە وەختی ئەمڕۆکە دەرئەچێ و دەستەوەستان ئەبێ بەرامبەر رووداو و گۆڕانکاریەکانی هەنوکە، کۆششی ئەمڕۆی دەکاتە سوتەمەنی یان درێژکردنەوەی دوێنێ. لە کاتێکدا بۆ هەلاّتن لە ئێستا بۆ ناو مێژوو، وەك دڵنەوایی و بێ دەسەلاّتی و جۆرە تەسلیم بوونێکە، کاتێ پەنا ئەبرێتە بەر رابردوو لاوازی ناسنامەیە لە ساتەوەختی ئەمڕۆدا[٣].

وابەستەبون بە خەیاڵ و ئەندێشەکردنی ئەو ساتە نەبونێتی شوناسی ئەمڕۆ دەردەخات، واتە: تۆ هەڵگری شوناسێکی کە هی ئەمڕۆکە و کردەی خۆیت نییە،بوونی تۆ وەك مرۆڤ یان گەل لە ساتەوەختێکدا ئەی کە سەربەخۆ و دروست نییە، بۆیەگەڕاندنەوە بەرەو رابردوو و کردنی بە وێنەیەکی زیندوو بۆ مردویەك کە خۆتی، لە کاتێکدا هەڵگری ناسنامە زیندووەکە و رابردووش بە هەموو واتایەك مردووە[٤].

شوناس کۆتایی هێنانە بە سەفەری مرۆڤ لە ناو شتەکاان و جیهاندا و دارشتنی کاراکتەرێکە کە چیتر جیهان ناتوانێت بیخانە ناو شەپۆلەکانی خۆیەوە. ئەو پەناگەیەیە کە لەبەرامبەر زەمەن و گۆڕانکاریەکان حەقیقەتە نوێیەکان و چرکە تازەکاندا خۆمانی تیا دەشارینەوە، شوناس پەناگەیەکە دەرگاکانی لەسەر رابردووەوە[٥]. شوناس کە لە داهاتوومان دادەبڕێ و دەرگای زەمەنێکی چوونیەك و سفت و بێگیانمان لێدەکاتەوە، لە راستیدا رێگایەکمان

---

١ ڕەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٧

٢ ڕەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٨

٣ گ، ژیار، ژ، ١٠-١١- ساڵی ٢٠٠٢ — ل ٢٠١

٤ گ، ژیار، ژ، ١٠-١١- ساڵی ٢٠٠٢ — ل ٢٠١

٥ ڕەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٨

لێدادەخاتی بۆ ئەوەی لەو پەناگەیەوە بەناو سەردابە تاریکەکانی بوونماندا پاشەکشێبکەین، شوناس لە دیدێکەوە ئەو پنتەیە کە بەسەر رابردوودا دەڕوانێت

شوناس ترۆپکی مانایەکە کە رەگوڕیشەی هەیە، خۆی بە خاوەن قولاّییەك دەزانێت کە لە رابردووەوە دێت، رابردوو تاکە سەرچاوەیەکە کە دەتوانێت رەسەنایەتی "شوناس" بسەلمێنێ، شوناس بۆ ئەوەی نەمر بێت دەبێت رەسەن بێت، رەسەنایەتیش شتێك نییە، لە مرۆڤەوە ببەخشرێت، بەڵکو تەنها رابردوو رەسەنایەتی دەبەخشێ. رەسەنایەتی جگە لە سیستمێکی ئاماژەیی بۆ زەمەنە بەسەر چووەکان هیچی تر نییە[١]. رەسەنایەتی گەڕانەوەی ئێمەیە بەرەو رابردوو، ئەگەر واسەیری شوناسمان کردبێت کە وێنەی ئێمەیە لە ئەمڕۆدا، ئەوا رەسەنایەتی راستی ئێمەیە لە رابردوودا. رەسەنایەتی پێمان دەڵێت: " ئێوە ئەو کەسانەنە کە دەبێت لەسەر رۆشنایی یادەوەریەکانتان رووەو قولاّیی زەمەن رۆبچن لەویادا حەقیقەتی خۆتان و رەگوڕیشەی خۆتان و مانای خۆتان بدۆزنەوە"[٢]. کەواتە بیرۆکەی رەسەنایەتی بەشێکە لەو بیرۆکە ئەفسانەیانەی جەوهەری میتۆلۆژیای سەلەفیانەی کۆن و نوێی ئێمە پێکدەهێنێت، چونکە لە رێگای شێواندنییەوە بۆ رابردوو تا ئەندازەیەکی زۆرشێواندنی ئێستا دادەپۆشێت. رەسەنایەتی شاردنەوەش سێبەرە دۆزەخەکانی رابردووشە بۆ خولڤاندنی وێنەی بەهەشتی وونبوو لە هەموو ئەوانەش گرنگتر زەوتکردنی "کردار"ە، وەگۆڕینی کردارە بۆ نمایش، چونکە لە راستیا کردار بریتیە لە کارکردن بۆ خولقاندنی چۆنایەتی خۆمان.

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٨

٢ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٩

# بەشی هەشتەم

## (ڕەهەندەکانی زەمەن و مرۆڤ)

### - زەمەن و مێژوو:

بەرای "هیگل" مێژوو بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەستە بە زەمەنەوە، چونکە بواری سەرەکی مێژوو بریتیە لە ژیان و بەردەوامی کات لەسەر زەوی، واتە ناتوانیین باس لە چەمکی مێژوو بکەین ئەگەر تێڕوانینێکی ئاشکرامان دەربارەی زەمەن نەبێت، چونکە ڕووداوەکانی مێژوو لە میانی زەمەندا دەخولێنەوە و چەمکی زەمەنیش چەمکێکی ئاڵۆزە و لەلایەن مرۆڤەکانەوە چەندان بیروبۆچوونی و تیروانینی جیاوازی لەبارەوە دەربڕاوە، بۆیە کێشەی زەمەن یەکێکە لەو کێشانەی لەسەرەتای ژیانەوە مرۆڤەوە بیری مرۆڤایەتی بەخۆیەوە سەرقاڵکردوە و بەردەوام شوێنەواری زەمەن لەسەر مرۆڤ و و جیهانی دەوروبەرەکەی سەرەنجی ڕاکێشاوە، چونکە مرۆڤ لە تێکڕای زیندەوەراندا تاکە بوونەوەرێکە مێژووی خۆی دروست دەکات و تاکە زیندەوەرێکە هۆشیاری دەربارەی زەمەن هەیە، بۆیە دەتوانێت لە جەدەلی نێوان زەمەن و مێژوو تێبگات[1].

[1] گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ -ل ١٤٢

رەنگە هەندێك چەمكی وەك: گۆڕان، پێشكەوتن، شێواز، بەها، حوكم، پەیوەندیەكی بەهێز لە نێوانیاندا نەبێت وپەیوەست نەبن لەگەڵ یەك، بەڵام هەمویان پەیوەستن بە مرۆڤ وزەمەنەوە[١].

هەروەها رەنگە بكرێ وێنای زەمەن و مێژوو بە بێ مرۆڤ بكرێت، بەڵام توێژینەوەی قوڵ و تەواو بۆ ئەم كێشەیە ئەوە دەردەخات، كە ناتوانین زەمەن و مێژوو لە چەمكی مرۆڤ جیابكەینەوە، چونكە زەمنیەت سروشتی خودی مرۆڤ پێكدێنێت[٢].

هەروەها دەشێ زانست باسی زەمەن بكات بە بێ مرۆڤ، بەڵام ناكرێت زانست باسی مرۆڤ و مێژوو بكات بە بێ (زەمەن). هەروەها لەلایەكی دیكەوە، وێنای مرۆڤ ناكرێت بە بێ كردار و كردەوە، كرداریش پەیوەستە بە زەمەن و شتێك لە زەمەندا پێكدێنێت، كە مێژوویەك بە مرۆڤ دەبەخشێت[٣]. هەموو مرۆڤەكانیش ئەرك و كارەكانیان لە ناو چوارچێوەیەكی زەمەنیدا و بەرەو ئاراستەیەكی دیاریكراو ئەنجامدەدەن.

لە راستیدا دەكرێ وەسفی مرۆڤ بكرێت بەوەی، كە بەرهەمی واقیعی مادی و هۆشیاری و زەمەن و ویست و كردار و هیوایە لەلایەك، لەلایەكی دیكەش بەرهەمی ژینگە و مێژووە. بۆیە مێژووی مرۆڤ یەكێكە لە تەجەلی و دەركەوتەكانی شێوی ژیانی ئینسانی. بەم جۆر و شێوەیە، مێژوو، كە ئەو داهات و رووداوانەن كە لە میانی رەوتی زەمەندا دەردەكەون، دەبێتە بەشێك لە سروشت[٤]. بە دەربڕینێكی تر مێژوو بریتیە لە بەدوایەكداهاتنی كارەكان لە زەمەندا و تۆمارێكە بۆ ئەو رووداوانەی كە لە بڕگە و ماوەیەكی زەمەنیدا روودەدەن[٥].

و دەتوانیین بڵێین مێژوو بریتیە لەو زانستەی كە باس لە رابردووی مرۆڤایەتی و ئەو ژینگەیەی كە مرۆڤ تێیدا ژیاوە دەكات و هەموو ئەو گۆڕان و پێشكەوتنانەی تیدا تۆمار كراوە كە روویانداوە، یان دەكرێ بڵێین مێژوو بریتیە لە لێكۆڵینەوەی گەشەی مرۆڤایەتیەوە لە هەموو بوارە سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و فیكری یەوە، ئیدی مەشخەڵی ئەو گەشەكردن و رووكار و ئاراستانە هەر چۆنێك بێت، بۆیە دەتوانیین بڵێین هەموو شتێك مێژووی هەیە،

---

١ مجلة الثقافة الاجنبية - عدد-٤ سنة الخامسة- بغداد- ١٩٨٥- ل ٣٤

٢ مجلة الثقافة الاجنبية - عدد-٤ سنة الخامسة- بغداد- ١٩٨٥ —ل ٣٥

٣ مجلة الثقافة الاجنبية - عدد-٤ سنة الخامسة- بغداد- ١٩٨٥ — ل ٣٨

٤ مجل الثقافة الاجنبية - عدد-٤ سنة الخامسة- بغداد- ١٩٨٥ - ٤٠

٥ مجلة الثقافة الاجنبية - عدد-٤ سنة الخامسة- بغداد- ١٩٨٥ —ل٤٢

مێژوو واتە سەرگوزەشتەی ژیانی مرۆڤایەتی لە قۆناغ و سەردەمە جیاجیاکاندا، واتە هەر شتێك گۆڕانی تێدا بێت واتە مێژووی هەیە[١].

مێژوونوس بە هۆی نووسینەوەی مێژووەوە دەتوانێت مێژوو بخولقێنێت، بەشێکی زۆری ئەو رووداوانەی کە نەنوسراونەتەوە سەرەڕای ئەوەی کە روویانداوە ئەمڕۆ پێیان ناوترێت مێژوو، چونکە نەبۆتە بەشێك لە ئەزمونی مێژوونووس و مێژوونوس نەیتوانیوە بیانگەیەنێتە پاش خۆی، هەر بۆیە ئەزموونی مێژوونووس دەتوانێت رووداوەکان لە روداوی گوزەری بەرەو مردنەوە چوون بگەیەنێتەژیانی سەرمەدی و نەبڕاوە، ئەم رابردوەش مە مێژوونوس لەسەری دەدوێت، رابردوویەکی مردوونییە، لە هەندێك ئیعتباردا رابردوویەکی زیندووە، ئەگەر رابردوو مردوو بێت ئەوا مێژوو هیچ مانایەکی نامێنێتەوە[٢].

کاتێك شارستانیەکان لەناو مێژوودا دروست بون پێویستیان بە کاتی مێژوویی هەبووە بۆ دروستبوون و گەورەبوون و پێگەیشتنیان، ئەوەش بە روونی لە مێژووی شارستانیەکاندا روون دەبێتەوە، کەواتە شارستانیەکان بریتین لەو کۆمەڵە مرۆڤانەی کە توانیویانە سوود لە زەمەن "کاتی مێژوویی" وەربگرن بۆ بونیان و داهێنانی یاسا و سیستەم و ئامێر و هونەر...هەموو ئەوانەش لە پڕێك نەهاتونەتەکایەوە، بەڵکو پێویستیان بە زەمەن هەبووە و دەرئەنجامی کەڵەکەبوون و کۆبوونەوەی ئەزموونی مرۆیی بوون[٣]. کۆبونەوەی مرۆڤەکان لەسەر جوگرافیایەکی دیاریکراو و بوونە خاوەنی زەوی و سەرچاوەکانی تایبەتی یان پێویستی بە رێکخستنی بەرژەوەندیەکان هەبووە، ئەو رێکخستنەش پێویستی بە سێ رەهەندی سەرەکی هەبون ئەوانیش بریتی بوون لە(مرۆڤ و خاك و زەمەن) مرۆڤ یەکەم رەهەند و بنەمای یەکەمی شارستانیەتە، تێکڕای تیۆرەکانی شارستانیەت باس لە رۆڵی مرۆڤ دەکەن، خاك وەك لانکەی کۆبونەوەی مرۆڤەکان و نزیکخستنەوەیان لە یەکتری و زەمەنیش تاوەکو ئەزموونی چارەسەری گرفتەکانیان لا دروست بکات[٤].

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ — ل ١٠

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ — ل ٨

٣ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ — ل١٥

٤ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ — ل ١٨

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە گرنگترین رەگەزە پێکهێنەرەکانی مێژوو، بریتین لە (مرۆڤ، زەمەن، شوێن) مرۆڤ وەك پاڵەوانی رووداوەکان و (شوێن) وەك سەکۆ و شانۆی نمایشی زنجیرەی بەسەرهاتەکان و (زەمەن)یش وەك چرکە ساتەکانی تۆمارکردنی رووداوەکان رۆڵی کاریگەر و بونیادنەرانەی مێژوو دەبینن.

بیرمەندی موسڵمان " مالك بن نەبی" پێی وایە لە جووڵەی زەمەندا جووڵەی مرۆڤ دەبینی و لە وەستانیشیدا وەستان، هەر ئەمەش وادەکات بە چالاکی مرۆڤ لە مێژوودا وەسفی بکەین[١].

زەمەن و تەمەنی شارستانیەکان وەك زەمەن و ژیانی مرۆڤ وایە لەدایك دەبن پێدەگەن و پاشتریش پیردەبن لەناودەچن، بۆیە تیۆرستانی بواری مێژوو پێیان وایە شارستانیەکان خولیان هەیە وەك شەو و رۆژ یان چوار وەرزەکە یان هەر دیاردەیەکی دیکەی گەردون بەو واتایەی بە بچووکی دەست پێدەکەن پاشان گەورە دەبن و پاشتریش پیردەبن و هەرەس دێنن، چونکە شارستانی وەك شارستانیەت وەك هەر پێکهاتەیەکی تری زیندوو وایە بەم جۆرە دەستپێدەکات کە بریتیە لە " سەرەتا و گەنجێتی و کۆتایی" [٢]. تیۆری دووبارە بوونەوەی مێژوو لە فیکری رۆژهەڵاتی کۆنیشدا هەبووە، مەهاباراتای هیندی دەڵێت گوزەری زەمەن رێگە لە ونبووەکان ناگرێت، هەموو شتەکانی زەوی پێدەگەن و بەبەردەوامی زەمەن نامێنن. کەواتە هەموو شارستانیەتیەك لە دایکبوون و و لەناوچوونی هەیە و ملکەچی هۆکارەکاانی گەشە و مانەوە و لەناوچوونە.

کاتێك لێکۆڵینەوە لە رووداوێکی مێژووی دەکەین بۆ نموونە سێ زەمەنی هەیە، زەمەنێکی دوور و درێژ کە ئەو کاریگەریانەی بە هۆی مامەڵە و کارلێکی نێوان مرۆڤ و ژینگە درووست بوون پیشان دەدات، کە زەمەنێکی دوور و درێژە، رەنگە سەدان ساڵ بخایەنێت تا ژینگەیەك گۆڕابێت، (برۆدۆیل) لە کتێبی "حەوزی دەریای ناوەراست" زەمەنی مێژووی بۆ سێ ئاست جیاکردۆتەوە:

- زەمەنی جوگرافی، کە کاتێکی دوور و درێژەو بە گۆڕانە هێواشەکەی دەناسرێتەوە.
- زەمەنی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بریتیە لە زەمەنی دەمەکان و زەمەنی ناوەند وەك مێژووی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵگە.

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ – ل ٢١

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ – ل ٣٥

– زەمەنی تاکە کەسی، ئەمەش بە تەواوی کاتی ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە وەك شەڕ و بەڵێننامە و دەسەڵاتی پاشاکان[1].

واتە برۆدۆیل، سێ زەمەنی لەیەك جیاکردۆتەوە، زەمەنێك کە پەیوەندی بە هەموو ژینگەی مرۆڤەوە هەیە، کە چەند سەد ساڵێك دەخایەنێت ئینجا دەگۆڕێت، زەمەنێکی بچوکتر کە بریتیە لە گۆڕانە ئابووری و سیاسیەکان کە بە چەند قۆناغێك لەناو کۆمەڵگادا گۆڕانی ئابووری و سیاسی ڕوودەدات، بۆ نموونە لە سەدەی بیستدا دوو سێ قەیرانی ئابووری دروست بووە، ئەمە زەمەنێکە، زەمەنی سێیەمیان کە دەکاتە زەمەنی ئەو ڕووداوانەی کە ڕوویانداوە، واتە بۆ لێکۆڵینەوە لە هەر ڕووداوێك بە گوتەی برودۆیل دەبێت هەر سێ زەمەنەکە لەبەرچاوبگرێ[2]. تەنانەت شتێك کە لە ئایینی هیندۆسیدا باس دەکرێت کە بۆ مێژوو گرنگی هەیە، ئەویش چەمکی زەمەنە.

کەواتە لە مێژوودا (زەمەن) سەنتەرە و زەمەنیش پێش و پاشی هەیە و ئەو کۆمەڵگایانەش کە جێگیرن و زەمەن لە ناویاندا زەمەنێکی گۆڕاو نییە (زەمەنێك بە شێوەیەکی بەرەو ئامانج ببزوێت وەکو ڕاستەهێلێك بەرەو پێشەوە بڕوات) بەڵکو زەمەن زەمەنێکی دەورییە، واتە کاتێکە وەستاوە و جێگیرە، کەیش مێژوو دروست بووە و گۆڕانەکانی مێژوو دروست بوون؟ کاتێك چەمکی (زەمەن) گۆڕا واتە مێژوو گۆڕا، چەمکی زەمەن گۆڕا، گۆڕانەکانی سەردەمی نوێ هەموو گۆڕان بوون لە زەمەندا لە (زەمەن و مێژوو)دا واتە مێژوو پێش و پاش و پێشکەوتن و دواکەوتن بەرەو کامڵ بونی زیاتر ڕۆیشتن لە ڕووی کۆمەڵگەوە. ئیدی فەلسەفەی مێژوو بەو مانایە و ئەو مێژووە کە زەمەن تیایدا سەنتەرە[3]. و تێیدا کارکردن بێت لەگەڵ زەمەندا. لە ڕووی زەمەنیەوە ڕووداوەکان لە پەنای یەکدان و کاتێك دەچنە ناو مێژووەوە دەبنە گێرانە و ریوایەت، واتە ریوایەت نووسینەوەی ڕووداوەکانی مێژووە، هەروەها ژیان بۆخۆی وەکو ریوایەت کەوتووە، داستانێکە سەرەتا و کۆتایی هەیە. زەمەن پێش و پاشی هەیە واتە ئەو شتانەی لەپاڵ یەکدا کاتێك دەچنە ناو زەمەنەوە، لەبەر ئەوەی دەچنە ناو ریوایەتەوە، لەبەر ئەوەش کە گێرانەوە وریوایەت خۆی بۆ خۆی زەمەنیە و بەرگی زەمەنی لەبەردایە،

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠ – ل ١٦٦

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣– ل ٨١

٣ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣– ل ٨٢

زەمەنیش سروشتی وایە پێش و پاشی هەیە (ئێستا،پێشتر، دواتر) یان (دوێنێ، ئەمڕۆ، بەیانی) ئەو پاش و پێشەش دەخرێنە ناو کتێبە مێژوویەکانەوە وەکو لە زەمەنە راستەقینەکە روویاندابێت، لە راستیدا دوو وەچەرخانیان بەسەردا یێت، یەکەمیان ئەوەیە کاتێك لە پەنای یەکدان ناچارن لەپشت یەکەوە بن، دووەمیان ئەوەیە ئەو روحە زیندوەی لە کاتی رووداوی مێژویی بونیان هەیە و بەو زیندویەتیەی لە مێژوودا هەیە، کاتێك دەچنە ناو ریوایەتەوە، ئەو زیندویەتیان نامێنێت و دەبنە رووداوی ئەبستراکت و موجەرەد[1].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە بابەتی گێڕانەوە وریوایەت پەیوەندی بە بابەتی زەمەنەوە هەیە، چونکە زەمەنی بوونی ژیان و بوونی مرۆڤ لەناو زەمەندا، ئەوە دەخوازێت مێژووی مرۆڤ وەکو ریوایەت بگوازرێتەوە، چونکە زەمەن پێش و پاشی هەیە و رووداوەکان بە پێش و پاشەوە باس دەکرێن، کاتێکیش پێش و پاش بۆ رووداوەکان دروست بوو، کە رووداوی (ا) ئینجا (ب) ئەمە مانای وایە چونە ناو زەمەنەوە، ئەگەرچی ئەو رووداوانەش لەیەك زەمەندا روویان دابێت، لە باری ئاساییدا لە پێشدا (ا) باس دەکەین دواییش (ب)، لەبەر ئەوەی سروشتی زەمەن وایە رابردوو و ئێستا و داهاتووی هەیە. کۆمەڵگاکان تێڕوانینی تێڕوانینی تایبەتیان دەربارەی زەمەنی رابردوو یان پێشینەکانیان هەبووە، لای گریکەکان تیۆری گەردوون و خراپەکاری دووبارەبوونەوەی هەتاهەتایی هەبووە، ئەوان بەلایانەوە زەمەن دوژمنی مرۆڤ بووە، مێژوو خراپە بڵاودەکاتەوە و گەردوونیش بەبێ کۆتایی دووبارە دەبێتەوە[2]. مێژوونوسی یۆنانی (بولیبس) باوەڕی وابوو کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە نێو چەند خولێکدا دەجووڵێت و مرۆڤایەتیش سروشتێکی نەگۆڕی هەیە، کاتێك پەنایان بۆ رابردوو دەبرد بۆ ئەوە بووە لە پێناو ئێستادا وانەی لێ وەربگرن[3].

بۆیە مرۆڤ ناتوانێت تەنهای لە ئێستادا بژی و دابڕێت لە رابردووی خۆی و بیر لە مێژوو نەکاتەوە بە مانای کاتێکی کۆن پێپەڕی و لە رووداوگەلێك کە پەیوەندی دەرەکی و بابەتین، بەڵکو بەردەوامیەکە لە زەمەن و کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ژیانی رۆژانەی مرۆڤ و بێگومان راڤەکردنی رابردوو و پێدانی مانایەك بە مێژوو هەمیشە بۆ مرۆڤ دێوەزمەیەك بووە.

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣— ل ٩٠

٢ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣— ل ١٤٥

٣ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣— ل ١٤٦

زەمەن لە روانگە و پرۆسیسی مێژوونوساندا، هەروەها لە پرۆسیسی ئابوریناساندا، وەك خۆی نەماوەتەوە کە بریتی بێت لە: تەنینەوە و رۆیینێك بێت کە دیاردەکان لەخۆبگرێت، هاو شێوەی ئەو تەنانەی کە روبارێك لەگەڵ خۆیدا بەرەو دوور بیبات[1]. بەڵکو زەمەن رێکخراو و رێك راستە، کە لە شێوەی ستوونەکانی مێژوو لە خشتەکانی رۆژمێردا. لە واقیعدا رۆڵی ئامرازێك دەبینێت بۆ زانیین و پێوانەکردنی گۆڕانکاریەکان و بە بەراوردکردنی ئەم گۆرانکاریانە لەگەڵ یەکتردا.

پرسیاری کرۆنۆزۆفی باو ئەوەیە، ئایا زەمەنی مێژوو خوولی یە، یان راستەهێلیە، یان وەستاوە؟ ئەمە پرسیاریکی ساویلکە و بیٚ مانایە، چونکە تۆبۆلۆجیای ئەم سیٚ زەمەنە، کە مافی خۆمانە لەیەکتریان جیابکەینەوە، بە گوێرەی پێویست و شیکردنەوەی لۆجیکی، لە راستیدا ئەو زەمەنانە تێکەڵی یەکن[2].

مێژوونوس بایەخ بە زەمەنی رووت و موجەرەد نادات، بەڵکو بایەخ بە بوونی زەمەنی گەوهەری دەدات، ئەو پرۆسانەی کە تویێژینەوەیان لەسەر دەکات، کە لە رەوتی گۆرانکاریەکان خۆیان دەنوێنن، بەڵام دەبیٚ ئەوە بزانیین کە گۆڕنکاریەکان زۆرن و و ئاراستە ورەوتەکانیان لەیەکتر جیان[3].

بەم شێوەیە زەمەنی مێژوو بزردەبێت لە ناو ئەو زەمەنە جەوهەرییانەی پرۆسەکانی مێژوو: سیاسەت، کۆمەڵایەتی، ئایین.

لێرەدا پرسیارێك قیتدەبێتەوە، ئایا زەمەنی مێژووی گشتگیر چییە؟

دەکریٚ بڵێین، تۆبۆلۆجیای زەمەنی مێژووی گشتگیر زۆر ئاڵۆزە: پێکهاتووە لە خوولی بەدوایەکداهاتوو: نەشونماکردن، وەستان، داتەپین، گەشەکردن، ئەم خولانە، پێویستیەکانی بونیاد بەرهەمدێنن، کە هەندێك لە گۆڕانکارییە گەوهەرییەکان دەستنیشاندەکەن. دواتر هێواش هێواش توشی داخوران و داتەپین دەبێت، یانیش دەوەستێت پێش ئەوەی بە هۆی گۆڕانێکی لەناکاوە (وەك شۆڕش) دەبێتە پێویستیەك لە شێوازێکی نویٚ. لە میانی گۆڕانی ئەم بونیادە خاوانە، خول و شۆڕشەکان لە هەندێك بواردا دێتەدی[4].

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل١٥٣

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ١٥٥

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ١٥٦س

٤ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ١٥٨

## - زەمەن و رووداوە گرنگەکان:

به پێکهاتنی گرنگی مێژوویی له ناو کۆمەڵگایەکی مرۆییدا، زەمەنێکی نوێ پەیدا دەبێ و لەدایك دەبێ و دەبێتە بنەمایەکی مێژوویی، زۆر له کۆمەڵگاکان مێژووی خۆیان بەو ساڵە جیاکردۆتەوە که سەرۆکەکانیان جلەوی دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، رۆمەکان ژمارەی ساڵەکانیان بە دەستپێکردنی مێژووی دامەزراندنی شارەکەیان دەست پێدەکات. ئایین و رێبازە ئایینیەکان

ساڵ و رۆژی لەدایکبونی پێغەمبەر و پێشەوای خۆیان دەکەن بە سەرەتای مێژووەکەیان و فەرمانڕەواییەکان پتر ساڵ و رۆژی دامەزراندنی حوکم و دەسەڵات یاخود ساڵ و رۆژی سەرکەوتنی گشتی و چارەنووس ساز، یان لەسەر تەخت دانیشتنی پاشا و سەکردەکانیان وەك سەرەتای مێژوو دیاری دەکەن،یان رووداوێکی گرنگی ئایین، نەتەوایەتی، یان سەرکەوتنێکی مەزن، بە خاڵێکی وەچەرخانی مێژوویی دەست نیشان دەکەن و وەك سەرەتایەك بۆ چەسپاندنی بونیان و هەروەها بۆ دەسپێکی مێژوو و رۆژژمێر، له بەڕێوەبردنی ئەرك و کاری ئایینی و نەتەوەایەتی بەکاری دێنن، بۆ نموونە لە دایکبوونی "مەسیح" یان کۆچکردنی پێغەمبەری ئیسلام لە مەکە بۆ شاری مەینە، هەروەها هەندێك جار دەرکەوتنی کەسایەتیەك دەبێتە بنەمایەکی مێژوویی وەك، بۆ نموونە ساڵنامەی رۆمانی، کە (رۆمۆلۆس)ی دامەزرێنەری شاری رۆما بە دانەری ئەو رۆژمیرە دادەنرێت، هەروەها رۆژی دەرکەوتنی جولەکەکان لە وڵاتی میسر کرایە سەری ساڵی ئیسرائیلیەکان، و دامەزراندنی دەوڵەت و فەرمانرەوایی مادەکان بە کۆششی دیاکۆی پاشای میدیەکان لە ساڵی (٧٠٠) پ ز بە سەرەتای مێژووی ساڵی کوردی پەسەندکراوە، یان رۆژی نەورۆز کە بۆتە چەژنێکی نەتەوەیی گەلی کورد و هەموو ساڵێك کوردەکان بەوپەڕی خۆشی و شادیەوە خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن و کردویانەتە یەکەم رۆژی دەستپێکردنی رۆژی نوێ، لێرەدا بە ئاشکرا دەست لەملانێی (زەمەن) و (بۆنە کۆمەڵایەتیەکان) بەدیدەکەین.

هەروەها ساڵیادی دامەزراندنی وڵات و دەوڵەت و حزبەکان کە هەمیشە بە رێز و شکۆوە یاد دەکرێنەوە، هەموو ئەو رووداوە گرنگانە بونەتە هۆی پێکهاتنی زەمەنێکی مێژوویی و

هەوڵ و تەقەڵای مرۆڤەکان بۆئەوەیە کە ئەم روودوە مێژوویانە بپارێزرێن و هەمیشە زیندوو بمێننەوە، بۆیە بە بۆنەی ئەم رووداوانەوەیە کە هەرساڵە لە هەمان کاتدا جەژن و نەریتێکی ئایینی بەرێوە دەبەن و بەم جۆرە خۆیان لە هەقیقەت و راستی و سەرەتای رووداوەکە نزیك دەکەنەوە، بە هیوا وخەیاڵ و ئەندێشەی ئەوەی کە ئەم جۆرە زەمانە مێژووییە بگەڕێتەوە، بەڵام لە راستیدا زەمەن ناگەڕێتەوە و ئەم یادکردنەوە و ئاهەنگگێرانە حەز و یادومانێکە لە دەرونی ئەفسانەسازی مرۆڤ هەیە و ئامادەیە. کەواتە زەمەن هۆی سەرەکی پاکانەکردنە بۆ کاروباری مەعنەوی بە تایبت عادەتەکان، رێورەسمەکان و رێسا و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لە رێگەیەوە پیرۆزدەکرێن و پاساودەدرێن[1].

کاتێك کۆمۆنیزمەکان دەیانەوێت (١٧)ی ئۆکتۆبەر دووبارەبکەنەوە، ئەو شیعانەی ساتە وەختی حەسەن و حوسێن وەکو نمایشێکی ئەزەلی ووبارە دەکەنەوە، جگە لەوەی کە رابردوو نمایش دەکەنەوە هیچیتر نین، رابردوویەك کە وێنەیەکی میتۆلۆژی و جوانیان داوەتێ و کردویانە بە ئەفسانە. هەروەها زۆرن ئەو حزبانەی کە دەیانەوێت دەقی رابردوویەکی بەسەرچوو نمایشبکەنەوە. بۆیە دەتوانم بڵێم ئێمە لەناو مێژویەکی نمایشانەددا دەژین، مێژوویەك کە ئێستای خۆی بە دەقێکی بزرکاوی دێرین وێنادەکات، زەمەنێك تێکدەشکێنێ تا زەمەنێکی بەسەرچووی لێدروست بکاتەوە[2].

لەم دیدەوە هەر رووداوێك کە دەهێنرێتە مەیدان تەنهای لە رێگای یادەوەریەوە مانای خۆی وەردەگرێت و بەبێ پەیوەندییە جەوهەرییەکانی لەگەڵ یادەوەریدا مانای نامێنێت. ئەم جۆرە دیە هەوڵدەدات، مانای ئێستای لە سێبەرەدا بچەقێنێت کە دەقە مێژوویەکان دەیسەپێنن، لێرەوە پەیوەندی ئێستا و رابردوو پەیوەندی کرانەوە و ویەکدی دۆزینەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی نمایشکردن و نواندنە، بەم جۆرە ئێمە لە مێژوو فێری وانە نابین، بەڵکو فێری نمایشدەبین. ئەوەش ئەوە دەردەخات کە ئەوەی لە ئێستا ناگات مێژوو دووبارە دەکاتەوە، دووبارەکرنەوەی مێژووش خۆی لە خۆیدا کوشتنی هەنووکەیە[3].

---

١ زمان هزرو کولتوور، ٢٠٠٦، هةولير، ل٨٥

٢ رەهەند- ٦ — ل ٣٠

٣ رەهەند- ٦- ل ٣١

ئەرك و ئامانجی ئەم جۆرە یادکردنەوەیە ئەوەیە، کە بە دیوێکدا  یادخستنەوەیە، بە دیوێکیشدا بیربردنەوەیە بە دیوێکدا بەرزکردنەوەی هەندێ مانایە و بە دیوێکیشدا کپکردنی هەندێ مانای ترە، لەلایەکەوە گەورەکردنی وێنەی هەندێ رووداوە و لەلایەکی ترەوە خەفەکردنی وێنەی هەندێ رووداوی ترە، بەم جۆرە بەشێکی کاری "یادکردنەوە" جیاکردنەوەی زەوییێکی حەرامە بێگومان لێرەدا ناتوانیین بڵێین کامە پانتایی لە زەمەن حەرامە و کامەیان حەڵاڵە، بۆچی چونکە ئەوە پرۆسەیەکە پابەندی خوێندنەوەی لۆژیکی ناو کایەکانە.  یادکردنەوە دەیەوێت وێنەیەکی یەکانگیر و پتەوە و ئۆرگانی و دابەشنەبوو ببەخشێتە رووداوێکی دیاریکراوی رابردوو  تا بەهانەی بەردەوامی گەورەتربێت، هەروەها یەکێك لە چەمکەکان یان وێنەکان یان قارەمانەکانی دەکرێت بە رەمزی و بە ئایدیالی، چەمك و وێنە و قارەمانەکانی دیکەش فەرامۆش و کپ دەکرێن[١].

وێنە ئایدیالەکانی خۆی لە رابردووەوە بەرهەمدێنێت، رەسەنایەتی خۆی لەو وێنە و رووداوانانەدا دەدۆزێتەوە، رەگوریشەی خۆی لە وێنەی ئەو قارەمان و شەهیدەکان دەدۆزێتەوە.

بوونی زەمەن لە چەندین رەهەندی جۆراوجۆردا خۆی پیشاندەدات، لە ئەنجامیشدا گوزارشتکردنە لە روانین و ویست و خواز، لە دەیمومە و بەردەوامیدا زەمەن هێمای رەسەن و توانا بەردەوامیە، بۆیە سیمای ژیاری زیندوو لەوەدایە کە ئاوێتەی زەمەنە.

مێژوو وابەستەیە بە فاکتەری زەمەنەوە کە هاوشان لەگەڵ کۆمەڵگادا پرۆسەی ئەندێشەو و کارە هزریەکان رووبەرووی پرنسیپی ئاراستەیی دەبێ. دەکرێ لێرەدا پرسیارێك قووت بکەینەوە، ئایا زەمەن کاریگەری بەسەر کۆمەڵگادا چییە. کۆمەڵگا لە کوێدا زەمەن دەست نیشان دەکات

مرۆڤ بە سروشتی ڕووت و داماڵراوی خۆیەوە، هەمان مرۆڤە لە نێو گەمەی گۆڕانی زەمەنەکاندا خۆی دەخواتەوە، خۆی بە بەش بەش دەبینێ، خۆی وەك چەندەها ئافەریدەکراوی لێکچوو دەبینێ، ئەوانیش تا کۆتایی دووبارە دەبنەوە، هەروەك ژیانی پێشوو خود لە خۆیدا خۆی دووبارە دەکاتەوە، لەسەر هەمان رەوت و هەمان زەمەن دەڕوات. گەردوون بەلایەنی خودی مرۆڤەوە بەرجەستەیەکی بێ سنوورە لە نێوان قەبارە و زەمەندا و هەموو ئەو پێوەرە

---

١ رەهەند- ٦- ل٥٠

زەمەنی و بەرجەستەییانەی گەردون، پێوەرێکن لە ناوەڕۆکدا ئاماژەن بۆ بە مرۆڤبوونی ئێمە لە نێوان بوون و نەبووندا.

زەمەنی ئەم دیمەنە بەیەکدا هاتووانە لە دنیادا هەن، زەمەنی جوولە و مردن و لەدایکبوونەوە ئاماژەیەکن بۆ بوونی چەندین زەمنی جیاوازی گەردوونی، کە زەمەنی ڕەها و بێ کۆتایی و بێ سنوورە، زەمەنێکە لە خودی خۆیدا بوونێکی نەناسراو و شاراوەی هەیە، کە لە لێکدانەوەی ئێمەدا وەکو ژمارەی زەمەنی خەیاڵی وایە، ئەو زەمەنە بێ سنورە ئاماژەن بۆ زەمەنی بونی تر، چونکە یاسای بەدوویەکدا هاتن و شوێنی ئێمە لەو بەدویەکدا هاتنە، هەر خۆی ئاماژەیەکە بۆ بوونی کەلەبەر لە زەمەن و شوێن و مانادا، لە سنور و گۆشەیەکی بچوکی بەیاساکراودا دەمێننەوە کە لە مێژووی بوون و زەمەنی گەردونیدا بەقەد دڵۆپە ئاوی دەریاییێکە. ئەمەش مانای ئەوەیە فراوانی و ڕەهایی بەرجەستەبوون و و زەمەنی گەردونی پەیوەستە بە شوێن وزەمەنی بونی ترەوە، کە تیایدا نە زەمەن ئەو مانایەی هەیە نە شوێن دەلالەتی مانەوە دەدات[1].

هەندێك جیاوازی هەیە لە نێوان زەمەنی خودی-ستوونی- و زەمەنی گشتی و هەمەکی، دەمێك وادەردەکەوێ کە زەمەنی خودی زووتر و خێراترە لە زەمەنی گشتی، ئەمەش وامان لێ دەکات هەست بەوەبکەین کە زەمەن خێرا تێدەپەڕێ و ژیان پێمان پێدەکەنێ و هەست بە شادی و کامەرانی دەکەین، کەچی لە هەندێك کات و دەمی دیکەدا واهەست ئەکەین کە زەمەنی خودی خاوتر و هێواشترە لە زەمەنی گشتی، لەو کاتەدا زەمەن دەبێتە ئەبەدی و جاویدانی [2]. زەمەنی خودی بە تەواوی بە پانایی ڕێڕەوەکەیدا دەڕوات و لەگەڵ خۆیدا هەموو زەمەنە دەروونیەکانی هەڵگرتووە. ناواخنی ئەم زەمەنە خودی کە مرۆڤ وەك تاکێك دەتوانێت چالاکیەك ئەنجامبدات و پەرەپێبدات، بۆیە جیایە لەگەڵ زەمەنە گشتیەکە.

لەلایەکی دیکەوە دەکرێت زەمەن بۆ سێ جۆر دابەش بکەین: ١- زەمەنی ڕۆژژمێری: لێرەدا مەبەست لەو زەمەنە سروشتیەیە کە بە هۆی کاتژمێرەوە بۆ مان دەردەکوێت، کارکرنی ئەم زەمەنەش بریتیە لە جووڵەی زەوی و سوڕانەوەی بەدەوری خۆردا. ٢- زەمەنی کۆمەڵایەتی: هەروەك چۆن جوولەی ڕۆژمێری جولەی سروشتیە، ئەوا جووڵەی کۆمەڵگە بنەماو توانای

١ تیۆری بنیاتی شاراوە — نەجات حەمید ئەحمەد — ل ٣٢٦

٢ جدلية الزمن- غاستون باشلار — ل ١١٥

زەمەنی کۆمەڵایەتیە. ٣- زەمەنی دەروونی: ئەمەش ئەو جۆرەیە کە هەموومان هەستی پێدەکەین و ئەم جوولەیە نە لە سروشتدایە و نەلە کۆمەڵگەدایە، بەڵکو لەرۆحدایە و چۆنیەتیەکان (کیفیات)ی ئەم زەمەنەسۆزگەراییە. بە گوزارشتی (ماسینۆن) ئەم زەمەنە لە لە کارلێکی ئەم دوو زەمەنەوە دروست دەبێت و رەوتی خۆی وەردەگرێ، هەندێك کات بە هێواشی دەبزوێ و هەندێك کاتیش بە خێرایی دەبزوێ و جووڵەکەی جوولەیەکی شۆڕشگێرانەیە[١] .

- **لە زەمەندا (رابردوو، ئێستا، داهاتوو) کامیان گرنگترە**

هەندێك لە فەیلەسووفان پێیان وایە کە هەستکردن بە زەمەن شتێکی دەروونییە،ئێمە لە ڕابڕدووماندا تەنیا ئەو شتە لە یادەوەریمان دەهێڵنەوە و لە یاد ناکەین کە خۆشمان دەوێت و حەزمان لێیەتی،ئەو شتەش لە ئێستا وەردەگرین و لێی دەپچڕین کە لامان گرنگەو سەرنجمان ڕادەکێشێت،هەروەها ئەو شتە لە ئایندە (داهاتوو) وێنا دەکەین و لێوەی دەڕوانین،کە دەمانەوێت و ئارەزووی دەکەین .((ئێستا)) جگە لە خاڵی بەیەکگەیشتنی نێوان ڕابردوو و ئاییندە هیچی دیکە نییە و بریتییە لە وێستگەی کاروانی زەمەن،هیچ جیاوازییەکی لەڕووی چۆنیەتییەوە لەگەڵ هەردوو جیهانی بەیەکگەیشتوودا نییە[٢] .

لە ڕوانگەیەکی دیکەوە،ئێمە بەوەوە پێوەستین کە توانیومانە لە ((ڕابردوو)) دا بەدەستی بێنین: پارە،زەوی،ناوبانگ، پایەو شوێنی کۆمەڵایەتی،زانیاری،یادگارەکان،ئیدی ئێمە جگە لە ڕابردوو هیچی دیکە نین،بەڵام ((ئایندە)) بریتییە لە پێشبینی کردن کەوەك ڕابردووی لێبێت و هەست کردن بە ئایندە وەك هەست کردن بە ڕابردوو،هەروەك لە دەستەواژەی ((ئەو کەسە داهاتووی هەیە)) دەردەکەوێت،کە ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەو کەسە لە داهاتوودا دەبێتە خاوەنی زۆر شت .سەبارەت بە پێوەندی مرۆڤ بەڕابردوو یادکردنەوەی ڕابردوو، مانای بیرلێ کردنەوەو ڕاکێشانیەتی،ڕابردوو مردووە،بەڵام مرۆڤ دەتوانێت زیندووی بکاتەوە،واتە مرۆڤ دەتوانێت زیندووی بکاتەوە،واتە مرۆڤ دەتوانێت سەر لە نوێ ڕابردوو بخوڵقێنێتەوە،یان ژیانی بە بەردا بکاتەوە وەك چۆن بە بەکارهێنانی ڕەمز ژیان بە بەرمردوودا دەکرێتەوەو دەبێت بە ئەم

---

١ گ- مێژوو- ژ- ١٠ — ل٢٢٢

٢ مجلة- العربي- عدد- ١٤٧ — ل ٢٠

کاتەو ئێستا .هەروەها دەتوانین هەست بە داهاتوو بکەین،وەك ئەوەی لە ئێستاو لێرەدا بێت،ئەمە کاتێك ڕوودەدات کە مرۆڤ حاڵەتێکی داهاتوویانە بە پلەیەکی کامڵ وێنا بکات[1] .

هەندێك بیروڕای جیاواز سەبارەت بە بەشەکانی زەمەن هەیە: هەندێکیان بڕوایان وایە کە پێشەنگی بۆ کاتی ((ئێستا)) دەگەڕێتەوەو لە ڕابردوو و ئاینده گرنگترە .کەچی ڕای دیکە هەیە (ئایینده) بە پێشەنگ دادەنێت بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوو و ئێستا و ئەوانەی (ئێستا) پێشدەخەن ئەوانەن کە پێیان وایە کە زەمەن شێوەیەکە لە شێوەکانی (ئەزەلییەت) و لە ڕوانگەی ئەمانە زەمەن بریتییە ئێستایەکی هەمیشەیی[2] .

ئەو بۆچوونەی (ڕابردوو) بە سەرەتاو پێشەنگ دەزانێت یان دادەنێت، پێیی وایە مرۆڤ زادەی دوێنێیەو کولتوری کۆن سروشتی (ئێستا) و (ئاینده) دە ڕدەکات. بۆچونێکی دیکە هەیە کە (ئاینده) بە پێشەنگ دادەنێت،چونکە لە ڕوانگەی ئەم بۆچوونەوە مرۆڤ تەنیا لە پێناوی ئەم شتەدا دەژی کە هێشتا نە هاتووەتە کایەوە و لە بووندا نییە و مرۆڤ ژیان و بوونی خۆی لە پێناو هێنانەدی دوارِۆژ و ئاییندەدا تەرخان دەکات!

واتە هەمیشە جووڵە و کاری مرۆڤ بەرەو ئاینده و پێشەوە یە، بۆیە ئاینده گەوهەری مرۆڤە.

(فیشتەی) فەیلەسوف سەبارەت بە ساتەکانی زەمەن دەڵێت: زەمەن ئێستاییە، کە ڕابردووی تێدا دەژی، چونکە ئێستا سەرچاوەی ڕوانینمانە بۆ ڕابردوو[3] .

هەروەها لەم بارەیەوە مارتن هایدگەر دەڵێت زەمەنیەت بەردەوام لە خودی خۆی ڕەت دەبێت و دەبێتە ئێستاو لە ئێستا بۆ ئاینده ڕەت دەبێت [4] .

هەروەها برگسۆن بڕوای وایە، کە ڕابردوو ڕۆڵی سەرەکی لە پێکهاتنی کەسایەتی هەیە ؟ بۆیە دەڵێت:ڕابردوومان بە دوامانەوەیەو لە گشت کات و ساتەکانی ژیاندا وازمان لێ ناهێنێت، لە بەر ئەوەی ئەو هەست و شتەی لە منداڵی و هەرزەکاری هەستمان پێ کردووە و ویستوومانە تاکو ئێستا هەر لە ناخ و دەروونماندا ماوە[5] .

---

١ مجلة- العربي- عدد- ١٤٧ — ل ٢٠

٢ مجلة- العربي- عدد- ١٤٧ — ل ٢١

٣ الزمان في الفكر العربي و العالمي — ل ١٧٣

٤ الزمان في الفكر العربي و العالمي — ل ١٧٣

٥ مجلة- العربي- عدد- ١٤٧ — ل ٢١

(راسكن) ی فەیلەسوفیش پێیوایە ئێستا چەمك و شتێكی ڕێژەییە،چونكە ئێستا لە پرۆسەی گۆڕانی هەمیشەیی دایە،هەروەها چەمكی ڕابردووش ڕێژەییە و ئەو شتەی كە بە ڕابردوو پێوەستە بریتیە لە پرۆسەی پەرەسەندنی واقیحی بابەتیانە. ئاینده درێژەی ئێستا و ڕابردووە،خودی مرۆڤیش دەرئەنجام و پاشماوەی ڕابردووە و بوون و كەسایەتی مرۆڤ زادەی ئەزموون و شارەزایی هەڵە و ڕووداوەكانی ڕابردوویەتی،بۆیە فەیلەسووفی گەورە هیگڵ دەڵێت: (گەردوون ئەو شتەیە كەە بووە)مەبەستی ئەوەیە ئەو شتانەی كەئێستا هەن ئاكامی ئەو هۆكار و كاریگەریانە یە كە لە ڕابردوودا هەبوون[1].

(ئەفلوتین)یش لە ناخدا هەستی بە ئالۆزی و ئیشكالیەتی زەمەن كردووە و بڕوای وابوو كەسێ زەمەن هەیە،كە هەر سێكیان ((ئێستا))ن، یەكێكیان ئێستای بەردەوامەو ئەو ساتەیە كە شتەكان تێیدا ڕوددەن،زەمەنەكەی دیكە بریتیە لە ئێستای ڕابردوو،كە پێی دەڵێن بیر ئانین و یادەوەری،زەمەنی سێیەمیش بریتیە لە ئێستای ئاینده،واتە ئەو هیواو مەترسیانەی كە لە هزرو خەیاڵماندایە[2].

ئەسڵی بیرۆكە و بۆچوونەكانله سەر ڕابردوو،ڕانەبردوو،داهاتوو،یان بڵێین زەمەن،بوونی جەستەییمانە، ماوەی سنووورداری ژیانە.ئێمە هەست بەوە دەكەین كەوا لە ناو ساتەكانی زەمەندا گەشەدەكەین و درك بەوە دەكەین كەلە ڕابردوو بەرەو ئاینده دەڕۆین،هەروەك (گۆتە) دەڵێت:ئێستایەكی ڕووت وپەتی بوونی نییە،پوونكە بەشێك لە ڕابردوو وبەشێك لە ئایندەی لە خۆ گرتووە.زەمەنی ئێستاكێی ڕۆژانە پێكهاتەی ئەو دووبارە بوونوە سەرمەدییەی جیهانی مرۆڤەكانە بەرەو ڕەهەندێكی دووروئاییندەیەكی نادیار[3].

**- زەمەن و رابردووی مرۆڤ:**

بۆ ئەوەی لە چەمك و واتای زەمەن تێبگەین، دەبێت لە رەگەزە بونیادنەرەكانی زەمەن بگەین كە بریتین لە (رابردوو، ئێستا، داهاتوو). رابردوو بە هەموو جۆرە و شێوازێك خۆی دەخزێنێتە ناو ژیانی هەنووكەییمان و دەكرێ بڵێین پێكهاتەی هەر ساتێك لە ژیانی ئێستامان

١ مجلة- العربي- عدد- ١٤٧ – ل ٢١
٢ الزمان في الفكر الديني و الفلسفي – ل ١٤٤
٣ الزمان في الفكر العربي و العالمي – ل ١٧٠س

ئاوێزان و تێکئاڵاوە لەگەڵ رابردوو، بە جۆرێك کە ناتوانین خۆمانی لێ دەربازبکەین، لە راستیدا مرۆڤ هەرچیەك بکات و هەرچەندە رۆژگار تێپەڕببێت، ئەوا رابردوو هەر نامرێت، بەڵکو لە ناخی قوڵ و پەنهانەکاندا خۆی حەشار داوە و چاوەڕوانی رێکەوت و کاتێکی گونجاو دەکات بۆ ئەوەی سەرهەڵبدات و دەرکەوێت، ئێمە هەمووومان تەرمی رابردوو بەشانمانەوەیە، لە هەرشوێنێك لێمان جی بمێنێ دڵمان بۆی تەنگ دەبێ، هەمیشە و بە جۆرێك لە جۆرەکان، شتێکی دیاریکراو بەدوامانەوەیە، هەردەم دیمەن و ژیانێك پشت ژیانمانە، بۆیە رابردوومان خۆی لە پشت ئێستاماندا حەشارداوە. کەواتە مرۆڤ بە جۆرێکی خراپ گیرۆدەی رابردوویەتی، بە جۆرێك ئێستا وەك خۆی و کاتێکی جاوید ناتوانێ بژی، لە ئێستا و داهاتوودا ئەوەی هەیە دەبێ بچێتە مەکینەی رابردووەوە. ساتەکانی ئێستا و رابردوو واتێکئاڵاون کە وا لە زەمەن دەکەن، بوون و کەینونەیەکی خاو وجەلاتینی هەبێت، واتە ئەو شتانەی کە ئێستا هەن تەنها پاڵپشتێکن بۆ ئەوەی بوونی مرۆیی بگوازێتەوە بۆ رابردوو، ئا لەم کاتەدا ژیان دەبێتە نواندن و تەمسیلکردنی رابردوو[1]. رابردوو بە بەسەرچوونی کاتەکەی تێناپەڕێت و بەکۆتایهاتنی دەمەکانی کۆتایی نایەت، بەڵکو ئەو بە زیندوویی و کاریگەر لە ژیانماندا دەمێنێتەوە، چونکە رابردوو بونێکی بابەتی هەیە لە (ئێستا) دا کە لە (داهاتوو)ی دواوەی خۆی حەشارداوە[2].

ئەگەر لە رابردوودا لەسەر بنەمای نەگەڕانەوە سەیری کات کرابێت، ئەوەی کە زەمەن رووەوە یەك ئاراستەیە و روو لە پێشەوەیەو هەرگیزگەڕاوەی نییە وێنای راستی رابردوو بەوە لەناو دەچێ تەنیا دەتوانرێ رابردوو بە وێنایەك دابنرێت کە بۆ چرکەساتێك کە دەتوانرێ دیاری بکرێ، دەربکەوێ و ئیتر هەرگیز دووبارە نەبینرێتەوە) بە لێکدانەوەی رانکە دەربڕینی مێژوویی رابردوو بە هیچ شێوەیەك بە مانای پاڵپشتی ئەو (بە هەمان شێوە کە لە راستیدابوو) نییە، بەڵکو بە مەبەستی پاراستنی یادەوەرییەکە کە لە ساتەکانی مەترسیدا دەردەکەوێ[3].

مێژووگەرێتی وێنەیەکی پایەدار، ئەزەلی لە رابردوو پێشکەش دەکات، لە کاتێکدا کە ئەزموون و سیمایەکی نوێ و تایبەت بە تاك لە رابردوو بەدەستەوە دەدات.

---

١ مجلة الفيصل- عدد — ١٣٣- ١٩٨٨- ل٣٨

٢ ط — هێذان- ذ، ٢٣- ل ١٤٩

٣ طؤظاري كؤض — ذ (١١-١٢)- ٢٠٠٩ - ل ٣٨٠

هەیە رابردوو بە ئاسانی ئەو شێوە سەدیمیە وەرناگرێت، بە ئاسانی نابێت بۆ رووبەرێکی کراوە بۆ راڤەکردن و ئەگەرکاری...تەنها چۆنایەتیەکی کامڵ و چڕوپڕ لە ماناو هەست و نەغمەی تایبەتی دەتوانێت ئەو راڤەکردنە پیادەبکات و رابردوو لەبەر دەستیا ببێتە بابەت و کەرەستە و تاقیگە، بەڵام ئێگجار کەمن چرکە کامڵ و چڕ نەغمەدارەکان، ئێگجار کەمن ئەو ساتانەی کە زەمەن تیایدا لابەلابوونەوەکانی خۆی ئاشکرادەکات و سیحری خۆی لەهەر سیحرێکی دیکە جیادەکاتەوە، ئێجگار زۆریشن ئەو زەمەن و ساتانەی کە دووبارەبوونەوەیەکی هەمیشەیین، کە لە یەك چۆنیەتی لە قاڵبدراون و دووبارەدەبنەوە و خۆیان کردوە بە ناوەراستی بازنەی هەموو چرکەکان.

ئەگەر رابردوو بە راستی مێژوویی بێت و ئایندەش ئەوە بێ، کە دەبێتە رابردوو، ئایا (ئێستا) چی دەبێ؟

ئەکرێ وا پێناسەی (ئێستا) بکرێ کە ئەو خاڵەیە لەنێوان دووباری زەمەنی دیکەدا دێت ودەچێ، لێرەدا گوزارەی بوون و گەردوون وەك سازدانی نێوانی ئەو شتانەیە (کە تا ئێستا هەبوون) و (دوایی دەبن) لێرەوە ئەو چرکە ساتەی ئێستا، رەوایی لەوانە وەردەگرێ کە تا ئێستا رویانداوە و دوایی روودەدەن. (ئێستا) کەوەك نمونەی سەردەمی (بەلێندراو) هەموو مێژووی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی کورت لەخۆدەگرێ، رێك هەماهەنگە لەگەڵ بایەخ، بڕواپێکراوی و پلەی مێژووی مرۆڤ لە جیهاندا.

چۆنایەتی ئێستا وەك ساتێکی تایبەتی داخراو کە لە پێش خۆیەوە بەرهەمنەهاتووە، راڤەکردنێکە جیاواز لە راڤەکرددنەکانی دیکە، ئێستا لەلایەك خۆتاقیکردنەوەی بەردەوامی زەمەنەبەسەر دراوەکانی عەقڵ و جیهاندا لەم چرکەیەداو لەلایەکی تریشەوە خۆتاقیکردنەوەیە لە بەرامبەر رابردوودا. رابردوو لە بەرامبەر زەمەنی دوای خۆیدا وەکو کڵاوی جادوبازەکان وایە، هەر جارەی شتێکی لێ دێتە دەرێ، ئێستاش کاتێك وەك چۆنایەتیەکی جیاوازلەگەڵ زەمەنەکانی تردا دەردەکەوێت[1].

مەبەستمان لە (هەنووك-الان) چییە؟ دوورنییە هەنووك هەموو زەمەن بێت، چونکە رابردوو ئەو کات-دەم- هەنووك بووە، هەروەها داهاتووش هەنوکێکی دیکە دەبێت، بۆیە هەندێك پێیان وایە هەنووك ساتێکی نەمرە. لە راستیدا هەنوك کێشەیە، ئایا دەتوانیین

---

١ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٤

هەنووك یەكسان بكەین بە زەمەن، یان بڵێین زەمەن چەند (الان) هەنووكێكی یەك لە دوای یەكە[1]. ئەگەر تیری زەمەنی یەك ئاراستە كە لە ئەزەلەوە دەست پێدەكات بۆ ئەبەد، بگەڕێنینەوە، ئەوا هەنووك نادۆزینەوە، واتە لەم شێوەیەدا هەنووك مانای خۆی لەدەست دەدات. ئایا بوون لە خودی خۆیدا گەڕانەوەیەكی ئەبەدییە، یان شەپۆڵی زەمەن تیرێكە یەك ئاراستەیە لە ئەزەلەوە درێژدەبێتەوە بۆ ئەبەد؟[2]

(كارڵ مانهایم) پێیوایە كە "كات" بریتیە لەو چركەیەی لە ئێستا و ئێرەداتێپەڕ دەبێت، چركەیەك كە باركراوە لە مەدلوول و مانا.

هیچ هەستكردنێك بە زەمەن چڕی و سەنگ و ئامادەیی ئێستای نییە، بۆیە هەنوكەی ئێمە ئەو ساتەیە كە هەرگیز ناشێت لەوەوبەر ببوایە یان لە داهاتوودا ببێت.

زەمەن، دواتریش دیاریكردنی مانای چۆنایەتی لە ناو ساتە جیاوازەكانی زەمەنداو پەیوەندی چۆنایەتیە بەسەر چووەكان و شێوەی ئامادەبونیان لە ناو چۆنایەتی ئێستادا. بەكورتی هەوڵمانداوە ئەوە نیشانبدەین كە زەمەن لە راستیدا گۆڕانی حالەتەكانە، هەر شتێكیش كە لە زەمەنێكەوە بەرەو زەمەنێكی دیكە دەكشێت مانای دەگۆڕدرێت و شوێنیشی لە سیستمی روانیین و بیركردنەوەدا دەگۆڕێت[3].

رابردوو كە لە ناو مێژوودا دەخوێندرێتەوە بە واتای ئەنتۆلۆژی، بوونی سەربەخۆی خۆی هەیە، بەڵام بە واتا ئەبستمۆلۆیەكەی لە هەنوكەدا بەردەوامە و ئێستاش پێكدەهێنێت، بۆیە رابردوو لە ناو پێكهاتەی دەرونی گشت تاكێكدا ئاسەواری خۆی دەبینێت و لەناو سیستەمی كۆمەلایەتیدا شوێنەواری خۆی دەنەخشێنێت.

لەم رۆژگارەدا بۆیە مرۆڤ ناتوانێت لە ئێستادا بژی و دابڕێت لە رابردووی و بیر لە مێژوو نەكاتەوە. بە مانای كاتێكی كۆن تێپەڕی و لە رووداوگەلێك كە پەیوەندیەكی دەرەكی و بابەتین، بەڵكو بەردەوامیەكە لە زەمەن و كاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ و

---

١ ماهو الكون — ل ٩٨

٢ ماهو الكون - ٩٨

٣ رەهەند- ژ-٦- ١٩٩٨- ل ٢٠

بێگومان راڤەکردنی رابردوو و تەوئویل کردن و پێدانی مانایەك بە رابردوو هەمیشە دێوەزمەیەك بووە[1].

لە راستیدا هیچ شتێك هێندەی رابردوو، کە بەردەوام وەك سێبەر بەدوای مرۆڤەوە بووە، هەستی زانیین و بەدواداچوون لە مرۆڤدا ناجولێنێت (سروشت و رابردوو هەمیشە بابەت بوونە لەبەرامبەر هۆشیاری مرۆڤدا)، مرۆڤ لە تەواوی قۆناغەکانی بەرەو پێشچونی ژیانیدا نەیتوانیوە و ناتوانێت لەبەرامبەر ئەم دوو بابەتەدا (سروشت و رابردوو) بێ هەڵوێست بێت، چونکە هەردوکیان پەیوەندی تەنگاوتەنگیان لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا هەیە، هەر ئەم پەیوەندیە بەردەوامەی (سروشت و رابردوو) بە مرۆڤەوە بۆ خۆی دەبێتە هۆکارێك کە مێژوو شان بەشانی شیعر و چیرۆك سەرهەڵبدات و لە شیعر و چیرۆك نزیك بێت[2]. هەروەها یەك مانا لەخۆبگرن و یەك ئەرکیان هەبیت. مرۆڤ هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەی لە مێژووکردوە کە زانیاری راست و دروستی پێبدات لەسەر رابردووی خۆی و هەستی زانیین و بە دواداچوونی تێربکات، هەروەها ئاسۆی بینینی لە درخی ئێستادا و لە بارەی ئێستاوە فراوانبکات و بەرچاوڕوونی پێبدات لەسەر ئایندە[3].

- **رابردوو:**

تێڕوانینی فەیلەسوفێك جیایە لە تێڕوانینی مێژوونوسێك یان دەروناسێك بۆ رابردوو، هەر یەکەیان بە چاوێکی جیاوازەوە و لە دەلاقەیەکی ترەوە سەیری "رابردوو" دەکەن. بۆیە رابردو تەفسیر و شرۆڤەی جیاجیا وەردەگرێت.

هەر مێژوو نوسێك تەفسیری خۆی بۆ رابردوو هەیە و دەکرێت بلێین، رابردوو بەرهەمی ژیانی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤەکانە.

رابردوو بە ئاسانی ئەو شێوە سەدیمیە وەرناگرێت، بە ئاسانی نابێت بۆ رووبەرێکی کراوە بۆ راڤەکردن و ئەگەرکاری. رابردوو مانایەکی بێڕەنگ و بێدەنگی هەیە ...تەنها چۆنایەتیەکی کامڵ و چڕوپڕ لە ماناو هەست و نەغمەی تایبەتی دەتوانێت ئەو راڤەکردنە پیادەبکات و

---

١ گ — هەژان- ژ، ٢٣- ل ١٦٨

٢ گۆڤاری کۆچ — ژ (١١-١٢)- ٢٠٠٩ - ل ٤٠٥

٣ گۆڤاری کۆچ — ژ (١١-١٢)- ٢٠٠٩ - ل ٤٠٦

رابردوو لەبەر دەستیا ببێتە بابەت و کەرەستە و تاقیگە، بەڵام ئێگجار کەمن چرکە کاملْ و چڕ نەغمەدارەکان، ئێگجار کەمن ئەو ساتانەی کە زەمەن تیایدا لابەلابوونەوەکانی خۆی ئاشکرادەکات و سیحری خۆی لەهەر سیحرێکی دیکە جیادەکاتەوە، ئێجگار زۆریشن ئەو زەمەن و ساتانەی کە دووبارەبوونەوەیەکی هەمیشەیین، کە لە یەك چۆنیەتی لە قاڵبدراون و دووبارەدەبنەوە و خۆیان کردوە بە ناوەراستی بازنەی هەموو چرکەکان.

بە شێوەیەکی گشتی دوو تێڕوانین هەیە بۆ رابردوو و داهاتوو: لە روانگەی تێڕوانینی یەکەم، رەوتی زەمەن لە رابردوو بۆ داهاتوو گوزەردەکات کە پرۆسەیەکە رووە و هەرەسهێنانە، کەچی تێڕوانین دووەم پێیوایە کە ژیانی مرۆڤ لە رەوتی زەمەندا بەردەوام بەرەو پێش دەچێت و پێش دەکەوێت. ئەو دیدەی بڕوای وایە کە داهاتوو چاکتر و باشتر دەبێت لە رابردوو ئەوە بۆچوونی زانا و بیرمەندە مرۆییەکانە کە بڕوایان بە پێشکەوتنی مرۆڤ هەیە، کەچی بڕوابوون بەوەی رابردوو باشترە لە ئێستا و داهاتوو، ئەوە دیدی کۆن پارێز و باوەڕدارەکانە[1].

تا نەتوانیین وێنە بە هەشتیەکانی رابردوو بشکێنین ئەستەمە بتوانیین ئاستە دۆزەخەکانی جێبهێلیین.

رابردوو — رەسەن- لەسەرێکەوە ئەو جووڵەی ناوەکی زەمەنی وەستاندوە و لەسەرەکەی تریشەوە وانیشاندەدات، کە ئەو میوانی زەمەنێکی ترە و بە میوانی هاتۆتە ناو زەمەنی ئەمڕۆی ئێمەوە.

ناتوانیین لە رابردوو شارەزابین، مەگەر لە رێگەی مەعریفەیەکی ناراستەوخۆ....ئێستا، بابەتێکە بۆزانیین و توێژینەوە، وەك رابردوو، هەرچەندە هەرشتێك لە رابردوو بینرابێت، ئێستایە[2].

ئەگەر فەلسەفەی مێژوو بیەوێت جێگای متمانە بێت، ئەوا دەبێت، پاکانەی ئەوە بکات کە سەرجەم رەوتی زەمەنی مرۆڤایەتی دەزانێت، لە ئێستا، رابردووو داهاتوودا.

پاکانانەکردن بۆ زانستێك، کە بانگەشەی ئەوە دەکات هەموو مێژووی مرۆڤایەتی دەزانێت، لە بارێکی تایبەت، چارەسەرکردنی گرفتی پاکانەکردنی گوتاری فەلسەفی لەبارەی بونەوەر. واتە ئەوە دەردەخات کە مرۆڤ دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر دیاردەکان، بە واتایەکی

١ فلسفة الوعي بالزمن- مجلة(الثقافة الاجنبية- عدد، الثاني، سنة ا الثانية — بغداد- ١٩٨٢- ل ٤٣

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ١٥٥

دیکە، سنوری بواری بینین و دامەزراندنی پیوەندیەکی مەعریفی، یا خەیاڵی، یان پرۆسیس لەگەڵ مەیدانی نەبینراو[1].

تایبەتمەندی فەلسەفەی مێژوو لەوەدایە کە ئێستا دەگرێتە خۆ بە دابەشکردنی بەهاکانی زەمەن. ئێستا کە ماوەیەکی نێوەند و کاتیە، کە دیاردەی ئەرێنی و نەرێنی دەگرێتە خۆ و گوزەرانی دەکات. [2]. دوو ئەنجام لەمەڕ ئاراستەی زەمەن، پێویستە یەکێکیان هەڵبژێرین، ئەوەتا یان ئایندە پێشکەوتوو دەبێت کە ئاکامی ئەگەر ئەرێنیەکانی ئێستایە، یانیش ئایندە دەبێتە رەنگدانەوەی ئەگەرە نەرێنیەکانی ئێستا. ئەو زەمەنەی کە مرۆڤ بە ئاسوودەیی و گونجاوی لەگەڵ خۆیدا دەسازا، بەبەردەوامی مێژوو دوری دەخاتەوە[3].

## - زەمەن و ئاینده و چارەنوسی مرۆڤ:

زەمەن بە سروشتی خۆی هێزە، هێزێکی کاریگەرە بەسەر سیستەمی عەقڵ و ژیانی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، هێزێکە مانا دەبەخشێتە کار وکردەکانمان، هەروەها پەل دەهاوێت بۆ ناو بونیادەکانی دیکەی ژیان و کۆمەڵگە، بەمەش زەمەن بە سروشتی خۆی کار لە کۆمەڵگا و ژیان دەکات.

بیرمەندان و فەیلەسوفان لەلایەن خۆیانەوە کار بۆ ئامادەکردنی جیهانێکی باشتر بۆ مرۆڤایەتی دەکەن، ئەم جیهانە باشەش لە داهاتوودا دەبێت. لەبەرئەوەی (ئێستا) لە تەواوەتی (الکمال)یەوە دوورە، هەروەها بە هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ نەبێت بۆ چاکسازی گشتی ئەوا بەدی نایەت، ئەو هەوڵ و تێکۆشانەش لەسەر وابەستەیی هەوڵی ئێستا و داهاتووی نەوەکان راوەستاوە، واتە رابردوو پشکی هەیە لە بنیاتنانی هزری ئێستادا[4].

لەم روانگەوە، لە کاتێکدا (مێژووی داهاتوو) بە بێژەی (پلان) گوزارشتی لێ دەکەن، جا کاتێك ئێمە پلانی داهاتوو دادەرێژین، ئەوا وێنەی هێڵەکانی مێژووی ئایندەمان دەکێشین، بۆیە

١ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٦٢

٢ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٦٣

٣ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٦٣

٤ گ — هەژان- ژ، ٢٣- ل ١٤٨

کاتێك پلانی پێنج ساڵە دادەنێین ئەوا بەلای کەمەوە ئەو ڕەوتەی کە پێویستە لە ئایندەدا بگرینە بەر دەنوسینەوە[1].

بیرمەندی میسری (زەکەریا ئیبراهیم) پێیوایە، بوون و ژیانی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی بریتیە لەو هەوڵ و کۆششەی کە دەیدات لە پێناو نوێکردنەوە وتازەکردنەوەی ژیان و فڕێدانی پاشماوەکانی رابردوو، وەك بلێی ژیان هەمووی گەڕان بێت بە دوای سەرچاوەیەکی ڕەسەن بۆ چالاکیەکان و داهێنان، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژیانمان هەمووی کارکردنە بۆ دەربازبوون لە رابردوو و دەرچوون بەرەو ئاینده[2]. هەروەها دەلێت: (گەلێك جار هەست بەوە دەکەین، کەئێمە هەین و دەژین لە پێناو ئەو شتەی کە ناتوانیین پێشبینی بکەین، نەك لە پێناو ئەو شتەی کە ناتوانیین بیگەڕێنینەوە)[3].

مرۆڤ بونەوەرێکی زەمەنیە، واتە لە نێو بونەوەرەکاندا تەنیا مرۆڤ هەست بە زەمەن دەکات و بایەخی پێدەدات، بۆ نمونە گیاندار وئاژەڵەکان تەنها لە ئێستادا دەژین، نە رابردوو جێگای شانازی ئەوانە و نە ئایندەش جیگا و مایەی ئومێد و داواکاری ئەوانە، بۆیە تەنها مرۆڤ رابردوو بە کەلەپوور دادەنێت و و شتە جوان و باشەکانی لیّ وەردەگرێت، هەروەها کار و کۆشش دەکات لە پێناو ئاینده و بە هیوای ئەوەیە کە باشتر و چاکتر بێت لە رابردوو و لە ئێستاش. بۆیە لە راستیدا مرۆڤ لە پێناو ئایندەدا دەژی، لە پێناو ئەو شت و هیواو ئامانجانەی هێشتا نەهاتۆتەدی[4].

کەچی هەندێك لە بیرمەند و زانایان پێیان وایە، کە مرۆڤ ناتوانێت خۆی لە ڕووداوەکانی داهاتوو دەربازبکات، واتە لەو چارەنوسەی کە بۆمان داندراوە و تەنها ئەو کاتە داهات و ڕووداوەکە کەشف و ئاشکرادەبێت، کە دەگەینە دوا وێستگە[5]. لە ڕوانگەی ئەمانەوە، مرۆڤ ڕایندەیە و لەبەردەم چارەنووس و قەدەر هیچی لەدەست نایەت، چونکە ئەو تەنها پنت و خاڵێکی شریتی زەمەنە.

---

١ گ — هەژان- ژ، ٢٣- ل ١٤٩

٢ مجله العربی- عدد، ١٤٧- ١٩٧١- ل٢٥

٣ هەمان سەرچاوە- ل ٢٥

٤ هەمان سەرچاوە- ل٢٠

٥ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٧١

سارتەر دەڵێ: " ئەوە هەر ئاییندەیە بڕیاردەداتو کە ئایا رابردوو زیندووە یان مردووە" ئایندە ئازادییە، بە پێی پێناسەی ئەنتۆلۆژیانەش ئایندە پلانە، هەمیشە گۆڕاوەکە و پێشبینیەکانی ئێمەیە لە بواری کارو و خاوەنداریەتی و کەینونەدا، کەواتە (رابردوو) لە راستیدا لە پلانێك و پێشبینیەکی بەرەو ئایندە بەولاوە چیدیکە نییە، کاتێکیش کە ئایندە دێتە کایەی (بوون)وە، دەچێتە رابردووشەوە و دەبێتە ئەو مادەیەی کە مێژووی لێ دروستدەکرێ، ئەمەبنچینەی روانینی بوونگەرایانەیە بۆ مێژوو و زەمەن[1].

لەلایەن خۆیەوە، (کریشنا مۆرتی) پێیوایە، کە ئێمە بەردەوام لە چوارچێوەی ئایندەدا بیردەکەینەوە و لە رووی دەروونیەوە بۆ سبەینێ بەرنامەرێژی دەکەین و ئێمە لە رووی دەروونیەوە دەمانەوێت "بەیانی شتێك بین"[2].

ئەوەی رابردوو وئێستا و ئایندە دەستنیشان دەکات ئومێدو ئارەزوەکانن، لەوەش زیاتر هەر ئەوانەن کە چوارچێوەی تێگەیشتن لە کاتیبونیی شتەکان دەستنیشان دەکەن.

دیارە پرسیارکردن سەبارەت بە ئایندەی مرۆڤ، پرسیارگەلێکی سەختن و پەیوەستن بە بوونی خۆی و چارەنووسی خۆیەوە، پەژارە و راڕاییەکەشی دەوروژێنن و بەردەوام ئامادەییان هەیە. گەرەکە " بیرمەند و نوسەران" خۆ لە کردەی دۆزینەوەی ئەو نهێنیە نەبینراوانەی کە لە خودی بوونەوە و واقیدا هەن، نزیك بخەنەوە، هەروەها ئەو پەژارە ناوەکیەی مرۆڤ رونبکەنەوە و و چرکەساتە دووبارە نەبوەکان بەرجەستە بکەن- ئەو دەمەی مرۆڤ رووبەرووی چارەنوسازە تراژیدیاکەی خۆی دەبێتەوە.

---

١ گ، ئایدیا، ژمارە ٨-٩، ل ١٩٣

٢ گ، ئاینده، ژ- ٣٣ — ل ٧٩

# بەشی نۆیەم

## (زەمەن، گەردوون، سروشت)

### - زەمەن و شوێن:

بە گوێرەی (فەرهەنگی فەلسەفی) کە "رۆزنتال" سەرپەرشتی کردوە، زەمەن و شوێن دوو شێوە و فۆرمی سەرەکی بوونن و ئەو پرسیارە دەکات کە ئایا، زەمەن و شوێن دوو بابەتی حەقیقی و راستەقینەن، یان دوو شتی موجەڕەدن و تەنها لە ئاگایی مرۆڤدا هەن، بە گوێرەی ئەم فەرهەنگە، مادە سێ تایبەتمەندی هەیە سەرەکی هەیە، کە بریتین لە: شوێن، زەمەن، جولان.

شوێن: هەر دیاردەیەك چوارچێوەیەکی تایبەتی هەیە و رادەیەك لە فەزای دادەپۆشێ و دایدەگرێ. ئەو دیاردانە هەموویان پانایی و درێژایی و ئەستوریان هەیە و بە تەواوی لە جولان دان. زەمەن: یەکێك لە شێوەکانی دیکەی بونی مادە زەمەنە کە بریتیە لەو ماوەیەی کە رەوتی گۆڕانی چلۆنایەتی دیاردەیەك دەگرێتەوە، بە واتایەکی دیکە زەمەن شکل و شێوەی رادەی مانەوەی دیاردەکانە، زەمەن تەنها یەك ئاراستەی هەیە، ئەویش لە رابردوودا بەرەو داهاتوو تێدەپەڕێ، بۆیە جیهان لە زەمەن وشوێندا بێ بڕانەوەیە.

بە پێی بۆچوونی نیوتن، زەمەن و شوێن لە یەکتری سەربەخۆین، هەروەها پێی وابوو کە شوێن وەك سندوقێکی گەورە وایە کە شتەکان لە نێویدا دادەنرێ. بەڵام زانست ئەوەی دەرخست کە زەمەن وشوێن پەیوەندیەکی پتەویان پێکەوە هەیە، و بە گوێرەی تیۆری ئەنیشتاین،

تایبەتمەندیەکانی زەمەن وشوێن بەستراوەتەوە بە بوونی شتە مادیەکان و بوونی شتەکان بێ زەمەن وشوێن مەحاڵە.

جولان: یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی بوونی مادە جولانە و مادە هەمیشە لە جموجۆڵی بەردەوام دایە و وەستان حالەتێکە لە جوولان، بۆیە مادە بێ جوولە بوونی نییە.

لەلایەن خۆیانەوە، فەیلەسوفە ئایدیالیستەکان، بابەتیبوونی زەمەن و شوێن رەتدەکەنەوە و و پەیوەستی دەکەن بە ئاگایی تاك، لەوانە (برکلی، ماخ) کە پێیان وایە زەمەن و شوێن دوو فۆرمی بەرایی رامانی هەستیاری مرۆڤن[1].

کەچی فەیلەسوفە ماتریالیستەکان، باوەڕیان بە بابەتیبوونی زەمەن و شوێن هەیە و هەر بوونێك لە دەرەوەی ئەم دووە، رەتدەکەنەوە هەروەها پێیان وایە کە زەمەن و شوێن لە مادە جیانابنەوە و مادە تەجەلی هەردوکیانە، هەروەها مادە زیاتر لە زەمەندا هەیە وەك ئەوەی لە شوێن داهەبێت[2]. لای هەندێم لە فەیلەسوفان زەمەن بەوە پێناسەکراوە جەوهەرێکی رووت و داڕنراوە لە مادده، لای دیکارت زەمەن و شوێن دووشتی جیاوازن، شوێن درێژبونەوەی سێ رەهەندی ئەندازەییە، بەڵام زەمەن دوو جۆرە زەمەنی سروشتی و زەمەنی دەروونی یان خودی، زەمەنی سروشتی شتێکی سەرەتایی و بەڵگە نەویستە هەر کەسێ بە وریایەوە لە سروشتی زەمەن بڕوانێت دەزانێت، بەشێکی دیکەی زەمەن زەمەنی دەرونییە[3]. ئەویش خۆی لە کۆجیتۆدا دەبینێتەوە" من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم" مەبەست لە زەمەنی سروشتی ئەوەیە، ئەگەر ئەو هۆیە نەبێت کە هۆی بەردەوامیمانە، مەبەست هۆیەکە کە خودایە، ئەوا بەدوای یەکداهاتنی کات نابێتە بەردەوامیمان، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە زەمەنی دەروونی یان خودی، بوونی مرۆڤ یاخود هەستکردنی مرۆڤە بە بوونی خۆی لە کاتی بیرکردنەوەدا[4].

لای فیزیاناسان، شوێنکات(الزمكان): ئەو بۆشایی و فەزایەیە، کە چوار رەهەندی هەیە، خاڵ و پنتەکان تیایدا بریتیە لە رووداوەکان.

---

١ الموسوعة الفلسفية- باشراف رؤزنتال- ترجمة سمير كرم- بيروت ١٩٨١- ل ٢٣٥-٢٣٦

٢ الموسوعة الفلسفية- باشراف رؤزنتال- ترجمة سمير كرم- بيروت ١٩٨١- ل -٢٣٦

٣ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر — ل ٧٤

٤ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر — ل ٧٤

رەنگە زۆربەمان وا بڕوانینە زەمەن وەك ئەوەی هیچ پەیوەندی بە (شوێن)ەوە نەبێت وجیاواز بێت، نابێت ئەوەش ببێتە جیگای سەرسورمان و پێویستە ئەوە بزانین کە شتە مایەکیەکان — درێژی و بەرزی و پانی- هەبێت، هەروەها شتەکان لە ماوە و کاتێکی دیاریکراوی زەمەندا هەن. کەواتە شتە مایەکیەکان، وەك- خەڵك، ئەستێرە، هەسارە، و شتی دیکە ڕەهەندی کۆتاییان هەیە لە شوێن، ڕەهەندی کۆتاییان هەیە لە زەمەندا، بۆیە شتێکی ئاساییە، کە زەمەن بە ڕەهەندی چوارەمی شتەکان دابنرێت، بۆیە دەبێ وا بڕوانینە زەمەن کە بریتیە لە ڕەهەندی چوارەم و خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە و سەربەخۆ و جیایە لە ڕەهەندەکانی دیکە.

زانای روسی "هێرمان منکۆفیسکی"یش پەیوەندی نێوان (زەمەن- شوێن) دەردەخات و دەڵێ: " شوێن لە خۆیدا و زەمەن لە خودی خۆیدا، لەناودەچن و فەنادەبن و دەبن بە سێبەر، بەڵام تەنها جۆرێك لە یەکگرتن لە نێوان ئەم دووانە دەمێنێتەوە"[1].

شوێن تەعبیر و گوزارشت لە دابەشبوونی ئەو شتانە دەکات کە لە خۆوە بوونیان هەیە، بەڵام زەمەن گوزراشت لە بەدوایەکهاتنی بوونی دیاردەکان دەکات، کە دیاردەیەك شوێنی دیاردەیەکی تر دەگرێتەوە. پێشکەوتنی زانیاری ئەو دید و بۆچوونە میتافیزیکیەی ڕەتکردەوە کە پێیوابوو زەمەن و شوێن بەشێوەیەکی سەربەخۆ هەن و جیانە لەیەکتر و پەیوەست نین بە کردارەکانی مادە، بۆ نمونە نیوتن بڕوای وابوو کە زەمەن و شوێن لەیەکتری جیان و سەربەخۆن، ئەنیشتاین لە تیۆری ڕێژەییدا جەختی لەوە کردوە کە زەمەن و شوێن بوونێکی سەربەخۆ و جیایان نییە، بەڵکو ئەوانە بەشێکن لەو پەیوەندیە پتەو تێکەڵ لەگەڵ مادە، بۆیە سەربەخۆیی خۆیان لەدەستداوە ووەك دوو لایەنی ڕێژەیی دەردەکەون. زانیاری فیزیك جەخت لەوە دەکاتەوە کە ڕژان و دەرپەڕینی زەمەن و ڕێژبوونەوەی جەستە بەند و پەیوەستە بە خێرایی جەستە[2]. پێویستە ئەوە لەبیرنەکەین کە زەمەن لە فیزیادا، بریتیە لە لاساییکردنەوەی سروشت و نموونەیەکە بۆ ئەو سروشتە و (زەمەن- شوێن) لەوەوە دەچوون و هاتوونەتەکایەوە، بۆیە (زەمەن- شوێن) دوو توخمی سەرەکین لە هاوکێشەی فیزیاویدا[3]. هەروەها بە گوێرەی تیۆری

---

١ فكرة الزمن عبر التاريخ — ل ١٩٦

٢ الموسوعة الفلسفية- ل -٢٣٦

٣ ماهو الكون- ل ٩٥

ڕێژەیی درێژبوونەوەی زەمەن زیاد دەکات و فراوان ئەبێت، ئەگەر خێرایی سەرچاوە بارستەکە گەورەتر بێت[1]. زەمەن لەو تیۆرەدا وادەردەکەوێت کە سروشتێکی زاتی هەیە. تێڕوانینی (تیۆری ڕێژەیی) و (تیۆری کوانتی) سەبارەت بە بابەتی زەمەن لێکتر جیاوازن، زەمەن بە گوێرەی ڕێبازی کوانتی بریتیە لە شەپۆلێکی رەها کە لە ئەزەلەوە درێژدەبێتەوە بۆ ئەبەد. لە تیۆری ڕێژەییدا دەکرێ دەرك بە رابردوو و داهاتوو بکرێت، هەروەها بە گوێرەی تیۆری ڕێژەیی گشتی، زەمەن لە تەك (جوار) بارتایی گەورەدا خاوە، واتە کاتێك لە تەك رۆژدا بین زەمەن خاوترە بە چەند ڕێژەیەك وەك لە تەك زەوی[2].

زەمەن گەلێك کارایە بە تایبەت کاتێك کە دەبێتە هۆکاری گەوهەری و سەرەکی فیعل وکار، ئەگەر کاری زەمەنی لە خۆیدا دیاردەیەك بێت، ئەوا ئێمە نازانیین بۆچی شێوەکان بەرگری دەکەن لە روبەرووبونەوەی لادان و شێواندنەکان. لە واقیعدا فۆرم و هۆکاری دەبن بەیەك و خۆیان بەسەر (زەمەن- شوێن)دا دەسەپێنن و کاتێك زەمەن و شوێن تێدەپەڕن، ئەوا هۆکاری ناوەرۆکی هەردوکیان پێکدەهێنێت و شێوەیان دەگۆڕێت[3].

شبنگلەر پێیوایە کە زەمەنە وشوێن دووشتی لێکدژن، شوێن شایستەی تێگەیشتنە بەڵام زەمەن شایستەی تێگەیشتن نییە، بۆیە هەر وێناکردنێکی زەمەن بە شێوەیەکی زانستی هیچ ناگەیەنێت گە لە تێکدانی تێگەیشتنی سروشتی زەمەن نەبێت، زەمەن پێچەوانە و دژی شوێنە و دوور لە شوێن گەشە دەکات، لێرەدا دەرئەکەوێت کە شبنگلەر پێیوایە زەمەن و شوێن لێکدژن، بە پێچەوانەی زۆرێك لە فەیلەسوف و زانایان، وەك کانت و مینکۆفسکی، ئەمەی دواییان پێیوایە لێکجیاکردنەوەی زەمەن وشوێن تەنها وەهمە[4]. بەدەر لەوە شبنگلەر شتە زیندوەکان دەداتە پاڵ زەمەن و هەرچی شتە مردووەکانیشە دەیداتە پاڵ شوێن، هەروەها پێیوایە شوێن لەدایکبووی زەمەنە، بەڵام هۆی مردنی زەمەن شوێنە. ئەگەر بە وەردی لە بۆچوونی شبنگلەر بڕوانیین، دەبینین شوێن بریتیە لە زەمەنێکی لەبەریەك هەڵوەشاوە، کاتێك کە تێپەڕبووە و تایبەتمەندێتی زەمەنی لەدەستداوە کە زیندوێتیە، واتە زەمەن بە جۆرێك

---

١ ماهو الكون- ل ٩١

٢ ماهو الكون- ل ١٠٩

٣ جدلية الزمن- ل ٧٧

٤ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل ٨٢

دەردەکەوێك کە شێوە و فۆرمی پەیبردنە، واتە ئەو ڕێگایەیە بە هۆیەوە شتەکان دەدۆزرێنەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە شوێن کوژەری زەمەنە، چونکە هەر کاتێکی زیندووخرایە پانتایی شوێن و بۆشاییەوە دەمرێت، چەنکە شوێن مردوە و مرێنەرە، بە پێچەوانەی زەمەن کە زیندوە و سەر بە ژیانە[1].

پێشتر باوەڕ وابوو کە زەمەن جیاوازە لەگەڵ بۆشایی ئاسمان (فەزا)، بەڵام پێویستە ئەم دید و بۆچوونە سەبارەت بە بۆشایی و زەمەن بگۆڕین. لە ساڵی (١٩٠٥) دا زانای گەورە "ئەلبرت ئەنیشتاین" رایگەیاند: (بیرۆکەی "الاپیر" گرنگ و پێویست نییە، بە مەرجێك مرۆڤ بتوانێت- بیەوێت- واز لە بیرۆکەی زەمەنی رەها بێنێت[2].

ئەنیشتاین، سەبارەت بە (زەمەن) دەڵێ: (فەیلەسوفان وا لە زەمەن گەیشتوون کەوا کۆمەڵە سات و چرکەیە کە پێیان تێپەڕ دەبن، بەڵام لەوە نەگەیشتون کە چۆن "زەمەن" دەست پێدەکات و چۆن بە کۆتا دێ) ئەوەی جێگای سەرنجە لە (تیۆری رێژەیی) شێواز و رێگایەکەیەتی کە بیرو هزری ئێمەی سەبارەت بە (بۆشایی و زەمەن) لە رەگەوە گۆڕی، بە کورتی ئەم تیۆرە کۆتایی بە بیرۆکەی (زەمەنی رەها) هێنا[3] . ئەم تیۆرەی ئەنیشتاین ناچاری کردین، دید و بۆچوونمان سەبارەت بە مێژوو و زەمەن بگۆڕین و دەبێ قەناعەت بکەین بەو بیرۆکەیەی کە زەمەن جیاواز و سەربەخۆ نییە لە (شوێن) بەڵکو زەمەن لەگەڵ شوێن یەکیگرتووە و هەردووکیان پێکەوە (زەمەن- شوێن) پێکدەهێنن[4]. رووداو یان داهات (الحادپە) لە فیزیادا بەوە پێناسە دەکرێت، بریتیە لەو شتەی کە لە (پنت) ێکدا روودەدات لە زەمەن و شوێنێکی دیاریکراودا، بۆیە دەتوانین شوێنی ئەم رووداوە دیاربکەین بە دەلالەتکردنی چوار رەهەندی داهاتەکە و هەڵبژاردنی رووداوەکان لێرەدا بە شێوەیەکی هەرەمەکی دەبێت کە مرۆڤ بتوانێت هەر سێ رەهەندی شوێنی ناسراو وپێوەرێك بۆ زەمەن بەکاربهێنێت، بە گوێرەی

---

١ فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- ل ٨٣

٢ موجز تاريخ الزمن- تاليف، ستيفن هوكنغ- ل ٤٤

٣ موجز تاريخ الزمن- تاليف، ستيفن هوكنغ- ل٤٦

٤ هەمان سەرچاوە - ل٤٨

(تیۆری ڕێژەیی) هیچ جیاوازیەکی ڕاستەقینە لە نێوان داهاتەکانی زەمەن و شوێن دا نییە، هەر وەك چۆن هیچ جیاوازیەك لە نێوان داهاتەکانی دوو شوێن دا نییە[1].

لە ساڵی (١٩١٥) دا ئەنیشتاین بیرۆکەیەکی سەرنج ڕاکێشی خستەڕوو، ئەویش ئەوەیە کە کێشکردنی زەوی هێزێك نییە، وەك هێزەکانی دیکە، بەڵکو ئەم کێشکردنە ئاکانی ئەو ڕاستیەیە کە (زەمەن و شوێن) پێچاوپێچە بە هۆی دابەشبوونی قەبارە وزە لە ناویدا، قەبارەی خۆر کاردەکات بۆ خوارکردن و پێچاوپێچکردنی زەمەن وشوێن، ئەمەش وادەکات کە زەوی لەبەرچاوی ئێمە وەك ئەوەبێت کە بە بە درێژایی ڕێرەوێکی بازنەیی گوزەرئەکات و دەجولێت لە شوێنێکی سێ ڕەهەندیدا، کەچی لە ڕاستیدا ڕێڕەوەکەی زەوی ڕاستەهێلیە لە (زەمەن وشوێن) دا، و چوار ڕەهەندیە[2].

لەتیۆری ڕێژەییدا، زەمەنی ڕەها بوونی نییە، بەڵکو هەرکەسێك پێوەری تایبەتی خۆی هەیە، کە پەیوەستە بە شوێنی کەسەکە و بە شێوازی جووڵەی کەسەکە، بە گوێرەی ئەم تیۆرە کاتی ڕەها بە هیچ جۆرێك لە ئارادا نییە، بەڵکو لە سیستەمێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت بە پێی ئەو خێراییەی کە تەنە جولاوەکە یاان سیستەمەکە پێی دەجولێتەوە، بە گوێرەی ئەمە کات لە خێراییە گەورەکان خاودەبێتەوە و لە خێراییە بچووکەکان درێژە دەکێشێت، بەڵام ئەگەر خێرایی تەنە جولاوەکە یەکسان بێت بە خێرایی روناکی ئەوا کات و زەمەن نامێنێ (انعدام) دەکات!! بە گوێرەی ئەو کەسانەی کە بە خێراییەکی زۆر گەورە دەجولێنەوە، بە جۆرێ ئەوان جولانەوەی ئێمە بە خاوی دەبینن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە با ئەم نمونەیە ڕەچاوبکەین:

گریمان دوو کەس یەکەمیان لە سەر زەوی بە خێراییەکی ئاسایی نەگۆڕ دەجولێتەوە، چاودێری کەشتیەکی ئاسمانی دەکات کە بە خێراییەکی گەورە دەجولێتەوە (بە گوێرەی چاودێرەکەی سەر زەوی) وا دابنێ کە لەناو کەشتیەکە کاتژمێرێکی دیوار هەڵواسراوە، کەسی یەکەم بە تەلسکۆپ یا هەر ئامێرێك بینایی چاودێریی جولانەوەی میلی کاتژمێرێکە دەکات، بۆ ئەو میلی کاتژمێرێکە لە (١٢) وە ببێتە (١) واتە یەك سەعا تێپەڕی، ئەوا بەلای کەمەوە کەسی یەکەم پێویستی بە زیاتر لە سەعاتێك هەیە (بە سەعاتی خۆی) بۆ ئەوەی ئەم ڕووداوە چاودێر بکات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خێراییە گەورەکەی کەشتی یە ئاسمانیەکە، تاکو خێرایی

---

١ هەمان سەرچاوە - - ل ٤٩

٢ موجز تاريخ الزمن- تاليف، ستيفن هوكنغ- ل ٥٩

کەشتیەکە زیاتر بێت، چاودێرەکەی سەر زەوی کاتی زۆرتری دەوێتبۆ چاودێرکردنی هەر رووداوێك لە ناو کەشتیەکە[1]. تا پێش ساڵی ١٩١٥ باوەڕ وابوو کە (زەمەن و شوێن) هەردوکیان چەسپاو و جێگیرن، کە رووداوەکان تیایدا روودەدەن، بەڵام شتەکان کاریگەریان بەسەریانەوە نابێت، ئەم باوەرو هزرە لە نیگای (تیۆری رێژەیی تایبەت) راست بوو،کە باوەڕ وابوو تەنەکان دەجولێن و یەکتری کێش دەکەن، بەڵام زەمەن و شوێن گوزەردەکەن و رێرەوی خۆیان دەگرنە بەر و شتەکان کارین لیّ ناکات[2]. ئەنیشتاین لە تیۆری رێژەییدا، جەختی لەوە کردەوە کە زەمەن و شوێن بونێکی جیاو سەربەخۆیان نییە کە پەیوەست نەبن بە (مادە)وە، بەڵکو ئەوانە بەشێکن لەو پەیوەندیە تێکەڵاو لەگەڵ مادە، بۆیە سەربەخۆیی خۆیان لەدەست دەدەن و وەك دوو لایەنی رێژەیی دەردەکەون. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاسانتر و وردتر لەبیرۆکەی (زەمەن و شوێن) بگەین، پێویستە سەرن بدەینە ئەم نموونەی خوارەوە، دەتوانین بڵێین سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆی و خۆردا، پشت گوێ بخەین بۆ کاتێك ئەو کات زەوی لە حاڵەتی وەستاودا بێت و شەمەندەفەرێك بە خێرایی٩٠ میل لە سەعاتێکدا بەرو باکور بڕوات، یان شەمەندەفەرەکە با وەستاو بێت و زەوی بە خێرایی ٩٠ میل لە سەعاتێکدا بەرو باشور بجولێت، ئا لەو کاتەدا تاقیکردنەوە لەسەر (تەنە) جولاوەکانی ناو شەمەندەفەرەکەدا بکەین، دەردەکەوێت کەیاساکانی نیوتن راستن و دەکرێ شیکردنەوە لەسەر تەنە جولاوەکان بکرێ بە پێی ئەم یاسایە، ئەگەر هاتوو کەسێك لە ناو شەمەندەفەرەکە یاری تۆپی سەر مێزی کرد، درك بەوە دەکرێ کە تۆپەکە ملکەچی یاساکانی نیوتن دەبێت، ئەگەر کەسەکە لە دەرەوەی شەمەندەفەرەکە بێت، یاری بکات ئەوا بە هەمان شێوە ملکەچی یاساکانی نیوتن دەبێتەوە، کەواتە رێگەیەك نییە، بزانین کامیان دەجولێن، شەمەندەفەر یان زەوی؟[3]

لەبەر نەبوونی پێوەرێکی رەها بۆ حاڵەتی جێگیر و وەستاو، زەحمەتە بتوانرێ بڕیار بدرێ لە سەر دوو رووداوەکە کە داهات لە دوو کاتی جیاوازدا و لە یەك شوێن دا روویانداوە، گریمان ئەو تۆپەی سەر مێزەکە لە ناو شەمەندەفەرەکەدا هەڵدە بەزێتەوە بۆ سەرەوە و دادەبەزێتە خوارەوە لە یەك خاڵدا دوو جار بەر مێزەکە دەکەوێت لە یەك (چرکە)دا، ئەو مەسافەیەی کە

---

١ (رۆشنبیری نویّ- ژ-١١٦- ١٩٨٨- ل ١١١

٢ موجز تاريخ الزمن- تاليف، ستيفن هوكنغ — ل٦٧

٣ رۆشنبیری نویّ- ژ-١١٦- ١٩٨٨- ل ١١٢

تۆپەکە لەو چرکەیەدا بەرزبۆتەوە و هاتۆتە خوارەوە و بە مێزەکە کەوتوە، یەکسانە لەگەڵ مەسافەی ٤٠ مەتر نزیکەی لەگەڵ ئەو کەسەی لە دەرەوە لەسەر سکەکە وەستاوە، چونکە شەمەندەفەرەکە لەو چرکەیەدا ٤٠ مەتری بریوە، کەواتە ئامادەنەبوی وەستاو رەهایە. مانای ئەوەیە ناکرێ و لە توانادا نییە، شوێنی رەها بۆ هەر رووداوێك لە گەردون دیاری بکرێ.

## زەمەنی رەها و شوێنی رەها:

زەمەنی رەهای راستەقینە، ئەو زەمەنیە کە لە خۆیەوە دەرژێت و هەڵدەقولێت، بە بێ ئەوەی پەیوەندی بە هۆکارێکی دەرەکیەوە هەبێت، هەندێك جار پێی دەوترێت دەیمومە. لە ئەزمونی ژیانی رۆژانەماندا هەست بە رۆیشتنی زەمەن بۆ پێشەوە دەکەین و بەباشی ئەمە دەردەکەوێت. نیۆتنی فەیلەسوف سەبارەت بە زەمەنی رەها بروای وایە کە، دەکرێ هەموو جوولەکان خێرابکرێن یان هێواش بکرێن، بەڵام گەڕانەوەی زەمەنی رەها قابیلی گۆڕان نییە، و ماوەی بونی شتەکان و بەردەوامیان وەك خۆی دەمێنێتەوە" بە واتایەکی دیکە، دۆخی جوولەی تەن یا لەشێك کاریگەری نییە لەسەر خێرایی زەمەن. کەواتە زەمەنی رەها لە میانی گەردوندا بە خێرایەکی بە دوای یەکەوەبوون دەردەچێت، و گشت راسد و چاودێرەکان لەهەر کوێیەك بن و چ بززتنەوەیەکیان هەبێت، کۆکن لەسەر ئەو کاتانەی رووداوەکان تیایدا روودەدەن، هەروەها لەسەر خێرایی دەرچونی زەمەن، ئەمەش رێك دێتەوە لەگەڵ روانینی رۆژانەمان بۆ جیهان[١].

نیوتن پێیوایە کە وەك چۆن زەمەنی رەها هەیە، بە هەمان شێوە شوێنی رەهاش هەیە، و شوێنی رەها بە گوێرەی سروشتەکەی و بە بێ ئەوەی پەیوەندی بە شتێکی دەرەکیەوە هەبێت، هاوتایە لەگەڵ نەجوولان، ئەم دوو بیرۆکەیەی نیوتن سەبارەت بە زەمەنی رەها و شوێنی رەها، جێگای قبوڵکردبووە لەلایەن خەڵکەوەو وەك دوو دیاردەی سەرەکی گەردون تا پەیدابوونی تیۆری رێژەیی لە سەرەتای سەردەی بیستەم[٢].

---

١ فکرة الزمن عبر التاریخ –ل ١٥٨

٢ فکرة الزمن عبر التاریخ – ل ١٦٠

## باسی دووەم: زەمەن و گەردوون:

لە کۆسمۆلۆژیای ئایینیدا زەمەن وەستاوە و بوون بۆ یەکجار و هەتا هەتایە لەلایەن خوداوە دروستکراوە، سەرەتا و کۆتایی و ئاراستەکانیش هەموویان پیشوەخت دەستنیشانکراون.

پێویستە ئەوە بزانیین کە دووبارە بوونەوە (التكرار) خاسیەتێکی سەرەکی گەردوونە، ئایا زۆربون و زیادبوون شێوازێك نییە لە شێوازەکانی دووبارە بونەو. شتی لە گەردوندا گرنگ بێت بۆ ئێمە ئەوەیە کە بوونمان هەیە و حەزیش دەکەین لەم بونەدا بەردەوام بین. ڕەنگە مرۆڤ ئەو پرسیارەی لەخۆی کردبێت، ئایا زەمەن چییە؟ ئایا زەمەن و گەردون پێکەوە پەیدابوو و هاتوونەتەکایەوە، ئایا زەمەن لەگەڵ تەقینەوە گەورەکە دەستی پێکردوە. ڕەنگە زەمەن سیستەم و ڕێبازی سروشت و گەردون بێت بۆ ئەوەی هەموو شتەکان پێکەوە روونەدەن.

لەم بارەیەوە، زانا وفەلەکناسی بەریتانی (ستیڤن هۆکنگ) دەڵێ: " سەرەتای زەمەن لە تەقینەوە گەورەکە (big bang) دەستپێدەکات و ئەو کاتە کۆتایی پێدێت، کە ئەستێرەکان یان مەجەڕەکان بە هۆی کاریگەری کێشکردن و جازبیە بچووك دەبنەوە دەچنە باریەك و تۆنێڵە رەشەکان (black hole) پێکدێنن، بەڵام زانا فیزیایەکان حەز لە دید و بیرۆکەی سەرەتا و کۆتایی زەمەن ناکەن[1] .

هەروەها ئەنیشتاین سەبارەت بە پەیوەندی نێوان (زەمەن و گەردون) پێیوایە، کە گەردوون ستاتیکی و نەبزۆزە و زەمەن نایگۆڕێت (لايتغير بالزمان)، واتە ناکشێت و ناچێتەوە ناویەك (لایتقلص) واتە بە گوێرەی بروای ئەنیشتیان، زەمەن لە رابردووی بێ کۆتایی دەست پێدەکات بەرەو داهاتووی بێ کۆتای دەڕوات، بەڵام ئاراستەکانی (شوێن) تیایدا سنووردار و داخراوە وەك رووی زەوی[2] . واتە ئەو گەردوونەی ئەنیشتاین، وێنای کردوە هاوشێوەی گەردوونی ئێمە نییە، چونکە گەردوون لای ئەو ناکشێت.

---

١ الكون في قشرة الجوز- ل ٤٥

٢ الكون في قشرة الجوز- ل١٤١

ئەوەی ئاشکرایە کە سەرەتای زەمەن لەگەڵ بوونی گەردووندا دەستپێدەکات، سەرەتای بوونی هەموو بوونەکان ناکەوێتە پێش سەتای بوونی زەمەنەوە. کۆن ئەو شتەیە کە ئەوسەری بوونی دیارنەبێ، بەرامبەر بە کۆن نوێ هەیە کە وشەی (داهات) مان بۆ بەکارهێناوە کە مەبەست لە (حادپ)ی عەرەبیە. هەر نەبونێك کە بوون پێشی نەکەوتبێ کۆنە، هەروەها کۆنی حەقیقەتی: ئەوەیە کە بونەکەی لەخودی خۆیدا هیچ شتی پێشی نەکەوتبێ، واتە بونەکەی لە هەموو حاڵەتێکدا پێویستی بە هیچ شتێکی تر نەبێ، کۆنیش بەم مانایە دەبێتە زەرووروەت.

کۆنی زەمەنی: ئەوەیە کە سەرەتای بوونی زەمەنی دیارنەبێ، مەبەست ئەوەیە زەمەن لە بوونی ئەودا دیارنەبێ[1]. ئەبو عەلی سینا لە کتێبی (النجات) بەم جۆرە پێناسەی کۆن و نوێ دەکات: کۆنی شت یان بە گوێرەی خودە یان بە گوێرەی زەمەنە، واتە کۆن بە پێی خود ئەوەیە کە بەنەمایەکی سەرەتایی بۆ بوونەکەی نەبێ. کۆن بە پێی زەمەن ئەوەیە کە سەرەتای زەمەنی دیارنەبێ.

بە کورتی: مەبەست لە کۆندا ئەوەی کە نەبوون پێشی نەکەوتبێ، مەبەست لە داهاتیش ئەوەیە نەبوون پێشی کەوتبێ، واتە یەکەمیان کۆنی خودیە، دوەمیان کۆنی زەمەنییە. ئەو شتانەش کە بکەونە بەر کۆنی زەمەنیەوە، فەیلەسوفانکان پێناسەکەی بەکارێکی سەرلەبەری هەموو شتێکی هەرامی دەزانن ئیدی ئەو هەرامە چ ئەبستراك بێ چ چەرخەکانی گەردوون بێ یان شتی تر، کەچی زانایانی کەلام دەڵێن: ئەوەی پێناسەی کۆنە زەمەنی بیگرێتەوەتەنیا سیفەتەکانی خوایە و هیچی تر[2].

زانای گەورە "ئەنیشتاین" سەبارەت ئەم بابەتە دەڵێ: (گەردوون هەروەك تێگەیشتووین، سێ رەهەند و دوورایی هەیە، درێژی- پانی- بەرزی، ئەمەش ئەمەش لە ئەنجامی هزرە نەرێتیەکاندا سەری هەڵداوە، بەڵام بە بڕوای من، گەردون چوار دوورایی هەیە، کە دوورایی چوارەمی گەردوون (زەمەن)نە[3]. کەواتە بە بڕوای ئەم زانایە زەمەن دوورایی چوارەمی

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت)- ل١٨٩

٢ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت)- ل ١٩١

٣ فەرهەنگی کات — ل١٠

پێکهاتەی گەردونە، بۆیە گەر ئەم دووراییە فەرامۆش بکەین، ئەوا ناتوانیین لە گەردوون بگەین و لێکی بدەینەوە و توێژینەوەی سەبارەت بکەین.

زەرورەتی پێشکەوتنی زەمەن لەسەر داهات: پێشکەوتن و پاشکەوتنی بوون و نەبوونی داهات هۆکەی زەمەنە، پێشکەوتنی بەشێ لە زەمەن بەر لە پێشی بەشی تریەتی، وەك پێشکەوتنی دوێنێ لەسەر ئەمڕۆ. ئەگەر پێشکەوتن و پاشکەوتن لە بووندا کۆبوونەوە، ئەوە زەمەن ئەو بڕیارەی داوە پێشکەوتنی زەمەنی جاری وا دەبێ بە نەبوونە نەك بوون[1]. پێشکەوتنی زەمەنی بەو مانایەی سەرەوە گشت بەشەکانی زەمەن دەگرێتەوە. کەواتە یەك لەدوایەکی داهات و و پێشکەوتنی نەبوون لەسەر بوون بە بێ زەمەن وێناناکرێ، بۆ ئەوەی دەرکەوێ داهات بە بێ پێشکەوتنی زەمەن وێناناکرێ دوو بەڵگە هەیە: یەکەم، داهاتی شت واتە پەیدابوونی شتێ دوای پەیدانەبوونی خۆ، چونکە پێشکەوتە و پاشکەوتە پێکەوە کۆنابنەوە، ئەمەش بە زەمەنەوەیە، بۆیە یەکێکیان پێشکەوتەیە و ئەویتریان پاشکەوتە. دووەم: داهات ئەگەر نەبوون پێشی نەکەوتبێ مانا نادات، دیارە پێشکەوتنی نەبوون لەسەر بونی شت بە زەمەندا دەزانرێ[2]. کەواتە لێرەدا زەمەن دەکەوێتە نێوان شتێکی لە پێش و شتێکی لەپاش.

### - زەمەن و جووڵە و گەردوون:

ئەگەر زەمەن میقداری جووڵە بێ دەبێ شتە نەجوولاوەکان لە زەمەن بەدەر بن، ئەگەر وەهابێ دەبێ زەمەن گۆڕدراوێکی نافراوان بێ چونکە، گۆردراو بێ و میقداری زەمەن دەبێ زەمەن و بەشەکانی هەر لە گۆڕاندابن کەچی شتی سابیت و نەگۆڕ نەگرێتەوە، گۆڕانیش پاش و پێش بۆ شتی گۆڕدراو دروستدەکات، ئەواتا جووڵە لە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەیدا هەیە، هەروەهاش شتی راوەستا و وەکو ئاسمان و ئەوەی جێگیر و سابیتە و ئەوی زەرووری و ئەبستراکتە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی هەیە، بەوە دەردەکەوێت کە زەمەن میقداری بون نییە، ئەگەر وەها بوایە، دەبوو شتە سابیتەکان نەگەرێتەوە، کەچی سابیت لە بوونە وبوونیش لە گۆڕاندایە[3]. ئەگەر زەمەن میقداری جووڵەی فەلەك بێ دەبوو ئەو کات وێناکردنی جولە بەبێ

---

١ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت)- ل ١٩٩

٢ زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت)- ل ١٩٨

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٢٦٠

فەلەك مەحاڵ بوایە، کەچی وانییە، ئەوەتا هەموومان هەست دەکەین لێشاوێکی جووڵە لە گەردووندا هەیە و لێشاوەکە پێش و پاش و رابردوو ورانەبردووی تیا جەمە، تەنانەت ئەگەر وێنای کات بکەین بێ لەوەی فەلەك لە هۆشماندا بێ ئەو هەر هەیە، یان ئەگەر وێناشی بکەین کە وەستاوە، گەردون هەر لە جووڵەی خۆی ناکەوێ [1]. هیراکلیتس پێیوایە کە راستیەکی سەرەکی هەیە، کۆنترۆڵی زەمەنی دەوری دەکات و رۆژ و مانگ و ساڵەکان بە خولێکی هاوشێوە هەمیشە دەگێڕێتەوە. بوون لە جەرەیانی هەمیشەیی گەردووندا بەردەوام قابیلی دابران نییە، زەمەن بابەتی شتەکان دەگۆڕێت[2].

زانیاری ئەوەی سەلماندوە کە دەرپەڕین و رژانی زەمەن و کشان و درێژبوونەوەی تەنەکان، بەند و پەیوەستن بە خێرایی تەنەکە.

## زەمەن و جووڵە لە روانگەی ئەرستۆوە:

گریکەکان بەر لە ئەرستۆ پێناسەی جۆراو ۆریان بۆ چەمکی (زەمەن) کردبوو، وەك:

١- پەیوەستبونی زەمەن بە جووڵەوە.

٢- زەمەن ئەندازە واتە ژمارەی جووڵەیە نەك خودی جووڵە.

٣- زەمن هەرچەندە ئەندازە و پێوەری جووڵەیە، هاوکات ئەویش بە جووله پێوانە دەکرێت.

٤- ئەو جووڵەیەی کە پێوانەی پێ دەکرێت جووڵەی گشتی گەردوونە.

٥- زەمەن وەستاو نیە و بە دەرونی مرۆڤایەتیەوە نەبەستراوەتەوە، هەرچەندە بە دەرونێکی زیندووەوە کە دەرونێکی هەمەکی (کلی) بەستراوەتەوە[3].

(ئەرستۆ)ش بەستنەوەی زەمەن بە جووڵە دەستپێدەکات و دەڵێت: " زەمەن بە بێ جووڵە یان گۆڕان بە شێوەیەکی گشتی بونی نییە، بۆیە کاتێك ئێمە هەست بە گۆڕان یان جووڵە ناکەین، ئەوا هەست بە تێپەڕبوونی کات ناکەین، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە زەمەن جووڵەیە، لەبەر ئەوەی جووڵە یان گۆڕانی شتێك، ئەو بەتەنها لە خودی ئەو شتەدایە یان شتەکە لە شوێنێکدا جووڵاو یان گۆڕاو دەبێت، ئەمە لە کاتێکدا زەمەن لە هەموو شوێن و

---

١ هەمان سەرچاوە – ل ٢٦١

٢ ( مێژووی فەلسەفە-ئیمیل بریهیە- وەرگێران – ئاوات محمد- بەرگی یەکەم – سلێمانی ٢٠٠٧ – ل١٠٠

٣ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣ – ل١٤٦

هەموو شتێکدا هەیە، بە گوزارشتێکی دیکە زەمەن بۆ جووڵە هەندەکیەکان(الجزئی) ملکەچ ناکات، بەڵکو ئەو گشتیە، بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کە هەموو گۆڕانێك خێرا یان هێواشە، بەڵام زەمەن بەو شێوەیە نییە، لەبەر ئەوەی خاوی و خێرایی (زەمەن) دیاریان دەکات: خێرا ئەوەیە لە کاتی کەمدا زۆر دەجووڵێت. بەڵام زەمەن بە زەمەن دیارینا‌کرێت[1].

وشەی (جووڵە) لای ئەرستۆ ئاماژەیە بۆ گۆڕینی باری خودی بونەکان، واتە گواستنەوە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، جوولەی شوێنی، بۆ نمونە مانای بڕینی شوێنێکی دیاریکراو نییە لە زەمەنێکی دیاریکراودا[2]. هەروەها پێیوایە کە هەموو جووڵەیەك دیاریکراوە لە نێوان باری یەکەم و باری کۆتاییدا، بەرەو ساکنبوون دەچێت. ئەرستۆ پێیوایە کە هەموو جووڵەیەك خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندی هاوبەشە، هەموویان دەچنەوە دەروازەی ناکۆتاییە و بریتیە لە پەیوەندی بوون لە شوێن و زەمەندا، لەوانەیە لە فەزاو بەتاڵیشدا، ئایا ئەمە جۆرێك نییە لە نێوەندی پێکەوە بەستراو، لە زەمەن و شوێن و فەزا. بەرای ئەرستۆ ناکۆتا و زەمەن و شوێن و بەتاڵی پێکەوە لکاوە، لێشاوێکە لە بەرهەڵستکاری. تیۆریەکی ئەفلاتون هەیە دەربارەی زەمەن بەو سیفەتەی وێنەیەکی هەتاهەتاییە، بە مەبەستی دورخستنەوەیەکی زۆرەملێیانەیە بۆ گەوهەری حەقیقی هەموو شتە زەمەنیەکان، هەروەها تیۆرێك سەبارەت بە پەیوەنیگرتن هەبووە، دەمانبات بۆ ئەوەی گەردوون تەنها یەك جووڵەیە[3]

زەمەن بۆ ناکۆتا لە رابردوودا درێژدەبێتەوە، هەروەها لە ئایندەدا.

ئەگەر زەمەن لە جەوهەردا بریتی بێت لە یەك بەدوای یەکی رۆژ و شەو، بە شێوەیەکی گشتی لە گەڵ تافیدا لەگەڵ ئاسمان، ئەم وتەیە بنەمای تێڕوانینی رۆشن سەبارەت بە زەمەن دادەمەزرێنێت، لە هەمان کاتدا وێنە دروستبوونی گەردوونی کۆن دەخاتە لاوە، هەروەها لە زەمەنی سەرەتای بەر لە گەردون شاراوەیە، سەبارەت بە زەمەن، ئەرستۆ بڕوای وایە، زەمەن پەیوەستە بە جووڵەوە، ئەو شتێکە لە تایبەتمەندیەکانی جووله،

ئەفلاتوون باوەڕی وابوو کە زەمەن پەیوەستە بە جولەی تەنها ئاسمانەوە، بەڵام رووپۆشکردنی زەمەن بە رۆژ، بە هەموو دووهێندو دابەشکردنەکانی، مانای تێکەڵکردنی نێوان

---

١ گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣ — ل١٤٦

٢ مێژووی فەلسەفە-ئیمیل بریهیە — ل٣٣٧

٣ مێژووی فەلسەفە-ئیمیل بریهیە — ل ٣٤٣

زەمەن و یەکەی پێوانەیە کە پێی دەپێوین، واتە والە زەمەن دەکەین ببێتە ژمارە، ئەو ژمارەیەی زەمەنی پیٚ بژمێرین، ئەو ژمارەیەش بەراستی پەیوەستە بە جووڵەی ئاسمانیەوە، بەڵام زەمەن لە راستیدا ئەو شتەیە دەیژمێرین، لە هەموو جوولەیەکدا بوونی هەیە، لەبەرئەوەی هەموو جووڵەیەك ماوەی خۆی هەیە، بریتیە لە (ژمارەی جولەکان بە پێی پێشکەوتوو و دواکەوتوو) واتە ئەوەی دەتوانیین لە ساتێکی دیاریکراودا، ئەو ئەمێستا بریتیە لە ئێستا، بریتیە لە کۆتایی رابردوو، سەرەتای ئایندە، ئێمە بە هۆی خولەکانی فەلەکەکانی ئاسمانەوە ئەژماری دەکەین[1].

جوولەی بازنەیی بریتیە لە تاکە جوولًە، لە هەمان کاتدا سادەو تەواوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر جوولەی رێك و راست ئاراستەیەکی سادەی هەبێت، بۆ خوارەوە بۆ نموونە ئەوا تەواو نییە، ئەویش لەبەرئەوەی بە پێچەوانەوەن، هەروەها جوولەکەش بە ئاراستەی پێچەوانەیە. بەوەی زەمەن بریتیە لە ماوەی جوولە، زەمەنیش سەرەتای نییە، واتە ئەو نەبوونە، لەبەر ئەوەی دەتوانیین سەبارەت بەو بلێین بۆ جوولە لە پێشە، کەواتە هەموو کاتێکی ئێستا ناکرێت بونی هەبێت، تەنها بەو سیفەتەی ئاستێکە لە نێوان رابردوو هەروەها ئێستا، جوولەی بازنەیی ئاسمانی کەواتە جووڵەیەکی هەمیشەیی و پێویستە، نەسەرەتای هەیە و نەکۆتایی[2].

- **تیری زەمەن:**

زەمەن وەك بابەتێکی بینراو، ئاراستەی هەیە و هەرگیز بۆ دواوە ناگەڕێتەوە، هەموو بونەوەرەکان و هەموو شتەکان، جگە لە تەنەئاسمانیەکان لە پێش چاوماندا بەرەو نەمان و فەنابوون دەچن و هیچیان ناگەڕێنەوە.

بۆ وێناندنی بابەتێکی سابت و جێگیر، زەمەنێکی بازنەیی، پێویستە پەنابەین بۆ نەبینراو، واتە ئەگەر زەمەنی بینراو ئەو زەمەنەبێت کە لە پەیدابوون یان لە دایکبوون دەڕوات بەرەو مردن، لە دەرکەوتن بۆ بزربوون، لە خەڵقەوە بەرەو فەنابوون، کە تەنها تەنە ئاسمانیەکان لەم رێسا و بنەمایە دەرباز دەبن[1]. کەواتە چۆن دەکریٚ، زەمەن وەك شیاو و شتێکی مەعقول،

---

١ مێژووی فەلسەفە- ئیمیل بریهیە — ل ٣٥١

٢ مێژووی فەلسەفە- ئیمیل بریهیە — ل ٣٥٨

١ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٤٩٥

تیرێك بێت یەك ئاراستەی هەبێت، لەگەڵ ئەوەی كە تایبەتمەندی و خەسڵەتەكانی زەمەن جیاواز و چۆنیەك نین؟ ئەمە یەكێكە لەو پرسیارانەی كە بۆتە مایەی كێشە و ململانێ لەم بوارەدا[1].

ئێمە لە بوون و ژیانی رۆژانەماندا ئاگاییمان هەیە كە زەمەن دەڕوات و بەسەر دەچێت، تەواو دەبێت و رەتدەبێت و ئاینده دەبێتە دەبێتە ئێستا و رووداوەكانی هەنوكە، دەبنە رابردوو. واتە بیرۆكەی داهاتوو و ئێستا و رابردوو، بە تەواوی دەخرێنە ژێر ئینتیباع و روانینمان لەمەڕ رۆیشتنی زەمەن، هەروەها جیاوازیەكی قوڵ لە نێوان داهاتوو و رابردوو هەیە، لەبەر ئەوەی ئێمە دەتوانیین رابردوو بەیادخۆمان بهێنینەوە، هەروەها دەتوانین پەیوەندی نێوان هۆ و هۆكار ببینین لە نێوان رووداوەكانی رابردوو و ئێستا، بەڵام ناتوانین داهاتوو بزانین، رەنگە پێشبینی مان بۆ داهاتوو هەبێت، بەڵام ناتوانین بڕیاری یەكلاكەرەوە سەبارەت بە رووداوەكانی داهاتوو دەربكەین، هەروەها ناتوانیین خەیاڵمان بۆ ئەوە بچێت كە رووداوەكانی داهاتوو كاریگەریان لەسەر ئێستا دەبێت، كەواتە وەك یەك نەبوون و ناهاوشێوەیی خاسیەتێكی زەمەنە[2].

ئەو بویەر و رووداوای لە گەردووندا روودەدەن هەموویان ئاماژە بەوە دەدەن كە زەمەن یەك ئاراستەی هەیە، بەڵام بۆچی زەمەن ناهاوشێوەیی پێوە دیارە، باشە چی روودەدات ئەگەر مرۆڤ بكەوتە ناو كونێكی رەشی خولاوە، چی شتێك حوكم لە سیستەمی زەمەنی دەركردنمان بۆ رووداوەكان دەكات؟ ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری دیكە سەبارەت بە زەمەن قیت دەبێتەوە.

گشت دیاردەكانی گەردوون ئەوەمان بۆ دەرئەخات كە تیری زەمەن ئاماژە بۆ یەك ئاراستە دەكات — ئاراستەی داهاتوو، و ئەم سروشتەی یەك ئاراستەی زەمەن بە زۆر شێوە وجۆر دەردەكەوێت، بۆ نموونە پەرسەندنی بایۆلۆژی بونەوەرەكان هەمیشە لە سادە و ساكاری بۆ ئاڵۆزتر گۆراوە و پەرەیسەندوە[3].

ئەو بویەر و رووداوانەی لە گەردووندا روودەدەن هەموویان ئاماژە بەوە دەدەن كە زەمەن یەك ئاراستەی هەیە، بەڵام بۆچی زەمەن ناهاوشێوەیی پێوە دیارە، باشە چی روودەدات ئەگەر مرۆڤ بكەوتە ناو كونێكی رەشی خولاوە، چی شتێك حوكم لە سیستەمی زەمەنی دەركردنمان بۆ

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٥٠٢

٢ فكرة الزمن عبر التاريخ)- ل ٢٣٦

٣ فكرة الزمن عبر التاريخ)- ل ٢٣٧

رووداوەکان دەکات؟ ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری دیکە سەبارەت بە زەمەن قیت دەبێتەوە[1].

پێناسەی (توبۆلۆجیای) زەمەن و دیاریکرنی ئاراستەکانی، دووشتی جیاوازن، ئەگەر چی سەربەخۆییەکی تەواویان نییە، ئەگەر زەمەنی هەرەمەکی بەوەناسرابێت کە راستەهێلە، ئەوا ئاراستەکانی بۆیەك جار دیاریکراوە و هەتاهەتاییێ[2].

ئەوا (توبۆلۆجیای) زەمەن بە هۆی هێلّی زەمەنەوە دیاریدەکرێت، بەلاّم لە (توبۆلۆجیای) خولی(الدوریە) گریمانەی ئەوە دەکەین کە ئاراستەی زەمەن جێگیرنییە، بەلّکو هەندێك خالّی تیادایە کە ز ەمەن تیایدا بەرزدەبێتەوە یان نزمدەبێتەوە.

دەشیێ وێنای (کرونۆزوفیا) بکرێت کە زەمەن تیایدا ئاراستەیەکی دیاریکراوی نییە، لەبەرئەوەی ئەو گۆڕانکاریانەی روودەدەن، لە دوای یەکدادێن، بە بیێ ئەوەی کۆبکرێنەوە سەریەکتر[3].

کەواتە زەمەن سەبارەت ئەم (کرونۆزوفیا)یە، دەبیێ خاوەنی توبۆلۆجیاییەکی رەسەن و ورد بێت، کە وەك ئەلقەکانی زنجیرەیەك یەك بەدوای یەکدادێن.

واتە (کرونۆزوفیا) چەمکی رەوتی زەمەن رەتدەکاتەوە، نەك لەبەر ئەوەی زەمەن کورتدەکاتەوە بۆ بە دوایەکهاتنی پبت و خالّەکان بە بیێ بەردەوامی ژێرەکی، بەلّکو لەبەرئەوەی ئەوە دەخاتەروو کە ئێستا و رابردوو و داهاتوو، لە هەموو روێکەوە تەماهی یەکن و چۆن یەکن[4].

ئەگەر مرۆڤ بیەوێت (کێشکردن و میکانیکیای کەم) یەکبخات، ئەوا پێویستە بیرۆکەی زەمەنی خەیالّی دابهێنین، لەم زەمەنە خەیالّیەدا ئاراستەکانی کە لە بۆشاییدا هەن لەیەکتر جیاناکرێنەوە، و ئەگەر مرۆڤ توانی بەرەو ئاراستەی باکوور بڕوات، ئەوا دەتوانێت بە دەوری خۆیدا بسوڕێتەوە-بخولێتەوە- و بەرەو باشوور بڕوات،و بە هەمان شێوە لە زەمەنی خەیالّیدا ئەگەر مرۆڤ بەرەو پێشەوە بڕوات- ئاراستە بنێت- ئەوا پێویست دەبیێ کە بتوانێت خۆی

---

١ فکرة الزمن عبر التاریخ)- ل ٢٤١

٢ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٢٤

٣ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٢٢

٤ نظ ام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٢٣

بسوڕێنێتەوە  بەرەو دواوە ئاراستسە بنێت، ئەمەش مانای وایە کە لە زەمەنی خەیاڵیدا جیاوازیەکی زۆر نییە لە نێوان هەردوو ئاراستەی پێشەوە و دواوە ئەمە لەلایەك لە لایەکی دیکەوە، کاتێك مرۆڤ دەڕوانێتە (زەمەنی راستەقینە) جیاوازیەکی زۆر دەبینێت لە نێوان ئاراستەی (پێشەوە و دواوە) کەواتە ئەو جیاوازیەی نێوان رابردوو وداهاتوو لە کوێوە هاتووە؟ بۆچی رابردوو لە یادمانە و ئاینده نایەتەیادمان؟[1]

بە گوێرەی یاسای دووەمی دینامیکای گەرمی، پشێوی (ئەنتروبیا) لە هەر سیستەمێکی داخراودا، بەردەوام لەگەڵ زەمەندا زیاد دەکات و زیادبونی پشێوی لە زەمەندا پێی دەوترێت: تیری زەمەن، ئەویش ئەو شتەیە کە  رابردوو لە داهاتوو جیادەکاتەوە، بەمەرجێك ئاراستەی زەمەن زانراو- ناسراو- بێت. بەلای کەمەوە زەمەن سێ تیری هەیە، یەکەمیان: تیری دینامیکیەتی گەرمی بۆ زەمەن، کە بریتیە لەو ئاراستەی کە پشێوی زیاد دەکات. دووەم: تیری سایکۆلۆژیەتی بۆ زەمەن، ئەویش ئەو ئاراستەیەیە کە لە میانیدا هەست بە تێپەرینی زەمەن دەکەین، لەم ئاراستەیەدا تەنها رابردوو بە بیرماندا دێت و ناتوانین داهاتوو یادبکەین[2].

سێیەم: تیری گەردوونی بۆ زەمەن، کە نیشانەیە بۆ زەمەنەی کە گەردون تیایدا فراوان دەبێت، لەبری ئەوەی بچوك ببێتەوە.

کەچی زەمەن لە روانگەی فەلسەفەی هۆکاری، وەك راستەهێلێك، لە رابردووەوە گەیشتۆتە ئێمە و سەبارەت بە ئێمە لە هەنوکە دەست پێدەکات و وەك تیرێك یان هێلێکی راست بەردەوام دەبێت تا دەگاتە داهاتوو[3].

کەواتە زەمەن بنەڕەتی ژیانە و کێشەیەکە  هەمیشە مایەی جەدەل و گفتوگۆیە لە نێوان فەیلەسوفەکان و زانا فیزیاویەکان

١  موجز تاريخ الزمن- ل٢١٧

٢  موجز تاريخ الزمن- ل ٢١٩

٣  دراسات فلسفية- ٤- ١٩٩٩- بغداد –ل ٧١

- **دیالکتیکی زەمەن:**

زەمەن لە بەردەوامبوون و و بیَ وچانی ریٚرەوەکەیدا، هەمیشە زەمەنیٚکی ورد و عەینی و پڕە لە درز و کەلەبەر، چ شتیٚك بەردەوام دەبیٚت لە تەك زەمەندا؟ هەموو زەمەنیٚکی راستەقینە لە گەوهەردا فرە شیٚوە و فۆرمە و کرداری راستەقینەی زەمەن وەك یەکی دەخوازیٚت.

رابردوو لە تەك خۆیدا کۆمەلیٚك ناکۆکی گەورە دەهیٚنیٚتە پیٚشیَ، چونکە لەناو خودی رابردوودا راستی و پیٚچەوانە و ناکۆك هەیە. رابردوو بۆ ئیٚمە هەمیشە هەریٚمیٚکی دوو رەنگ بوە، هەر کاتیٚك بیرمان لە رابردوو کردبیٚتەوە خۆمان لەبەردەم دوو ویٚنەی تەواو دژ بە یەکدا بینیوەتەوە، دوو ویٚنە کە بە دوو ئاراستەی جیاواز سەنگ و قورساییان خستۆتە سەر ژیانمان، ویٚنەی " رابردوویەکی بەهەشتی" کە سیستەمی نەریتپاریٚز دەیسەپیٚنیٚت، و ویٚنەی " رابردوویەکی دۆزەخی" کە ئەزموونە کارەساتاوییەکانی ئیٚمە لەگەلَ رابردوودا دروستی دەکات. لە دیویٚکدا رابردوو تاکە جیگایەکە کە تیٚدا هیٚزە نەریٚتپاریزەکان دەتوانن بۆ شکۆ و مەزنی و ئەفسانەکانی خۆیان بگەریٚن و بابەت و رەمز وماناى لیَ دروستبکەن.لە دیوەکەی دیکەشدا رابردوومان زەمەنی میحنەتەکان و کارەساتەکان و نوشوستەکانە[1].

بە گویٚرەی دیالکتیکی زەمەن شتیٚك لە حالَەتی سکون و بەستووی نیە، بەلَکو لەحالَ و حەرەکەت و گۆڕانکاری بەردەوامدایە، لە حالَی گەشە و نویٚبونەوەی نەپچڕاودایە، شتیٚك دادەهیٚنریٚت وشتیٚکی دی نامیٚنیٚت و ون دەبیٚت[2].

لە ژیاندا جگە لە زەمنی زیندەگی و گوزەرانکردن، زەمەنی مەعقول وئاگاییش هەیە وئەم زەمەنە بەگوڕترە بۆ دەرچوون و ئازاترە بۆ بڕین و گەیشتن و بەردەوامبوون.

لیٚرەدا پرسیاریٚك قیت دەبیٚتەوە، ئایا مەسەلەی هەقیقەتی زەمەنی دەرونی لە چیدایە؟ و پیٚویستە لە کویَ بە دوای واقیعی زەمەنیدا بگەڕیٚین؟ ئایا جۆراجۆریەك لە یاسای بەدوایەکداهاتندا نییە؟ و ئەگەر جۆراوجوری لە یاسای بەدوایەکداهاتندا هەبیٚت، ئەوکاتە

---

١ رەهەند-٦ - ل ٤٧

٢ گ، هەژان- ل ٢٨س

ناگەینە ئەو ئاکامەی کە فرە زەمەنی هەیە[1]. دەکرێ بلێین کە زەمەن دیاردەیەکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو ئەبستراکیتە بۆ جووڵە و رووداوەکان لە شێوەیەك لە شێوەکان، چ شتێك وامان لێ دەکات ببینە رەوتکردنی یەك ئاراستەی زەمەن[2].

دەبێ ئەوە بزانیین کە زەمەن ئەبەخشێ و ئەبات و مرۆڤ لە ناخی خۆیدا هەست بەوە دەکات کە زەمەن بێ وچان و بێ راوەستان دەڕوات، بەم شێوەیە زەمەن مایەی هەستکردن لەلایەن ئێمەوە، بە تایبەتی لە حاڵەتی نیگەرانی و دوودڵی و بیرکردنەوە لە مەرگ زیاتر هەستی پێدەکەین[3].

سەرەتا و دەسپێکی زەمەن و کرداری یەکەمین لە زەمەندا، بریتیە لە کۆششی بەردەوامبوون و بەیەکگەیشتن، واتە بۆ ئەوەی زەمەنێك پێکهاتەیەکی تەواوی هەبێت، دەبێت سەرەتایەکی باش و نایابی هەبێت. بۆیە پێویستە بگەینە ئەو ئاکامەی کە رێگاکانی کە بە زەمەن دەستپێدەکات پیارۆی ئاسایی و ساکار نیین، لەبەر ئەوەی ئەکرێ هەندێك رووداوی گرنگ و یەکلاکەرەوەی لێجیابکەینەوە[4].

مێژووی زەمەن و مرۆڤ مێژووی لەیەکپچڕان و و بۆشاییە، ساتە گرنگەکان لەسەر شانۆکانی مێژوو روودەدەن و بەدوایاندا شەپۆلێکی گەورە لە بۆشایی دەردەکەوێت کە زەمەنێکە تەنها زرینگانەوەی ئەو ساتە گرنگەی هەڵگرتووە، لە نێوان راستیەك و راستیەکدا، لە نێوان هیوایەك و نائومێدیەکدا تەنها ئەو سێبەرانە هەیە کە وەك تارمایی لە زەمەنە راستەقینەکانەوە دەکەونە خوارێ بۆ ناو ئەو بۆشاییانەی کە زۆربەی رۆژەکانی تەمەنی ئێمەی پۆشیوە و عەدەمیەتێکی چنراوی لە هەناوی رۆژەکانماندا چانوە. بەم مانایە جیهان بەوەدا جیهانی لێکدابرانەکانە، لە نێوان هەر زەمەنێك و زەمەنێکادا ئیستێکدەگرین، لە نێوان هەر راستیەك و رەتکردنەوەیەکدا وێستەگەیەك هەیە.

لێرەدا رابردوو دەیەوێت کۆنترۆڵی زەمەن بکات. بەم مانایە عەدەم ئەو مەوادایەیە کە دوو زەمەنی راستەقینەی دابڕاو و دژ و جودا لەیەك جیادەکاتەوە. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە

---

١ گ، هەژان- ل ٤٤

٢ ماهو الكون؟ تاليف المهندس فايز فوق العادة- دار علاْد الدين- سوريا- ٢٠١٠- ل ٩٠

٣ رەهەند-٦ - ل ٤٨

٤ رەهەند-٦ - ل ٥٧

لێرەدا عەدەم بە مانای هیچی نایەت، بەڵکو ئەو حاڵەتەیە کە دەکەوێتە نێوانی چۆنایەتیەکانەوە، و ئەو مەودایەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو چرکە ودوو چۆنایەتییەوە[1]. عەدەم دێت و زەمەن پڕەکات لەو تارماییانەی کە جگە لە تارمایی هیچی تر نیین، زەمەن پڕدەکات لەو رووداوانەی کە جگە لە نمایش هیچی تر نیین، زەمەن پڕ دەکات لەو شوناسانەی کە جگە لە سێبەری بونێکی رابردووی خۆمان هیچی تر نیین، لەم ئاستانەشدا یادەوەری وەکو هێزی باڵا بەسەر هێزی زیندووی ژیاندا زاڵدەبێت، یادەوەری کە بۆشاییەکاانی داهێنان و کارکردن پڕەکاتەوە. کە داهێنان و یادکرنەوە وەکو یەك وابن یادەوەری ساتەکانی عەدەم پڕدەکات لە وێنە و هەست و ئومێد[2].  عەدەم رێکخستنەوە و زیندووکرنەوە و وئامادەکرنەوە و دووبارەکرنەوەی ئەو شتانەیە کە لە زەمەنێکی دیکەدا هاتوونەتە بەرهەم. دەکرێت عەدەم ئەو پێشەکی بونێکی دیکە بێت، ئەو جیگایەك بێت کە ژیان عەقلً، تێرامان، پێویستانە تا سەرەتایەکی تر بۆ خۆیان بکەنەوە، عەدەم دەکرێت ئەو ماڵەی عەقلً بێت کە تیایا خۆمان ئامادە دەکەین بۆ سەرکێشیەکی تر، ئەو وریایی و بێدەنگی و کپییە بێت کە بەر لە هەنگاوی یەکەم بۆ ناو نادیار دامانده‌گرێت[3].

دابڕان لە سەردەم و قۆناغی پێشوو هەندێك جار پێویستە، بەڵام هەرگیز دابڕان لە یەك ساتدا لە هەموو کایەکان ولە هەموو بوارەکاندا روونادات. لە رێگای ئەو دابرانەشەوە هەستدەکەین زەمەن جوڵەیەکی ناوەکی و ئاڵۆزی هەیە

هەندێك بیرو بۆچوون سەبارەت بە زەمەن هەیە، پێی وایە، کە زەمەن لە خودی خۆیدا بوونی نییە، وەك(سەعات، یان قەپان)وایە، بەڵکو ئێمە هێناومانەتە بوون و دروستمان کردوە،ئەمەش بەمەبەستی ئاسانکاری گوزارشتکردن لە شتەکان. هەروەها رابردوو و ئێستا و داهاتوو، لە ئارادا نین، بەڵکو بە گوێرەی سروشت گەردوون هەمووی ئێستاکەیە.

کەواتە بە گوێرەی یاسای دیالکتیتك، زەمەن یەك شێوە و و یەك حاڵەتی نییە، بەڵکو فرە شێوەیە و بەردەوام لە گۆڕاندایە لە حالەتێك بۆ حالەتێکی دیکە.

---

١ رەهەند-٦ - ل ٣٥

٢ رەهەند-٦ - ل ٣٦

٣ سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦

- **(زەمەن، ئەزەلی، ئەبەدی):**

پێش ئەوەی پەیوەندی نێوان (زەمەن) و چەمگەلی وەك(ئەزەلی، ئەبەدی، سەرمەدی) باس بکەم، پێویستە پێناسەیەکی کورتی ئەم چەمکانە بکەین، بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان زەمەن و ئەم چەمکانە روونتر و دیارتر بێت. ئەبەد: بەردەوام بوونی (بوونە) هەتا هەتایە، ئەزەلیش: بەردەوامبوونیەتی لە رابردوودا....(سەرمەد)یش، ئەوەیە نە سەرەتای هەبێ و نەبنەتا، دوولایەنی هەیە: یەکەم بەردەوامبوونی لە رابردوودا کە پێی دەوترێ "ئەزەل"..دووەم بەردەوامبوونی لە ئایندەدا کە پێی دەوترێ "ئەبەد- هەتا هەتا [1]. عەبدلقادر گورگانی، سەبارەت بە پێناسەی (ئەزەل) دەلێ: ئەزەل بەردەوامبونی بوونە لە رابردوو وە تا هەتاییێ، کەچی ئەبەد: بەردەوامی بوونە لە داهاتوودا.هەروەها لەمەڕ پێناسەی زەمەندا دەلێی: (زەمەن پێوانەی جوولەیە و بەشەکانی زەمەن پێکەوە نیین، هەرچەندە پێکەوە لکێنراون، لەبەرئەوەی ئێستا لە دووسەرەوە (لاوە) پەیوەستە بە رابردوو و داهاتوو [2].

کاتێك دەڵێین، زەمەن سەرمەدیە، واتە هەر هەبووە و هەر بەردەوام دەبێت هەتاهەتاییێ، کەواتە ئەزەل و ئەبەد دوو سیفەتن بەند و پەیوەستن بە زەمەنەوە.

- **زەمەن وئەبەدی:**

زۆربەی ئایین و شارستانیەکانیش بروایان بەوە هەبوو کە زەمەن خۆی دووبارە دەکاتەوە یان خولی هەیە، لەلایەکی دیکەوە، فەیلەسوفە یۆنانیەکان بڕوایان وابوو کە زەمەن بەیەك ئاراستەدا دەڕوات، دواتر ئایینی جولەکە و کریستیانیش جەختیان لەسەر ئەم روانیە بۆ زەمەن کردەوە و بڕوایان بە چەمکی خەلقکردن (سەرەتای زەمەن و سەرەتای جیهان) و

---

١ زانستی کەلام — ل ٢٦١-٢٦٣

٢ مجلة العربي، عدد، ٤٦٣، - ١٩٩٧

لەناوچوون(کۆتایی جیهان و زەمەن) هەبوو، بەڵام بۆچوونی گریکەکان لەمەڕ ئەبەدیەت زۆر پشتەوانی لێ کرا و ئەبەدیەت جۆرێك بوو لە زەمەنی یەکەمین و باڵا[1].

لە ئەبەدیەتدا بون مانای هەیە بەڵام زەمەن مانای نییە، بیرۆکەی ئەبەدیەت بۆ ماوەی چەن سەدەیەك ببوە مایە و جیگای لێکۆڵین و تۆژینەوە، هەروەها بەشێکی زۆری کتێبی پیرۆز بایەخی بە راڤەکردن و مانای ئەبەدیەت داوە، رەنگە ئەم چەمکە تەنها بۆ وەسفکردنی زەمەن بێت، بە گوێرەی تێگەیشتنی مرۆیی: مەبەست بێت لە زەمەنی پێش پەیدابوونی مرۆڤ، هەروەها زەمەنی دوای کۆتایی هاتنی مرۆڤ. رەنگە چەمکی ئەبەدیەت لە ئاکامی ئەو روانینە هاوبەشە سەریهەڵدابێت، کە پێیوایە پێوەرێکی زەمەنی رەها هەیە بۆ مێژووی کەون و گەردوون- پێوەرێکی زەمەنی کە مانا و دەلالەتێکی گەورە ئەبەخشێت و شکۆمەنترە لە پێوەرێکی زەمەنی رێژەیی کە بە گوێرەی ئەزمونی مرۆڤ داندرابیێت[2].

ئەبەدیەت: سیفەتێکی خواوەندە، سیفەتی شتێکە نە سەرەتای هەبێ و نەکۆتایی، هەروەها گۆڕانی بەسەردا نەیەت، رەنگە زەمەنی نەگۆڕ و سابت هاوشێوەی ئەبەدی بێت[3]. بەڵام وشەی زەمەن گشت گۆڕانکاری و چاکسازی پرۆسەکانی خەتی و خولی لەخۆدەگرێت.

لە سەدەی (١٢)ی زاییندا وشەی سەرمەدی ( aevum)لەبری وشەی زەمەن بەکارهات. بوون لە سەرمەدی دا واتە خاوەن سەرەتاو کۆتایی، هەروەها واتە دووچاری گۆڕانکاری دەبێت. مانای چەمکی سەرمەدی جیاوازە لە زەمەن، لەبەر ئەوەی گۆڕانکاریەکان کاریگەریان نابێت لەسەر جەوهەری ئەو بوونەوەرانەی کە دووچاری گۆڕان دەبنەوە. چەمکەی سەرمەدی بەوە ناسراوە کە ماوە یان نێوەندێکە لە نێوان (ئەبەدیەت) و (زەمەن). ئەرستۆ پێیوایە کە (ئەبەدیەت) و (زەمەن) جیاوازن لەیەکتر و دەپرسێ، ئەو بونەوەرانە چین کە ئەبەدین؟ وئەو بوونەورانە چین کە تەنها لەناو زەمەندا هەن؟ کەواتە مەبەست پیوەندی نێوان خودا و جیهانە. ئایا دەتوانین بە بەڵگەی عەقلانی ئەو دەربخەین کە جیهان لە ناو زەمەندا ئافەریدەکراوە، یان دەبێ بڵێین جیهان نەمر و ئەبەدیە وەك خودا؟ ئەو دیدەی کە پەیڕەوکەرانی

---

١ فكرة الزمن عبر التاريخ، ل ٢٤٤

٢ فكرة الزمن عبر التاريخ، ل ٢٤٤

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٨٢

ئەرستۆ سەبارەت بە جیهان هەیانە، کە پێیان وایە جیهان ئەبەدیە، وەك دیدی مەسیحیەکانە سەبارەت بە خودا[1].

لایەنگرانی ئەرستۆ پێیان وایە کە تەنها خودا ئەبەدی نییە، بەڵکو هەر شتێك کە نەگۆڕدرێت، بە تایبەتی تەنە ئاسمانیەکان، ئەوە ئەبەدیە. (زەمەن)یش کورتکراوەتەوە بۆ زەمەنی ئەو بوونەوەرانەی کە سووڕدەخۆن و دەخولێنەوە[2].

چەمکی بوونەوەرێکی ئافەریدە و ئەبەدی، شتێکی دژە یەکە، بۆیە هێڵی جیاکەرەوە لە نێوان خالق و ئافەریدەکراوەکان لەو خاڵەدایە، لە نێوان ئەبەدی و زەمەن. ئەم هەڵوێستە وەك هەڵوێستی سانت (تۆما ئەکوینی)یە، سانت تۆما پێیوایە، کە بوونەوەرە جەستەیی و تەنیەکان خراونەتە ژێر باری لەدایکبوون و فەنابوون، لە زەمەندایە کە بە زەمەنی خولی دانراوە، بەڵام بونەوەرە رۆحیەکان، جیاوازن لەبەرئەوەی ئەو بونەوەرانە لەناو زەمەندا نیین، بەڵکو سەرمەدیین، (سەرمەد)یش ماوەیەکی نێوەندە لەنێوان ئەبەدی و زەمەن، واتە لە نێوان بارێکی سابت و گۆڕانی گەوهەری[3].

سەبارەت بە گرفتی نێوان ئەبەدی و زەمەن، ئەفلۆتین، پێیوایە کە ئەبەدیەت لە هەمان خودی گەوهەری واقعی و حەقیقە، کە واقیعی خواوەندیە، نە سەرەتا و نەکۆتایی هەیە، چونکە هەمەکی یە، بە کۆتانەهاتووە و بە کۆتاش نایەت و تەواونابێت، بەڵکە بەردەوام هەر هەیە و دەمێنێتەوە. هەروەها بە دیدی ئەفلۆتین، ئەگەر لە دەروون و نەفسی مرۆیی رابمێنی، دەبینی هاوشێوەی ئەبەدیە[4].

ئەفلۆتین، بڕوای وایە کە توخمەکانی هەردوکیان بریتین لە: بەردەوامی، جێگیری و چەسپاوی، سەقامگیری، ئەو پێیوایە ئەبەدیەت، دەیومە و بەردەوامیەکی پەتیە، هەمووشتێك لە بنەڕەتدا تیایدایە، گشتێکە بێ کەموکوڕی، هەروەها حزور و ئامادەگیەکی هەمەکی و عەفەوی و راستەوخۆی هەیە، لە هەموو شتێکەو بۆ هەموو شتێکی تر، واقعێکی ئەو پەڕە، تەواو وکەماڵی بوونە، هەموو شتێك تیایدا بەردەوامدەبێت، بە بێ ئەوەی هیچ بەدوایەکداهاتن

---

١ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٨٣

٢ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٨٣

٣ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٨٣

٤ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٣٥٥

هەبێت[1].   لەبەرامبەر ئەم تێروانینیە لە مەڕ ئەبەدیەت کە رەگەکەی لە ئایین و سیحردا داکوتاوە، زەمەنی خودی لای ئەو بەوە وەسفدەکرێت کە: دەگۆڕێت، کاتییە، دوماهی یێت، ئامادەگیەکی یەك بەدوای یەکە و ناراستەوخۆیە سەبارەت بە هەندێك شتی دیاریکراو، واتە زەمەن لە سەرەتاوە ناتەواوە لە کەموکوڕیەکی بەردەوامدایە، هەمەکیەکەی ناتەواوە و مایەی تێگەیشتن نییە: رابردوی لەناو ئێستادایە، نا کیانە و داهاتووشی تیادایە، تەنها چرکە ساتێکی بچوك ئامادەیە، هەروەها شیاوی دەرکپێکردن نییە، چونکە لە شێوەی خاڵدایە. بە روانین ئەو زەمەن زنجیرەیەك چرکە ساتە، تارماییە و لەناوچووە، زۆر نزیکە لە ناکیان (اللاکیان) کە بە ئەستەم لە فەنابوون جیادەکرێتەوە، کەواتە دەکرێ زەمەنی گەردوونی نێوەندێك بێت لە نێوان ئەبەدیەت و زەمەنی خودی (دەروونی)[2].

ئەبەدی لای سانت تۆما تەنها پەیوەستە بە خوداوە، کەچی فریشتەکان و گیانەکان و تەنە ئاسمانیەکان سەرمەدی نین. هەروەها بوونەوەر و هەبووەکانی سەر زەوی بە پلەی سێیەم دێن، کە دەخرێنە ژێر باری لەایکبون و لە ناوچوون[3].

چەمکی (ئەزەل) و (ئەبەدی) لە فیکری ئیسلامیشدا بەند و پەیوەستە بە خوداو گوتەکانی خودا، واتە وشە و گوتەی خوا ئەزەلیە و ئافەریدە نەکراوە –خەڵقنەکراوە- واتە پەیوەست نییە بە زەمەن.

## - زەمەن و ئەزەل:

ئەزەلیەت هەندێك جار بە جۆرێك لە جۆرەکان لە (شوێن، زەمەن)دا دەردەکەوێت و تەجەلی دەکات، ئەزەل بریتیە لە جیهانی نموونە و ئایدیا، (رەها)ش لە زەمەندا تەجەلادەکات، واتە زەمەن شێوەیەکە لە ئەزەلیەت، زەمەن بە دوای یەکدا دێت، چونکە لە ئەزەلەوە هاتووە و بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، بە واتایەکی دیکە، بیرۆکەی ئایندە کۆك و سازە لەگەڵ حەز و ئارەزوەکانمان بۆ رەسەن و سەرچاوەکان. گەردوون و بوونەوەرەکان دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ رەسەن و بنەرەت و ئەزەلەوە[4].

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٣٥٦

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٣٥٧

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٨٤

٤ الزمان في الفكر الديني والفلسفي- حسام الوسي- ل ١٤٤، ١٦٩

له دیدی و روانگەی (تۆما ئەکوینی)وە زەمەن وەك جوڵەیە، کیان و هەبوونێکی ناتەواوی هەیە: زەمەن لەگەڵ جووڵەدا یەك ڕێگایان هەیە پیایا تێبەڕن، بەڵام لەبەر ئەوەی نیشانەیەکی نەگۆڕ و سابت نییە بۆ جیاکردنەوەی پێش و پاش، بۆیە زەمەنێکی نادیار و لێڵ و ورد لە ئارادا نییە[1]. کەواتە زەمەن لای تۆما خودی و سروشتییە لە یەك کاتدا.

پاش ئەوەی تۆما جەخت لەوەدەکاتەوە کە خودا ئەبەدییە، دێتە سەر جیاوازیکردن لە نێوان ئەبەدی و زەمەن: ئەبەدی گشتی و هاوکاتییە، زەمەن بەدوایەکداهاتن و پاش و پێشی تیادایە، بەڵام ئەبەدیەت پاش و پێشی تیادا نییە و ناکۆکە لە گەڵ پێش و پاش[2]. بە گوێرەی تۆما، تەنیا یەك سەرمەدی هەیە، هەر وەك چۆن تەنیا یەك زەمەن هەیە. سەبارەت بە چەمکی سەرمەدیەت، عەبدلرەحمان بەدەوی، پێیوایە، سەرمەدیەت وەهمە و بوونی نییە، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە بەند و هاوکاتە بە زەمەن. هەروەها بەدەوی پێیوایە کە بیرۆکەی (سەرمەدی) لێوان لێوە لە ئاڵۆزی و گرفت، و بڕوای وایە کە باسکردن و وێناندنی سەرمەدی بەبێ سێ ڕەهەندەکەی زەمەن، وێناندنێکی نادروست و ناتەواوە[3].

باسکردنی مەسەلەی پەیوەندی نێوان زەمەن و (ئەزەلی، ئەبەدی، سەرمەدی) پەلمان کێش دەکات بۆ باسکردنی پەیوەندی نێوان خودا و زەمەن و چەمکەکانی (ئەزەلی، ئەبەدی، سەرمەدی) سەبارەت بەم پەیوەندیەش، چەندین پرسیار قیت دەبنەوە، وەك: ئایا خودا لەناو زەمەندایە؟ یان لەگەڵ زەمەندایە یان پێش زەمەن، یانیش خودا نازەمەنیە؟ بە گوێرەی ئایینە یەکتاپەرستیەکان، خودا ئەزەلی، ئەبەدی، سەرمەدییە و ئەمانە سیفاتی خودان، لەبەر ئەوەی خودا نە سەرەتای هەیە و نەبنەتا و بێ کۆتاییە و هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت. واتە ئەم ئاینانە باوەڕیان وایە کە خودا هەر لە کۆنەوە هەبووە، پێش ئەوەی هەر شتێك بونی هەبوبێت ئەو هەبوە، هەروەها لای ئەم ئایینانە خودا ئەزەلی یە، سەرمەدی یەو سنووردار نییەو و هەتاهەتایە هەر دەمێنێت، بەردەوام هەبوە و هەر ماوە، هەتا ترۆپکی سەرمەدیەت هەردەمێنێ. ئایندارن بە گشتی بڕوایان وایە، کە خودا هەمیشەییە و بەدرێژایی زەمەن بونی هەیە، بە گوێرەی ئەم روانییە، دەتوانین بلێین خودا لە بێ زەمەندایە و بە تەواوی لە دەرەوەی

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٣٦٩

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٣٦٩

٣ (مجلة —دراسات فلسفية_ ل ٥٥)

زەمەنە، ئەوان پێیان وایە خودا داهاتوو و ئێستا و و رابردووی نییە، بەڵکو خودا بە تەواوی لە هەموو زەمەنەکاندا هەیە، لە یەك ساتدا و لە ئامادەبونێکی هەمیشەیی دایە[1]. یان بە پێی تەعبیری قەشە (ئۆگستین): تۆ لە زەمەندا نییت، پێش زەمەن کەوتووی، پێش هەموو شتەکانی رابردوو کەوتووی، تۆ بەسەر هەموو شتەکانی داهاتوودا زاڵ بووی. بە گوێرەی تیۆری بێ زەمەنی خواوەند، ئەگەر خودا لە زەمەندا بێ ئەوە بێ هیچ گومان دەگۆڕێ و ئەم سیفەتەش ناکرێ ببەخشرێت بە خودا، بەڵام لەلایەکی دیکەوە ئەگەر خودا ئەبەدی و سەرمەدی بێت واتە بێ زەمەن بێت، ئەوا چۆن دەکرێت خودایەك کە بێ زەمەن بێت، هۆکاربێت بۆ ئەو دیاردە و شتانەی کە لە ناو زەمەندا و لە ناو جیهانێکی زەمەنیدا روودەدەن؟[2]

قەشە ئۆگستین، پێیوایە خودا، پێش هەموو رابردوویەك و دوای هەموو داهاتووەکەو بەردەوام ئامادەگی هەیە، بۆیە ناتوانیین پێکەوە بونێك بکەین لە نێوان خودا و زەمەندا، چونکە خودا بەردەوام و هەمیشەییە، بەڵام ئەگەر زەمەن بەردەوام بێت ئەوا زەمەن نییە یان لە زەمن دەردەچێت[3]. هەروەها لە روانگەی (نیوتن)ەوە، بەردەوامی و دەیمومەتی خودا ئەبەدی رابردووەوە درێژە دەکێشێت بۆ ئەبەدیەتی دوارۆژ. ئامادەیە لە ناکۆتایی بۆ ناکۆتایی. خودا، ئەبەدی و بێ کۆتاییە و هەمیشە ئامادە و بەردەوامە و ئەو شوێن و دەیمومەت پێکدێنێت[4].

- **دووبارەکردنەوە:**

گەڕانەوە و دووبارەکردنەوەکان: رێکخستنی بەدوایەکهاتنێکە لە داهات و رووداو لەگەڵ گۆڕانکاری لەوچوو یان هاوشێوەی ئەو، لەلایەن بابەتێکی نەبینراو کە دەکرێ مانای هەبێت، هاوبەشێکی نوێ دێنێتە ناو مێژوو و زەمەن...مەبەست لە زەمەن بە شێوەیەکی تایبەت جیاکردنەوەیەتی و دیاریکردنی (تۆبۆلۆجیا)کەی، بزانرێ ئایا نەگۆڕ و سابت و جێگیرە، یان خولەکی و راستەهێڵییە، و ئەگەر لە حاڵەتی سێیەم دابێت بەرەو پێشەوەیە، یان بەرەو دواوە.

---

١ گ، واتە، ژ- ٣، ٢٠١٠، ل ٣٣٣س

٢ الله و العقل والكون، بول ديفز، ترجمة، سعدالدين خرفان، دار علاء الدين، ٢٠٠٨- ل ٤١

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل٣٦١

٤ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٠٩

بەم شێوەیە پەیوەندییەکان بونیاددەنرێن لە نێوان رابردوو وئێستا و داهاتوو، هەروەها هەر بەم شێوەیە جێگای ئێستا لە هەمەکی مێژوودا دیاردەکرێ[1].

ئەگەر گریمان زەمەن وەستاوە و جێگیرە، ئەوا جیاوازی لە نێوان رابردوو وئێستا و داهاتوودا نابێت، ئەوکاتە سیستەمی بەدوایەکهاتن بێ مانا و بێ دەلالەت دەبێ و مێژووش دووردەخرێتەوە[2]. ئەگەر گریمان زەمەن راستەهێلیە، ئەوا بەرەو کەماڵێکی داهاتوو دەچێت، یانیش لە کەماڵێکی رەسەن بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە، ئەو کاتە داهاتوو یان بەرزتر یان نزمتر دەبێت لە هەنووکە، هەروەها ئێستاش بە هەمان شێوە بەرزتر یان نزمتر دەبێت لە رابردوو. بۆ لەیەکدان و خستنەپاڵیەکی چەند رووداوێکی بەوایەکداهاتوو لە پێشکەوتنی هاوشێوە، دەشێ چەند بەشێکی پێکهاتوو لە رووداوی تەك یەك، کە گوزارشت لە خاسیەت وتایبەتمەنیەکانی بەش دەکات کە وەك یەکە بۆ گۆڕانی نەبینراو مادام بەشەکان لەیەکتر جیاکراونەتەوە، ئەوا مێژوو دابەشدەکرێت بۆ چاخ و سەردەم و قۆناخ و خول. کە بە دیدی ئێمە ئەمە هاوشێوەی ئەو قۆناخانەیە کە نونەوەرەکان لە ژیاندا پێیدا تێپەڕدەبن[3].

هەروەها ئەگەر گریمان زەمەن خولەکی یان پچڕپچڕبێت بلەرێتەوە، ئەوا داهاتوو، بەشێوەیەك لە شێوەکان دەبێتە دووبارەی رابردوو، سەبارەت بە ئێستاش وادەخوازێت بۆ ئەوەی شوێنەکەی دیاربکەین، بزانیین کە ئێمە لە چ خولێکدا رەوت و گوزەردەکەین، چونکە زەمەن لە خولی بەرزبونەوەدا پێشدەکەوێت، بەڵام لە خولی نزمبوونەوەدا لەگەڕانەوەدایە، بۆیە پێمان وایە کە دابەشکرنی زەمەن بۆ چەند قۆناخێك مەرج نییە پەیوەست بێت بە زەمەنی خەتی و راستەهێلی[4].

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە سروشت لەرینەوە و جوڵانەوەی خولی بەسەر هەموو شتەکاندا دەسەپێنێ وبۆ هەر یەکێکیان ئاستێکی دیاریکردوە، کە ناکرێ لێی رەتبدات، هەرکە گەیشتە ئاستێکی دیاریکراو ناچاری دەکات دابەزێتەوە بۆ خوارەوە و پاشان دووبارە دەستبکات بە بەرزبوونەوە.

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٧٦

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٧٦

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٧٦

٤ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٧٧

- رووکردنە ئایندە و درێژکردنەوەی زەمەن:

دوای ئەوەی زەمەن خزایە (هاتە) ناو سەرجەم بوارەکانی شارستانی، دوو گۆڕانکاری روویاندا کە کاریگەریان لە سەر تیۆرەکان و دیدو هەڵوێستەکان، لەسەر زەمەن هەروەها لەسەر بونیادی زەمەندا هەبوو. درێژکردنەوەی ماوەی تەرخانکراو بۆ مێژووی جیهان، زەوی، ژیان، ئەوەی گرنگە ئەم درێژکردنەوەیە جۆرێك گوازتنەوەی تیادابوو، کە پەیوەستە بە روانین و ئاراستەی مرۆڤ، واتە گوازتنەوە و رەتبوون لەو زەمەنەی ئاوڕ لە رابردوو ئەداتەوە بۆ روانینی ئەو زەمەنەی روویکردۆتە داهاتوو[١]. ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر چینەکانی کۆمەڵگە، بۆ پێشکەوتنی ئابووری و گۆڕاکاری و زیادبوون لە ژمارەی دانیشتوان.

رووکرنە ئایندە و داهاتوو بووە ئامانجی مرۆڤ و خەیاڵ و ئەندێشەی مرۆڤ کەوتە گەڕ و کارکرن بۆ داهاتوو. لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێك بیردەکاتەوە چی بکات بۆ ئەوەی ئاستی ژیانی لە داهاتوودا بەرزبکاتەوە، بۆیە مرۆڤ کۆششی کردوە بۆ ئەوەی رێگایە بۆ خۆی بۆ سەرکەوتن بدۆزێتەوە. واتە داهاتوو بووە ئامانجی سەرەکی و چەقی کارو پڕۆژەکانی ژیانی مرۆڤ[٢].

کارکردن لە پێناو دەستەبەرکردنی مانەوە و ئامادەگی دوای مردن، بە هۆی داهێنان و و دەسکەوت و کارەکانییەوە. تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی هەندێك دەسکەوتی هەنووکەییش بێت، واتە قوربانیدان بە بەشێك لە ژیانی ئێستا لە پێناو ئایندە و پەیوەندی نێوان ئێستا و داهاتوو وەك نماکردن و گەشەسەندن تەماشابکرێت و بیری لێبکرێتەوە. لەلایەکی دیکەوە، لە دوای سەدەی (١٥)ی زایینیەوە لە هەموو شوێن و جێگایەکدا لە سۆنگەی بەردەوامی نەوەکان کە درێژدەبێتەوە بۆ داهاتوو، بایەخدرا بە دابینکردنی چارەنووسی منداڵ: پەروەردەکردنیان بە شێوەیەکی باش، دیاریکردنی رەوتی ژیان و و جۆری کاریان، کە ئەمە تەنها پەیوەستە نییە بە پاراستنی ژیان، بەڵکو رەچاوی بەرزبوونەوەی ژیان و سەرکەوتن دەکرا[٣]. ئەمەش گەواهی

---

١ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٤٢٦

٢ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٤٢٧

٣ نظام الزمان- کریستوف بومبیان- ل ٤٢٨

ئەوە دەدات کە ئاراستەی هزرو بیری مرۆڤ سەبارەت بە رەهەندەکانی زەمەن (رابردوو، ئێستا، داهاتوو) گۆڕانی بەسەرداهات.

لە کاتێکدا رابردوو دووردەکەوێتەوە و دەفەوتێت و کاریگەریەکەی کەمدەبێتەوە، داهاتووی دنیایی و سەروەری ژیانی رۆژانەی ئاینده زیاتر خۆی دەسەپێنێ و بایەخی زیاتر دەبێت[1]. بەم جۆرە سیستەمی کۆمەڵایەتی بە تەواوی گۆڕا، بانگەوازیکردن بۆ داهاتوو، هێدی هێدی جێگای بانگەوازیکرددن بۆ رابردوو و رۆژی دوایی و قیامەت گرتەوە. هەروەها ولاّتانی جیهان لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بایەخێکی زیاتریان دا بە داهاتوو، ئەمەش لە رێگەی دانانی پلانی ئابووری و زانستی لە پێناو پێشکەوتنی ولاّتیان لە بواری ئابووری و تەکنۆلۆژیەوە، هەروەها پەیڕەویکردنی چەندین بنەمای جیاجیا و کاروکۆشش کردن لە پێناو هێنانەدی ئایندەیەکی گەش بۆ نەوەکانی داهاتوو[2]. پێویستە لەبیرنەکەین کە ئەم گۆڕانکاریەی سەبارەت بە روانین و ئاراستەی زەمەن، بەندو پەیوەست بوو بە پێشکەوتنی زانیاری، چونکە زانیاری هەمیشە لە پێناو داهاتووە، واتە زانیاری لە خود و پێکهاتەی خۆیدا زیاتر پەیوەستە بە داهاتوو[3].

بۆیە لە دوای سەدەی شازدەمەوە لە ولاّتانی ئەوروپا، منداڵ بووە ئامانج و چەق و تەوەری بایەخپێدانی خێزان و دەولەت، و پێویست بوو منداڵ هاوکات لەگەڵ فێربوونی ئەلف و بێی خوێندنەوە و نووسین، فێری بەکارهێنانی کاتژمێر و ئامرازی دیکە ببێت و رێز لە کات و ژوان بگرێت و بتوانێت زیاتر لەسەر ئەرك وکارێك بمێنێتەوە[4]. هەروەها فێری ئەوەبێت زەمەنی مێژووی بزانێت و بایەخی پێبدات، لە پرۆگرامەکانی خوێندنیشدا جەخت لەوە دەکرایەوە، ئەگەرچی مرۆڤ وەك تاکێك دەروات و نامێنێت، بەلاّم نەتەوە و کۆمەڵگە نەمرە و لەناوناچێت و بەردەوام دەبێت، هەروەها پرۆگرامی خوێندن رۆحی قوربانیدان و و وازهێنان لە مەبەست و بەرژەوەندی هەنووکەیی و تاکەکەسی، لە پێناو دەسکەوتەکانی داهاتوو و بەرژەوەندیە گشتیکان، لە ناو بیرو هۆشی منداڵانا بچێنێت و هانیانبدات. هەروەها پرۆگرامی قوتابخانە

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٢٨

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان _ ل ٤٢٨

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٣٠

٤ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٣٠

جەخت لە مانەوەی گەل و نەتەوە دەکاتەوە و ئەوە دەردەخات کە نەتەوە گەوهەری زەمەنی مێژوویيە و زامنی راستەقینەی داهاتووە. داهاتووش لەبەردەم هەموو کەس و نەتەوەیەکدا کراوەیە، بەلام کۆشش و رەنجی پێویستە. مرۆڤ باوەڕ و قەناعەتی بەوە هەیە، کە داهاتوو شیاوی پێشبینی و تەوەقوع کردنە، بۆیە دەکرێ لە میانی راڤەکردن و دیراسەتکردنی رابردوو و ئێستا، هێڵەسەرەکیەکانی داهاتوو دیار و دەستنیشانبکەین[1].

سەبارەت ئەم بابەتە، توێژەران تێبینی ئەوەیان کردوە، کە زیادبوون و گەشەسەندنی سەرمایە و پێشکەوتنی زانیاری، کاریگەری دیار و گرنگیان هەیە لەسەر پێشبینیکردنی داهاتوو. ئەگەر مرۆڤ بتوانێت پێشبینی ئەو دیاردانەبکات کە شارەزایی هەیە لە یاساکانیان و بتوانێت بە پشتبەستن بە ئەزموون و شارەزایی، پێشبینی رووداوەکانی داهاتوو بکات. ئەوا بۆچی پرۆژەی نەخشەیەك سەبارەت بە ئایندە و چارەنوسی مرۆڤ، بە پرۆژەیەکی وەهمی و خەیاڵی بزانیین یان دابنێین؟

ئەم دید و روانینانەی لەسەر پشت بەستن بە ئەزموون لای مرۆڤ پەیدابوون، بنەمایەکی راست و باشە بۆ رەفتار و روانینی مرۆڤی سەرکەوتوو لە ژیاندا[2].

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێین، ئەوانەی دەرگای چۆنایەتی دیکە دەخەنە سەر پشت، زەمەن دەگۆڕن بۆ کۆمەڵێ نەغمەی جیاواز، ژیان و زیندەگی دەگۆڕن بۆ کەرنەفالی چەندەها دەنگ و رەنگ.

## - زەمەن لە نێوان سروشت و میتاسروشتدا (برگسۆن)

بیرۆکەی زەمەنی چەندێتی، مەبەست و ئامانجی فەیلەسوفی فەرەنسی (برگسۆن)، کە لە روانگەی ئەوەوە لەگەڵ هیچ دراو و پێدانێك موتابق وجووت نییە، بەڵکو شتێکی دروستکراوە، لای ئەو زەمەن داهێنانە یان هیچ شتێك نییە، بۆیە بە بڕوای برگسۆن، (تێگەیشتن و بینین زەمەن وەکو شێوەیەکی بێ کۆتایی و کۆك و گونجاو، ئەمە تەنها تارمایی شوێنە کە خۆی بەسەر هزر و هۆشی مرۆڤ سەپاندوە)[3].

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٣٧

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٣٨

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٥٠

له راستیدا، ئەم جۆرە زەمەنە، پێچەوانەی شوێن نییە، چونکە  شوێنیش بێ کۆتایی و کۆکە، ئەوەی پێچەوانەی (شوێن)ە، دەیموەمەتە: (کە شێوەیەکە یەکبەدوایەکهاتنی حاڵەتەکانی هۆشمان وەریدەگرێت)[1] . کاتێك کە خودمان تەسلیمی ژیان دەبێت، لە کاتێکدا کە خودمان جیاوازیەك ناکات لە نێوان حاڵەتی هەنوکە و حاڵەتەکانی پێشتر، وەك چۆن لەکاتی یادکردنەوە ئەمە روودەدات. بە بۆچوونی برگسۆن، ئەگەر شوێن شتێکی دەرەکی بێت سەبارەت بە هۆشمان، ئەوا بەردەوامی تەماهی دەکات لەگەڵ شوێن[2]. لەبەر ئەوەی بەردەوامی بە گوێرەی ئەم بنەمایە رێکخراوە. ئەو بڕوای وایە کە بەردەوامی پەتی رەنگە تەنها بریتی بێت لە بەدوایەکهاتنی گۆڕانکاری چۆنیەتییەکان، هەروەها تێکەڵاونابێت، بێ چوارچێوەیە، نزیکایەتی لەگەڵ ژمارەدا نییە: ئەمەش شتێکی دژەیەکە. برگسۆن یەکەمین کەس نەبووە، کە (زەمەن و شوێن) بە (چەندێتی و چۆنییەتی) بچوێنێت، بەڵام ئەو بە هێنانە ئاراوەی چەمکی بەردەوامی بۆ ناو ئەم بابەتە، ئەوا زەمەنی زۆر نزیکردەوە لە زەمەنی دەروونی (خودی) و هەر بەوە وازی نەهێنا بسەلمێنێ، ئەو شتەی کە هەیە تەنها زەمەنی "رێژەییە" کە جووتە لەگەڵ حاڵەتەکانی هۆشمان، بەڵکو هەوڵیداوە ئەوە دەربخات، کە ئەو بەدوایەکهاتنە بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو بەودوایەکهاتنەی کە دەرکی پێدەکەین، یان بە گوزارشتێکی دیکە، ئەو بەدوایەکهاتنەی کە واهەست دەکەین ئێمە دەرکی پێئەکەین، کاتێك کە دەروانینە شتەکان[3].

لەبەر ئەوەی هۆش و جیهانی مادی لە روانگەی برگسۆنەوە، قابیلی پێوان نین و ناپێورێن، بۆیە ئەو رازی نییە لەسەر بیرۆکەی زەمەن نموونەی هەردووکیانە و دەکرێ هاوکات بن لەگەڵ یەك.

(برگسۆن) پێیوایە کە رابردوو و ئایندە هاوتا و هاوشێوەی یەکن، لەبەرئەوەی پێوەلکانی زەمەن، رابردوو دەکاتە گەوهەری ئێستا، بە دەربڕینێکی دیکە ئێستا هیچ نییە لە دیاردەی رابردوو زیاتر، هەروەها پێیوایە کە زەمەن ژیانە[4].

---

١ هەمان سەرچاوە — ل ٤٥٠

٢ هەمان سەرچاوە — ل ٤٥١

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٤٥١

٤ جدلیة الزمن — ل ١٤

## - چینەکانی زەمەن (پێکەوە ژیانێکی ناکۆك)

زەمەنی چۆنیەتی و زەمەنی چەندێتی، وەك هەر بوونەوەرێکی زیندوو و ئۆرگانی، سیستەمی زەمەنی لە مرۆڤدا دەردەکەوێت، واتە زەمەن وەك سەعاتێکی بایۆلۆژییە. ئیستا ئەوە دەزانیین کە چەندین گۆڕانکاری، وەك: گەرمایی، دەردانی هەندێك رژێن، رێژەی هەندێك توخم لە خوێندا،... بونیادێکی زەمەنی تەناوبی و نۆرەیین، لە ٢٤ کاتژمێردا دەردەخەن، هەروەها ئەوەش دەزانین کە کارو ئەرکە فیزیۆلۆژیەکان، هاوکاتە لەگەڵ خولی (روناکی/ تاریکی) بە هۆی هۆرمۆنی میلانین کە پێکهاتەی لە رژێنی سنوبەریدا بە رووناکی دابیندەکات[١]. کەواتە دۆزینەوەکانی مێژووی بایۆلۆژی سروشتی بنەماکانی بونەوەرە زیندوەکان دەردەخەن، هەروەها مرۆڤیش بەدەر نییە، لەم رێسایە. واتە رێکخستنی زەمەنی کار و ئەرکی بوونەوەرە زیندەگیەکان بە هەمان شێوەیە[٢].

بۆمان دەرکەوت کە مرۆڤ وەك تاکێکی ئینسانی خاوەن بونیادێکی زەمەنییە، و بەشێوەیەکی گشتی جووت و هاوشێوەی پلەکانی پەرەسەندنی بایۆلۆژییە.

بە گوێرەی ئەم لێکدانەوەیە بۆ مان دەردەکەوێت، کە هەموو تاکێك لە کۆمەڵگا و ژیاندا لە نێوان ململانێی زەمەنی چۆنیەتی و زەمەنی چەندێتی دایە، یەکەمیان زەمەنی گەردوونی و هەتاوییە، کە پەیوەستە بە بەدوایەکهاتنی، شەو رۆژ، وەرزەکان، رۆژەکان...، بەڵام زەمەنی چەندێتی، کە زەمەنی کاتژمێرییە، لەبەرئەوەی بێ فۆرم و شێوەیە، بۆیە پێناسە ناکرێت و ناناسرێت، وەك شەو رۆژ، یان وەرزەکان...[٣] ململانێی نێوان ئەم دوو زەمەنە لە شێوەی جیاجیا لە ژیاندا ئامادەگی هەیە، ژیانی مامۆستایەك جیاوازە لەگەڵ ژیانی وەرڤێر و جوتیارێك، ژیانی کرێکارێك کە رۆژانە دەست هەق یا کرێ وەردەگرێت، جیاوازە لەگەڵ ئەو

---

١ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٧٢

٢ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٧٢

٣ نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ل ٤٧٣

فەرمانبەرەی کە مانگانە مووچە وەردەگرێت، ژیانی ئافرەتان جیایە لە هی پیاوان، ژیانی شارنشینان جیایە لەگەڵ گوندنشینان[1].

لە روانین و تێبینیکردنی ئەم شتانە بە روونی و ئاشکرایی ناکۆکی لە نێوان زەمەنی چۆنیەتی و زەمەنی چەندێتی، دەردەکەوێت. ئەم ململانێیە نێوان ئەم دوو زەمەنە، تەنها پەیوەست نییە بە رابردوو، هەرچەندە سەدەیەك زیاترە کە زەمەنی چەندێتی، لە میانی بەرجەستەبوونی لە داموو دەزگاکانی حکومەتاندا سەرکەوتەوە بەسەر زەمەنی چۆنیەتیدا[2]. ئێستا لە هەموو شوێنەکاندا تاکەکان ناچاردەکرێن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ رێکخستنی زەمەنی ئەرکە فیزیۆلۆژیەکان و چالاکی هەستی- جووڵەیی رێکبخەن و ئیقاع و ریتمە عەفەوی و کەسایەتیەکان ببەستنەوە بە خێرایی رێکخراوی خودی ئامێرەکان لەهەموو چرکە ساتێکدا[3].

دەشێ چارەسەری ئەم ململانییە بکرێت، لە رێگەی نۆرە و لە جێدانان لە نێوان زەمەنی چەندێتی، بە گوێرەی بەرنامەدارێژتن، وەك لە بواری بیناسازی و پیشەسازی کە پەیوەستە بەکار، لە گەڵ زەمەنی چۆنییەتی کە پەیوەستە بە سروشت یان ئەو شتەی کە تەمسیلی سروشت دەکات، کە ئەمەیان پەیوەست نییە بە قازانج.

رێکخستنی زەمەن بۆ کردار و رەفتاری جەستەیی تاکەکان- ژیانی کۆمەڵایەتی، خاسیەتێکی گەوهەری مێژووی زەمەنە. بەش بەشکردن لە نێوان چۆنیەتی و چەندێتی، کە دەخرێتە یان دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ژیانێك، یان ساڵێك یان رۆژێك، لەگەڵ بەرجەستەکردنی مایەکی لە سنورێکی جیاواز لە شوێندا[4].

بە کورتی، بیرۆکەی زەمەن بۆ هەموو تاکێك وەك بەرهەمی مێژوو دەردەکەوێت و هیچ شتێك تیایا بەخشراو نییە، هەموو شتێك کردنەوەیە و لە میانی پەرەسەندنیدا لە نوێدەبێتەوە. ئەم شتە چەسپاو و جێگیرە سەبارەت بە زەمەنی چەنێتی[5].

---

١ هەمان سەرچاوە — ل ٤٧٣

٢ هەمان سەرچاوە — ل ٤٧٣

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٤٧٤

٤ هەمان سەرچاوە — ل ٤٧٥

٥ هەمان سەرچاوە — ل ٤٧٨

له زانستی تۆمارکردنی کات لەلایەك، بۆ زانستی پێوانەی کات لەلایەکی دیکەوە، لە نێوان زانستی مێژوو و کرۆنۆزۆفیا، کە ناوەڕۆکیان دەگۆڕدرێت بە گوێرەی نزیکبونەوەی هەردووکیان لەم دوو جەمسەرە، گرفتی پەیوەندی زەمەنی چۆن یەتی و زەمەنی چەندێتی، چەقی رێکخەری گشت وردەکاریەکانی پێشوو پێکدێنێت[1].

ئەم دوو دەستەواژەیە: زەمەنی چۆنیەتی و زەمەنی چەندێتی، ئاماژەن بۆ هەردوو لایەن و خێزانەکەی زەمەن، یەکەمیان تەمسیلی، زەمەنی مێژوو، زەمەنی دەروونی، زەمەنی هەتاوی، زەمەنی سرووت و سیاسەت، دەکات. کەچی دووەمیان پەیوەستە بە، چرکە زەمەنی ئاسایی کاتژمێرەکان[2].

رازیبوون بە حەقیقەتی ئەم دوو خێزانەی زەمەن، بەڵگەی ئەوەن کە ئێمە دان بە گریمانەی فرەزەمەنی دەکەین: پێویستە لەسەرمان لە پشت ئەم فرەیەدا، زەمەنێك بدۆزینەوە، کە زەمەنی تاك و حەقیقی بێت، کورت نەکرێتەوە. گریمانەکردنی زەمەنێکی لەم جۆرە، کە بە تەواوی روون نییە و بە رێگایەکی ئاشکرا بەهانەی بۆ نەکراوە.

هەروەك چۆن داهات و رووداوە کۆمەڵایەتیەکان کورتناکرێتەوە، بۆ کارلێکردنی بەشە بەراییەکانی، بە هەمان شێوەش زەمەنی مێژوو کورتناکرێتەوە بۆ زەمەنی میکانیزمی چەندێتی، یان بۆ زەمەنی بیۆلۆژی بە رێگایەکی فەلسەفی و زانیاری[3].

لەلایەکی دیکەوە، لە نێوان زەمەنە جیاوازەکاندا، بە تایبەتی چۆنیەتی وچەندێتی، پەیوەندیەکی چۆنیەك لە نێوانیاندا نییە. چ لە ژیانی دەروونی و فیکریدا یان لە رێکخستنی کۆمەڵایەتی و سروشتیدا، لە راستیدا تێبینی ئەوە دەکەین کە هەندێك دەزگا و رێکخراوی زەمەن پەیوەستن بە هەندێك دەزگای دیکە.

شیکردنەوەی ئەم پەیوەستبوونە وامان لێدەکات، تێبینی ئەوە بکەین کە هەر فرە زەمەنیەك وەك بونیادێکە لە چەند چینێك پێکهاتبێت، کە ئەوەی خوارەوەیان مەرج بێت بۆ ئەوەی سەرەوە[4].

---

١ هەمان سەرچاوە — ل ٥٠٥

٢ هەمان سەرچاوە — ل ٥٠٦

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٥٠٦

٤ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٢

کەواتە بابەتی (زەمەن) ڕێکخستنی چەند گۆڕانکارێکی حەقیقین، وێناکراوە و جێبەجێکراوە، لەلایەن دەزگایەکەوە، کە بۆ ئەم مەبەستە ئاماژە یان دەلالەت بەرهەمدێنێ.

مرۆڤێك هەموو شتێك لەیەك (ئان) و ساتدا لە پێشیدا ئامادەبێت، هیچ بیرۆکەیەکی لەمەڕ زەمەن نابێت، لەبەرئەوەی هەموو تەنسیقێك بۆ گۆڕان لای ئەو نامۆ دەبێت. بەڵام کەسانی دیکە بەکۆتادێن، لێرەوە زەمەن بەدی دەکرێت، کە ڕێکخەر و موتەناسیقە[1].

هەروەها زەمەن وەك ڕێکخستنی چەند گۆڕانکارییەك، بریتیە لە کۆمەڵگەلێك پەیوەندی چەندێتی و چۆنیەتی، کە نابینرێ و چاودێری ناکرێت، بە پێچەوانەی دەستەی تەنسیق بینراوبێت و شیاوی تێبینیکردن بێت، هاوشێوەی ئەو گۆرانکاریانەی کە تەنسیقدەکرێن.

کەواتە سروشتی پەیوەندیەکانی زەمەن، تەریبە لەگەڵ جۆرێك لە سەربەخۆیی لەئاست بابەتەکان[2]. ئەم سەربەخۆییە سەبارەت بە بابەتەکانی سروشت حەقیقی و ڕاستەقینە نییە، مەگەر تەنها حەقیقیە کە بەرچاوبێت و خێراییەکەی بچوك بێت، بەر بەراورد بە خێرایی تیشك.

لە ڕاستیدا ئەم گوزارشتانە، ئاماژە بۆ نزیکایەتی نێوان هەموو گۆڕانەکان دەکەن، کەوا گریمانە دەکرێت کە ئاراستە کراوە بەرەو حاڵەتی کۆتایی، هەروەها بیرۆکەی یەك ئاراستەیی زەمەن ڕەوایە، ئەگەر دەرکەوت و سەلماندرا کە ئەو گۆڕانکاریانەی ڕوویانداوە لە ناو چوارچێوەی یەك بەدوایەکهاتنێکی دیاریکراو بووە. ئێمە ڕوبەڕووی یەك ئاراستەیی دەبینەوە، کە بەم جۆرەش خاسیەتی پەیوەندی بەدوایەکهاتن لە نێوان چەند گۆڕانێك، یان چەند بەشێکی خودی گۆڕانەك دەردەکەوێت[3].

بە گوێرەی بەرنامەیەك کە پێشتر بە شێوەیەکی ورد ئامادەو داندراوە. دەکرێ بڵێین، زەمەن کۆمەڵگەیەکی تەواوە لەو جۆرە ڕێکخستنە جیاوازانە، بە هۆی سروشتی ئەو دەزگایانەی کە داندراون و شێوازی کارکردنییان و ئەو بەرنامەی کە پەیڕەوی دەکات. هەروەها ئەو گۆڕانکاریانەی کاریان لێ دەکات. هاوشێوەی ئەو پەیوەندیەی کە لە نێوان زەمەن و مۆسیقادا هەیە، کاتێك کە تیپێکی مۆسیقا پارچە مۆسیقایەك لێ دەدن یان دەژەنن و سەرۆکی تیپەکە تیایدا ڕۆڵی ڕێکخەر دەبینێ، سەرەتا ئاماژە بۆ دەستپێکردن، دواتر ئامێرە

---

١ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٤

٢ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٠

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٥١١

مۆسیقیەکان یەك لە دوایەك یان بە تەزامن و هاوکاتی دەیانوەستێنێت. هەمان ئیقاع و ریتم بەسەر هەموویاندا دەسەپێنێت، هەروەها بەرزی و چڕی دەنگ تەحدید و دیاردەکات، لە هەستان و دابەزینی دەنگەکاندا[١]. کەواتە ژەنین و کارە مۆسیقیەکە، زەمەنێکی بەخشندەو پێدراوە، لە ژێر پەردەی دەنگە دەرکپێکراوەکان. بەم جۆرە بەرنامەیەکی دەرەکی لەسەر خودی ژەنینەکە جێبەجێدەکرێت، چونکە پێشتر مۆسیقایەکە پێشتر بەرهەمهێنراوە.

حەقیقەتی زەمەنی پێکهاتنی هەبوونی دەگەڕێتەوە بۆ دەزگای رێکخەری خولانەوە، کە بەرنامەکەی خۆی جی بەجێدەکات، ئەمەش بە هۆی ئەو ئاماژانەی کە دەبینرێت. دەرکەوتنی بەدوایەکهاتنی شێوەکان لە میانی پەرەسەندنی پێشکەوتنی بوونەوەرێکی ئەندامی[٢].

تاکو ئێستا زانیاریمان سەبارەت بەرنامە و ئاماژەکان کەموکورتی تیادایە، بەڵام گومانی تیادانییە، کە ئەم بابەتە شیاوی تێبینیکردنە. لەم حاڵەتەدا دەپرسین، زەمەنی مێژوو دەبێ چۆن بێت؟ ئایا دەزگایەك هەیە تەنسیق لە نێوان رابردوو و ئێستا و داهاتوودا بکات، بە گوێرەی بەرنامەیەك کە پێشتر داندرابێت، کە پەیوەندیەکەی لەگەڵ مێژوو هاوشێوەی پەیوەندی نێوان سەرۆکی تیپی مۆسیقا و ژەنینی پارچە مۆسیقایەك بێت[٣].

لە سەردەمەکانی پێشوودا بە ئەرێنی وەڵامی ئەم پرسیارە دەدرایەوە، هەروەها لاهووتی مێژوو دەزگایەکی رێکخراو و رێکوپێکی لە بەرنامەی خودا دا ئەبینیەوە، یان لە سروشتدا.

ماوەیەکی زۆر مرۆڤایەتی باوەڕی بەم جۆرە روانیین و باوەڕانە هەبووە، کە مێژوو لە ناواخنیدا تەماهی دەکات لەگەڵ پێکهاتنی (مۆرفۆلۆژی). ئەگەر گریمانەی زانینی دەزگای رێکخەر بکەین، ئەوا ئەو کاتە دووبارە پێکهێنانی بەرنامەی جێ بەجێکار دەبێت مەبەست، کە شوێنی هەنووکە لە کۆی رەوتی جۆری مرۆڤی دیاردەکات، کە ئەمەیان مایەی تێرامان بووە و پەیوەست بووە بە زەمەنی هەمەکی و گشتی مێژوو: تۆبۆلۆجیاکەی، ئاراستەکەی، دابەشبوونی بۆ چەند قۆناغێك[٤].

---

١ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٠

٢ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٢

٣ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٣

٤ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٣

هەروەها دەزگایەکی ڕێکخەر بە گوێرەی بەرنامەیەك کاردەکات، ئەمەش مانای وایە، بوونی شتێکی جێگیر و سابت وادەکات زەمەن شیاو و مومکین بێت، وەك بەرنامەی بۆماوەیی لە حاڵەتی پێکهێنانی مۆرفۆلۆژی یان یاساکانی فیزیا لە بواری زانیاریدا. بەڵام ڕەنگە هەموو بەرنامەیەك خۆی وەك شێوەی پارچە هێلێك پێشکەش بکات، کە گشت توخمەکانی بەیەك جار پێدراو یان داندراون و دەزگای ڕێکخەر ئەم پارچانە دەکاتە زنجیرەیەك کارو پرۆسە، بۆ ئەوەی لەسەری بڕوات، هەر وەك چۆن دەرزی خوێندنەوە (فونۆگراف) بەسەر شریتی موگناتیزیدا دەڕوات، بە گوزارشتێکی دیکە، هەموو دەزگایەکی ڕێکخەر بە کۆتایە(متانهیە) بە شێوەیەکی هاوجۆر، گۆڕانکاریەکان خێراییەکی بێ کۆتایان هەیە، ئەگەر وانەبێت ئەوا گۆڕان نابێت[1].

١ هەمان سەرچاوە — ل ٥١٤

# بەشی دەیەم

## (زەمەن لە دنیای ئەدەبیاتدا)

زەمەن هەمیشە بابەتێك بووە جیگا و مایەی بایەخ پێدانی، نەك تەنها فەیلەسوف و فەلەكناس و زانافیزیاویەكان بووە، بەڵكو زۆربەی توێژەكانی كۆمەڵگە لە زۆربەی سەردەم و شوێنێكی جیهاندا گرنگی یان پێداوە، لەوانە نووسەر و شاعیر و رۆمانووسەكاننیش گرنگی یان پێداوە، تەنانەت زەمەن بۆتە یەكێك لەبابەت و كێشە فەلسەفیە سەرەكیەكانی دنیای ئەدەب، واتە زەمەن یەكێك بووە لەو بابەتانەی كە لە هەموو سەردەمەكاندا مێشكی زانا وفەیلەسوفەكانی خەریك كردوە، ئەدیبەكان ئەم چەمكەیان وەرگرتووە و لە چیرۆك و رۆماندا بەكاریانهێناوە، فاكتەری كات و شوێن كاردەكاتە سەر بونیادی بیرۆكەی چیرۆك و چۆنیەتی گێڕانەوە و داڕشتنی یەكەكانی ئەم پێكهاتە هونەریە، بێگومان ئەمەش پەیوەستە بە لایەنی سایكۆلۆژی و ئەبستمۆلۆژی نووسەرەوە. توانا شاراوەكانی مرۆڤ لە دەقی ئەدەبیدا بەرجەستەدەبن، بە بێ ئەوەی مرۆڤ لە ژیانی ئاساییدا توانای ئەو كارو دەسەڵاتانەی هەبێت، مرۆڤ لە دەقی ئەدەبیدا دەتوانێ گفتوگۆ لەگەڵ هەر بوون و كەسایەتی و هەر شتێكدا بكات و ئەو ئاخاوتنانەش هاتنەگۆی ئارەزووە كپكراو و مەیلەخەفەكراوەكانی مرۆڤ دەنوێنن.

بە شێوەیەكی گشتی لە چیرۆك و رۆماندا دوو جۆرە زەمەن هەیە، زەمەنی ناوەكی (دەرونی) و زەمەنی دەرەكی، كاری ئەدەبی لە خودی خۆیدا بریتیە لە درێژەپێدان و لەگەڵ رۆیینی جیهانی دەرەكی

و هاوشێوەی بونی دەرەکییە، بۆیە زەمەن لە رۆماندا زەمەنێکی بچوکراویی زەمەنی بوون یان دەرەکی یە، هەندێك کەسایەتی نێو رۆمانەکان زەمەنی خۆیان دەخەنە سەر زەمەنی ئێمە، هەمیشە لە چیرۆك و رۆمانەکاندا هەست بە بەسەرچون و تێپەڕینی رووداوەکان دەکەین لە زەمەندا، هەروەها هەست بە درێژەکێشانی زەمەن دەکەین بۆ گەیشتن بە چرکەساتیرۆشنی و کۆتاییەکی ئاسوودە و کامەران، هەندێك رۆمان هەیە گوزارشت لە جووڵەی زەمەنی دەرەکی دەکات لە میانەی خستنەرووی وردەکاریەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵك و واقیعی ژیان، بەلاّم چەمکی زەمەن لای ئەونووسەرانەی چیرۆك و رۆمانی ئەندێشەیی و خەیاڵی زانیاری دەنووسن، مانا و چەمکێکی جیاواز و نوێی وەرگرت[1]، رۆمان و چیرۆکی خەیاڵی زانیاری، یەکێکە لەو هاندەرە بنچینەیانەی کە خەیاڵی مرۆڤ قووڵ دەکەن و دەرگای چەند جیهانێکی سەرسوڕهێنەری ناواقیعی بۆ دەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چیرۆکانە وادەردەخەن کە دەشێت ئەو جۆرە دیاردە سەیرانەی وەك گەشتکردن بە زەمەندا و گەڕانەوە بۆ رابردوو یان ئایندە، رووبدەن(بێنەکایەوە)، نەك ئێستا بەڵکو لە دوارۆژدا، لەوەتەی مرۆڤ هەستی بە پێویستی لاساییکردنەوەی واقیع کردوە، بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی سروشت و زەمەن، فڕین و دۆزینەوەی جیهانەکانی تری کردوە بە خەونێك بۆ خۆی، ئەو جیهانە نەزانراوەی کە دەشێت  لە بۆشایی ئاسماندا یان لە هەسارەکانی دیکەدا بێت، مرۆڤ وزەیەکی سەیر و فراوانی  لە خەیاڵکردندا هەیە، هەروەها توانایەکی سەرسوڕهێنەری ئەوتۆی لە خەون بینیندا هەیە، کە هەندێك جار دەبێتە هۆی شپرزەیی[2].

کەواتە خەیاڵی زانیاری یانە هاندەرێکە بۆ مرۆڤ لە پێناو زانینی دوارۆژەکەی خۆی، هەندێك چیرۆك هەن لەسەر گریمانێکی زانیاریانە دامەزراون، ئەگەر نەش هاتبنە دی، ئەشێت بێنەدی، وەك گریمانەی چوونی مرۆڤ بۆ هەسارەکان و گەشتکردن بە زەمەندا، بۆچی نەتوانیین گوزەر بکەین بە زەمەندا، هەروەك چۆن گوزەر دەکەین بە (شوێن)دا لە سەدەی ١٧ هەمی زایینیدا لە فەرەنسا، نووسەرێك دەرکەوت ناوی (سیرانۆدی بیرجراك) بوو، وای بە خەیاڵدا هات  کە چەند پیاوێك لە بۆشایی ئاسماندا لە کەشتیەکدا دەفڕن. لە راستیدا چیرۆکی  خەیاڵی زانیاری رێگەیەکە لە رێگاکانی بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژی مرۆڤ و هەندێك پێشبینی تێدایە دەربارەی چارەنووسی مرۆڤ[3].

---

١ مجلة الثقافة الاجنبية- عدد، الاول، سنة العاشرة- بغداد - ١٩٩٠- ل ٤٨

٢ رۆشنبیری نویَ –ژ-١٠٩- ل ٢٠٤

٣ رۆشنبیری نویَ –ژ-١٠٩- ل ٢٠٦

سەرەڕای ئەوەش چیرۆکی خەیاڵی زانیاری، رەنگێکە لە رەنگەکانی ئەدەب، رەوشت و مەرجی تایبەتی ئەوتۆی هەیە کەلە نووسینە ئەدەبیەکانی ترجیای دەکەنەوە، نوسەری چیرۆکی خەیاڵی زانیاری پرسیار دەکات و دەڵێت (ئایا مرۆڤ چی بەسەر دێت ئەگەر فلانەشت روویدا؟). دیارترین بەهرەشیان ئەوەیە کە دەتوانن بە خەیاڵ بە نهێنیەکانی پاشەڕۆژدا گوزەربکەن، هەروەها مێشکی دەخاتەکار و پێشبینی ئەو هەندێك کار دەکات بەر لەوەی روویدات. هەرچەندە ئەو بابەتانەی کە چیرۆکی خەیاڵی زانیاری باسیان دەکات دەکەوێتە دەرەوەی ماوە یان کایەی زانستی ئێمە، یان دەشێت بکەوێتە ناو ئەم کایەوە و رووداویشی دوورنەبێت. دەشێت وێنەی پاشەرۆژ، بە شێوەی هەمەڕۆ بە پێی گۆڕانی نووسەر،بکێشرێت، دەبێت نووسەر ئەوەندە بەهرەی هەبێت کە خەیاڵەکەی خۆی لە شێوەی هەستپێکراودا دابڕێژێت، تەنها بەمە خوێنەر قایل دەبێت وباوەڕ بە شیانی هاتنەدی رووداوەکانی بکات و لە چارەنووسی مرۆڤی پاشەرۆژ وردبێتەوە[1].

یەکێك لەو نووسەرانە (هەربرت جۆرج ویلز ١٨٦٦- ١٩٤٦) کە لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا بایەخێکی زۆری بە زەمەن و خاسیەتەکانی داوە و لە رۆمانەکەیدا کە بە ناوی (ئامێری زەمەن)ە گریمانەی نوێی سەبارەت بە زەمەن خستەڕوو، وەك گریمانەی گەشتکردن بە زەمەندا، بوونی زەمەنی جیاواز لە بۆشایی ئاسماندا، هێواشبوون و لەتبوونی زەمەن، ویلز لە رۆمانی (ئامێری زەمەن)دا باس لە پیاوێك دەکات کە داهێنانێکی داناوە و بە هۆیەوە توانی سەفەر و گەشت بکات بە زەمەندا، هەم بۆ داهاتوو و هەم بۆ رابردوو) لەم رۆمانەدا ویلز ئەندێشەو خەیاڵی خۆی بەکارهێناوە بۆ وێناندن و گێرانەوەی چیرۆکی نائاشنا و نامۆ و ئەوە پیشاندەدات کە ئەو زەمەنانەی خاوەن ئامێرەکە گەشتی بۆکردوە زۆر جیاواز بووە لە جیهانی ئێمە[2]. ئەمە گریمانانە رێخۆشکەبوو بۆ نوسەرانی دیکە و کاریگەری لەسەریان هەبوو، کە لە دوای ویلز هاتن وەك (براد بری، ئەرسەر کلارك، جۆر فێرن، مارك توین) ئەمانەش لە چیرۆك و رۆمانەکانیاندا سەبارەت بە زەمەن، هەنگاوی زیاتریان نا، کە تیایدا پاڵەوانی رۆمانەکانیان سەفەر دەکەن بۆ رابردوو، یان وێناندنی زەمەنی دیکە کە جیاوازە لە زەمەنی ئێمە.

(مارك توین) ی رۆماننوسی ئەمریکی لە ژێر کاریگەری ویاز، رۆمانێکی بە ناوی (مرۆڤێکی ئەمریکی لە کۆشکی شا ئارسەر) نووسی، کە باس لە پیاوێکی رۆژئاوای ئەمەریکا

---

١ رۆشنبیری نویٚ –ژ-١٠٩- ل ٢١٠

٢ (الخيال العلمي، ادب القرن العشرين) – محمود قاسم- میسر- ١٩٩٣ –ل٤٥-٤٦

دەکات کە بە سواربوونی ئامێری زەمەنەوە، سەفەر دەکات بۆ رابردوو بۆ سەردەمی شا ئارسەر[1] . مارك توین لەم رۆمانەدا پەیوەندیەك لە نێوان ئێستا و رابردوو دروست دەکات، واتە هەردووکیان پێکەوە دەبەستێتەوە. هەروەها چیرۆك نووس (جاك فینی) لە چیرۆکی (روخسار لە وێنەدا) بابەتی بەهای گواستنەوە لە زەمەندا باس دەکات، پوختەی چیرۆکەکەش ئەوەیە کە زانایەك ئامێرێك دادەهێنیت و بە هۆیەوە دەتوانێت مرۆڤ بۆ سەردەمە کۆنەکان بگوازێتەوە، بە تایبەتی بۆ گواستنەوەی تاوانبارە ترسناکەکان) بە گوێرەی ئەم چیرۆکە زەمەن وەك شوێن کراوەیە و مرۆڤ دەتوانێت بە ئارەزوی خۆی هەر کات و زەمەنێکی بوێت بۆی بچێت.

تەنها نووسەرانی بواری خەیاڵی زانیاری بایەخییان بە زەمەن نەداوە، بەڵکو نوسەر و رۆماننوسەکانییش لەسەر ئەم بابەتەیان نووسیوە، لەوانە (مارسیل پرۆست) و لە رۆمانی " گەڕان بەدوای زەمەنی ونبوو" و "جی،بی، بریستلی" لە کتێبی (زەمەن)، بەڵام زەمەن لای "تی سی ئیلیۆت" و "جیمس جۆیس" مانا وچەمکێکی دیکەی پێدرا.

زەمەن لە رەهەندەکانی دەقی شیعریی وەکو پڕۆسەیەکی مەعریفی بەکاردێت کە لەودیو ئاگایی و مانا سادەکانەوە، پێوەندییەك لە نێوان ئێمە و واقعیەتی رەهادا بەرجەستەدەکات.

بابەتی (رەوتی زەمەن) بەروون وئاشکرا لە کارەکانی ئیلیۆت دا بەرچاودەکەوێت بە تایبەتی لە (وێرانە خاك)دا، بیرۆکەی زەمەنی رێژەیی و فەزا لە شیعری ئیلیۆتدا بە تایبەتی لە شیعری (وێرانە خاك)دا بۆتە بابەتێك بۆ راڤەکردنێکی ئەدەبیانە، کە لە میانی شیعرەکانیدا باس لە رێژەیی کەسایەتیەکان دەکات، کە لە گۆڕانێکی هەمیشەییدان، رابردوو خۆی دەخزێنێتە ئێستاو خەڵك لە یەك کاتدا لە ئێستا و رابردووی دوور و داهاتوودا دەژین، ئیلیۆت چەمکی رێژەیی زەمەن بە رێسایەکی سەرەکی دادەنێت، کە بە گوێرەی ئەم رێسایە چارەنوسی هاوبەشی مرۆڤەکان لە سەردەمە جیاجیاکاندا دەردەکەوێت[2].

لە راستیدا هەموو ئەو ئاماژانەی کە دەلالەت لە تێگەیشتنێکی نوێ بۆ زەمەن دەکەن، لە رۆمانی (یۆلیسز) ی جیمس جۆیسدا رەنگی داوەتەوە و گوزارشتی لێ کراوە.

لە یۆلیسز دا، جیمس جۆیس بەردەوام جەخت لەوە دەکاتەوە کە زەمەن و بۆشایی ئاسمان، دوو چەمکی رێژەیین و رابردوو وئێستا پێکەوە لەیەك کاتدا بوونیان هەیە و هەست پێ دەکرێ، ئەوە نەك

---

١ (الخيال العلمي، ادب القرن العشرين) — محمود قاسم- ميسر- ١٩٩٣- ل ٥١

٢ سقوط الحضارة- كولن ولسن- ترجمة، انيس زكي- بيروت- ط١ -١٩٧١ —ل ١٧٦

تەنها لە ئەندێشە و عەقلی کەسایەتیەکاندا، بەڵکو لە دیمەنەکانی ڕۆمانەکەشدا، بۆیە زەمەنی باو وتەقلیدی لە ڕۆمانەکەدا فراوان دەبێت، هەروەها هەندێك ار کەسایەتیەکان لە یەك کاتدا لە ئێستا و ئایندەدا دەژین، بۆیە دەکرێ بڵێن کە هەمووشتێك لە یۆلیسزدا لە وولە و گۆڕانی ئەبەدی دایە.

لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا، چەندین ڕۆمان و چیرۆرك سەبارەت بە زەمەن وفەزا دەرچوون، لەوانە ڕۆمانی (کۆتایی نەمری) کە لەلایەن (ئیسحاق ئەسیمۆف) نووسرابوو، لەم ڕۆمانەدا پاڵەوانەکە سەفەر دەکات بە زەمەندا- بەرەو ساڵی (٣٠٠٠) دواتر بۆ ساڵی (٥٠٠٠) هەروەها سەفەر دەکات بۆ رابردوو- بۆ ساڵی (٥٧٣) ز — بۆ سالی(٣٠٠) ز . و سەفەرەکەی بە کەشتیەکی ئاسمانی ئەنجامدەدات کە دەتوانێت لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا بەرەو داهاتوو یان رابردوو بڕوات. زەمەن لە ڕۆمانەکەدا، لە ئاکامی ئەوەیە کە ڕەوت و وولەی زەمەن یەك ئاراستەی هەیە، بەڵام خێراییەکەی جیاوازە. لە میانی ڕۆمانەکەدا (هارلان) کە کەسایەتیەکی ناو ڕۆمانەکەیە لە خۆی دەپرسێت: (ئایا دەتوانین زەمەن بوەستێنین، یان پێچەوانەی بکەینەوە؟؟)[1]

بێگومان زەمەن بە یەکێك لە دیارترین سیفەتەکانی دراماش دادەنرێت، هەروەها بە یەکێك لە پایە گرنگەکانی دراما دادەنرێت، کە بە سروشتی خۆی بەرەو چڕکردنەوە و خەزنکردن دەچێت، ناوەڕۆکی ڕووداوی دراما لە ڕێی زەرورەتی دۆزینەوەی ساتی ڕووداوی ئێستا دیاری دەکرێت، کە درێژبونەوەی زەمەنەکانی رابردوو و ئێستایە. دەکرێ بوترێت هەموو دەقێکی شانۆیی دەکرێت یەکەیەکی زەمەنی بۆخۆی دابهێنێت. زەمەن لە درامادا لە گەڵ قەرینەزەمەنییەکاندا لە گێرانەوەی کۆن و چیرۆك و داستاندا وا دەداتە پاڵ گوایە" گێڕانەوە، چیرۆك، داستان" چەند هونەرێکی جوولاون لە زەمەندا ڕوودەدەن، بەڵام دراما لەوان جیاوازە، چونکە زەمەنی تر لەخۆدەگرێت کە زەمنی نمایشە، کە بارودۆخی دەرهێنانی کاری شانۆیی و جۆری ئەو ریتمەی دەرهێنەر هەڵسوکەوتی پێدەکات دیاری دەکات. ڕێکخستنی زەمەنی دراما بەدواهاتنی ڕەهای ئێستایە، تێیدا تەنیا ئەو ساتە دەردەکەوێت، کە ڕوەو داهاتووئاراستەیە و خۆی تێکشکاندوە بۆ بەرژەوەندی ساتی داهاتوو. بەو پێیەی هونەری شانۆ هونەری تەرکیز خستنەسەر و چڕکردنەوە و دەست پێوەگرتنە، ئەوە گرنگی پێدانێکی زیاتر دەخوازێت لە بەکارهێنانی زەمەن.

جۆرەکانی جووڵەی زەمەنی دراما: لە چەند قۆناغێکی زەمەنی جیاوازدا لە گەشەکردنی مێژووی دراماوە لە جیهاندا، دەکرێ ئەم زەمەنانە جیابکەینەوە:

---

١ مجلة الثقافة الاجنبية- عدد، الاول، سنة العاشرة- بغداد - ١٩٩٠- ل ٥٤

جووڵەی زەمەنی ئەفسانەیی: ئەمە جووڵەیەکی زەمەنیە لەسەر بنەڕەتی بەدواداهاتنی جەبرری بونیاد دەنرێت، ڕووداوەکان پێکەوە گرێ دەدات بە پێی مەنتیقی هۆکاری کە بە توخمی تراژیدی دەستپێدەکات و هەر بەویش کۆتایی دێت، ئەمەش جووڵەیەکی زەمەنی بازنەیی دووبارەیە، بێگومان ئەم جۆرە لە جووڵەی زەمەن زاڵە بەسەر تراژیدیای کلاسیکی و نوێیەکاندا، دەسەڵاتی رابردوو لەشانۆگەریە کلاسیکیەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی دا هەمیشە باوەڕ وابووە کە زەمەن و کاتی رابردوو ماناکانی پاڵەوانیەتی و ڕێز لێ گرتن و لەخۆدەگرێت کە مایەی شانازییە، بەڵام ئێستا ناتوانێت مانا پیرۆزە بە ڕێزەکانی رابردوو بدات بە دەستەوە[١].

## جووڵەی مێژووی زەمەن:

ئەمەش جووڵەیەکی زەمەنی پاڵ پێوەنراوە و هیچ بوارێکی تێدا نییە بۆ گەڕانەوە، چونکە تێیدا ناکرێت بگەڕێیتەوە بۆ رابردوو، ئەم جۆرە تایبەتمەندیە بە شانۆگەریە مێژوویەکانەوە کە لە میانیدا چەند ڕووداوێکی وانمایش دەکرێت کە لە رابردوو ڕوویانداوە، کاتی رابردوو لێرەدا ڕۆڵی کاریگەری خۆی دەبینێت لەسەر ئێستا. جووڵەی زەمەنی بەوەهم کردن:

ئەمە جووڵەیەکی زەمەنیە دەیەوێت ئەوە بکات بە وەهم کەزەمەنی ڕووداوەکان زەمەنی ئێستایە، لە کاتی نمایشدا هەستێك دروست دەکات کە گونجانێکی وەك یەکی هەیە لە نێوان ئەوەی خەیاڵی بە "بەدیهێنراوە" و لە نێوان ئەوەی کە واقیعە "راستەقینە"یە، ئەم جووڵە زەمەنیە لە شانۆگەریە رۆمانسی و و واقیعیەکاندا زۆر باوە، و رۆمانسیەت ڕێز لە ئیستای مرۆڤ و کار و یست و خودی مرۆڤ دەگرێت، نرخ بۆ بەها بۆماوەکان و رابردوو دانانێت و رابردوو بە کاتێکی مردوو دادەنێت کە کاریگەری نییە لەسەر ئێستای کەسەکاندا[٢]. زەمەن لە شانۆگەری رۆمانسیدا بە مرونەت جیادەکرێتەوە، چونکە لە حالەتەکاندا دەکرێت بگوازرێتەوە "واتە چەند ساڵێك تێپەر دەکات لە دیمەنێکەوە بۆ دیمەنێکی تر" و دەکرێت تێبینی ئەمە بکرێت لە شانۆگەریەکانی "هرنانی، کرۆمول" ی فیکتۆر هۆگۆ و "دزەکان"ی شیللەر.

١ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢- ل ٢٣

٢ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢- ل ٢٤

## جووڵەی ناوەهمی:

ئەمەش ئەو زەمەنەیە کە جیاوازی نێوان زەمەنی خەیاڵی و زەمەنی راستەقینە وەرگرتنی ئێستا دروستی دەکات، یان جیاوازی دەکرێت لە نێوان ئەوەی لە رابردوودا رووبدات و ئەوەی دەکرێ لە ئێستادا رووبدات، چاکترین کەسێك ئەمەی بەکارهێنابێت "برتولد بریخت"ە لە شانۆگەریە داستانەکانیدا، شانۆگەری تەعبیریش بە زەمەنی ناوەهمی بەستووە لە رێی یاوازی نێوان جووڵەی کردار و گواستنەوەی لە چەند ئاستێکی زەمەنی جیادا، چەند ساتێك هەن زەمەن بە تەواوی تێیاندا دەوەستێت، پاشان بە دوایدا چەند ساتێکی تر دێن بە خێرایی چەند ساڵێك خەزن دەکەن[١].

هەرچەندە مرۆڤ لەگەڵ داهێنراوەکانی ژیاری هەڵسوکەوت دەکات، ئەم کارە درزێکی گەورەی دروستکردوە لە ناو مرۆڤدا وای لێ کردوە دابڕێت لە ئێستای و رابردوو لەبیر بکات و لە داهاتووش بترسێت، لەبەر ئەوە مرۆڤ تەرکیزی خستۆتە سەر خۆی و بەرووی خۆیدا کراوەتەوە بەوە کە کات ناتوانێت رزگاری بکات لەوەی تێیدایەتی، لەبەر ئەوە دەستی کردوە بە خەون بینین، ئەمە بە روونی لە شانۆگەریەکانی (ئیمبراتۆر جۆنز، خواوەندی گەورە براوەن) ی " یۆین ئۆنیل" دا دەبرنرێن.

هەروەها شانۆگەریە عەبەسیەکانیش بە زەمەنی ناوەهمی جیاکراونەتەوە، لەم جۆرە شانۆگەریەدا رۆژەکان لە یەکتری جیاواز نین، داهاتوو دەبێتەئێستایەکی بینراو و خۆی دەداتە پاڵ رابردوو، ئەو ئێستایەش لە رۆژێك لە رۆژەکان داهاتوو بووە، ئەوە دەبێتە رابردوویەکی بێ پیتی مردوو و سوودی نییە، ئەمەش وای لە نوسەرە عەبەسیەکان کردوە کە باوەڕیان بە گرنگی کات و زەمەن نەبێت، بەو سیفەتەی رۆتینی ژیان ئەبیتە هۆی بەردەوامبونی تێپەڕینی کات بە بێ ئەوەی هیچ گۆڕانکاریەك رووبدات[٢]. نوسەرە عەبەسیەکان وای بۆ دەچن، مادەم بەلاّ و نەگبەتیەکان بەدوای یەکدا بەسەر مرۆڤدا دەبارن و هیچ رێگەیەکیش نییە بۆ بەرپەرچدانەوەیان، لەبەر ئەوە زەمەن وەستاوە یان کارا نییە، ئەوەی دەیەوێت دەستی ناکەوێت لەو رابردووەی رۆیشت و ناگەڕێتەوە، لە ئێستاشدا ئەوەی دەیەوێت دەستی ناکەوێت، ئەو داهاتوەش جیهانێکی نادیارە ئەوەی دەیەوێت دەستی ناکەوێت، بەم شێوەیە زەمەن لای ئەمانە وەستاوە یان کارا نییە، لەم بوارەدا دەکرێت بگەڕێینەوە بۆ شانۆگەری (لەچاوەروانی گۆدۆدا)ی "بیکیت" و (کورسیەکان) ی "یۆجین یۆنسکۆ" [١].

---

١ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢- ل ٢٥

٢ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢- ل ٢٦

١ گ. رامان، ژ- ٧٠، ساڵ ٢٠٠٢- ل ٢٧

خۆ ئەگەر زەمەن پێکهاتەیەك بێت لە رابردوو، ئێستا، داهاتوو، ئەوا زەمەنی داهێنان رەهەندی چوارەمیش پێك دێنێت. رابردوو لە سرووتی شانۆییدا بریتیە لە رووداو و کاراکتەرەکان، کە نوسەر دایهێناون، بەڵام ئێستا بریتیە لە بوونی هەنووکەیی ئەکتەر، جگە لەو کەسێتیەی کە لە رابردوو و لە مێژوودا دەینوێنێت. بەم جۆرە ئامادەگی هەنووکەیی ئەکتەر لە چرکەساتی زەمەنی داهێناندا هەر بە ئێستا دادەنرێ، چونکە بونی هەنووکەییان لێرەدا مانای بونێکی دینامیکی تەواوە، واتا هەنووکەیەکی چرکە ساتییە لە رابردوویەکی کەڵەکەبوودا، کەواتە بەردەوامیەك و هەبوونێکی دینامیکی لە نێوان رابردوو وئێستا لە چرکە ساتی داهێناندا هەیە. داهاتووش ئەو پرسیارەیە کە هونەرمەند و نمایشی شانۆیی لە جەماوەری دەکەن، ئەو پرسیارەش پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤ و واقیع و گەردوون و بوونی هەنووکەییەکەوە، کەواتە ئایندەی تەماوی ولێڵ، کە سروتی شانۆیەکە دەیەوێ پەردەی لەسەر دامالێت، هەر ئەو پرسیارە چارەنووسازەیە کە مرۆڤی پەژارە دەیکات.

چرکە ساتی نزیکبوونەوە و ئاوێتەبوونی ئەم سێ کاتە، رەهەندی چوارەمە و ڤالایی داهێنان دروست دەکەن، واتە کاری دەرهێنەر لەوەدا بەرجەستە دەبێت، کە ئەم سێ زەمەن و کاتە لە نێو یەکدا نزیك دەبنەوە و رەهەندی چوارەم خەڵق دەکەن، کە ئەویش رەهەندی داهێنانە.

زۆر جار خودی مەدلولەکانی زەمەن دەبنە کێشە و بنیاتی سەرەکی دەقە ئەدەبیەکان، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە کێشەی دەق لەگەڵ زەمەندا کێشەیەکی دیالێکتیکیی بازنەییە. کەواتە دەقەکان جگە لە زەمەنی راستەوخۆی بەرجەستەکراو، زەمەنی ناراستەوخۆ و شاراوەشیان هەیە و زۆر جار لە دەلالەتەکانی دەقەوە بەرجەستە دەبێت لەلایەکی تریشەوە تێکەڵکردن و تێپەڕاندنی زەمەنەکان لەیەکتردا نووسەر هەوڵ دەدات زەمەنێکی رەهاو جێگیر لە دەقدا بنیات بنێت، بەمەش زەمەنی دەقەکان لە پەیوەستێکی بناغەییدان لەگەڵ ئەو بنیاتەی کەلە ژێرەوەی دەقدا دەجولێ. ئەم بنیاتەی زەمەنیش بنیاتێکی تێکهەڵکێشە و لەیەك ئاستدا ناگیرسێتەوە و بەردەوام لە دەقدا دەلالەتی شاراوە و نوێ دەکەنەوە[1].

هەندێك جار زەمەن لە خزمەتی رەهەندەکانی دەقدا وەك پرۆسەیەکی مەعریفی بەکاردێت کە لەو دیو ئاگایی و مانا سادەکانەوە، پەیوەندیەك لە نێوان مرۆڤ و واقعیەتی رەهادا بەرجەستە دەکات، کەواتە دەتوانین بڵێین، زەمەن لە ئەدەبدا ئەو فەزایە یە بەر لە خولقاندنی لە نەستی مرۆڤدا کاردانەوەی دەچێتە هەستەوە بۆ دۆزینەوەی ئاسەوارێك کە تێیدا بوونی خۆی لە رێی دەقی بابەتییەوە بخاتە گەڕ.

---

١ تیۆری بونیادی شاراوە- نەجات حەمید ئەحمەد- دەزگای ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٨ –ل ٧٤

## ئەنجام:

لە میانی باسکردن و خستەرووی راڤەکردن و لێکدانەوەکانی سەبارەت بە بیرۆکەی زەمەن لەم توێژینەوەیەدا خراونەتەروو. گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

**یەکەم:** مرۆڤەکان بە پێی تێگەیشتن و نیگای خۆیان بۆ زەمەن، هەر یەکەیان راڤە و مانایەکی تایبەتییان بە زەمەن داوە و ناتوانن هەموویان لەسە تەنیا یەك مانا و پێناسە رێکبەکەون، بۆیە دەتوانین بلێین چەمکی زەمەن مانا و دەلالەتی جیاجیای هەیە، لەبەرئەوەی زەمەن لەو بابەتانەیە کە بیرمەندو فەیلەسوفان بۆچون و روانگەی جیاوازیان بۆ راڤە و مانای چەمکەکە هەبووە و هەیە.

**دووەم:** لەم لێکۆلینەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە پەیوەندیەکی پتەو هەیە لە نێوان زەمەن و مرۆڤ و مرۆڤ ناچارە لە ژێر جەبر و کاریگەری زەمەندا بمێنێتەوە و بە بێ بوونی زەمەن مرۆڤ بوونی نییە.

**سێیەم:** مادەم زەمەن بەردەوامە، ئەوا قسەکردن لەسەر زەمەن و باسکردنی هەرگیز کۆتایی پێ نایەت، بۆیە هەرچەندە ئێمە لێرەدا کۆتایی بە باسکردنی زەمەن دێنین، بەڵام ناتوانیین خۆمانی لێ دەرباز بکەین و بیری لێ نەکەینەوە.

**چوارەم:** لە میانی ئەم لێکۆڵینەوەدا بۆماندەرکەوت، کە چەمکی زەمەن وەك هەندێك چەمکی دیکە وەك: (بوون) و (مەعریفە) و (حەقیقەت) چەندین ماناو دەلالەتی جیاوازی هەیە، ئەمەش وامان لێدەکات، کاتێك ئەو نووسینانە دەخوێنینەوە کە سەبارەت بە زەمەن نووسراون، بیرۆکە و ئینتیباعێکمان لەلا دروست دەبێت کەوا ئێمە لەبەردەم دیالۆگ و گفتوگۆیەکداین، لە نێوان چەند کەسێکدا کە لەیەکترتێناگەن، چونکە پەیوەندیەکی تۆکمە وتەواو لە نێوان بابەت و چەمك و وشەکانیاندا نییە و نابینرێت، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر باسی لایەنە جیاجیاکانی بونیادی زەمەن دەکەن، و شێوازی هەر یەکەیان لەباسکردندا جیاواز و ناکۆکە لە گەڵ شێوازی ئەوانی دیکە. بۆیە هەر نوسینێك لەم نوسینانە لەمەڕ زەمەن دەشێ خوێندنەوەیەکی جیاوازبێت بۆ چەمك و بەهای زەمەن.

**پێنجەم:** راستی و حەقیقەتی زەمەن لەسەر حەقیقەتی گۆڕانکاریەکان بونیاد دەنرێت و دادەمەزرێت، کە جیاوازی بە زەمەن دەدات. ئەمەش ئەوە دەردخات کە زەمەن بە بیٚ گۆڕان بوونی نییە، بەو پێیەی گۆڕان جوولەیەکی دیاری تەنە ئاسمانیەکانە و خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەی خۆیدا، شیبوونەوەی هەنێك گەردیلە، مێژووی ولاٚتێك، کەوتنی تەنێك، پێشکەوتنی سیستەم یان رێکخراوێك، گوتنەوەی سروودێکی ئایینی،.. کەواتە گۆڕان مەرجێکی پێویستە بۆ زەمەن.

**شەشەم:** مادەم زەمەن لە گۆڕان، پەیدادەبێت، دەبیٚ ئەو راستیەمان لەبەرچاوبێت، کە یەك جۆرە گۆڕان نییە، بەڵکو چەندین وەچەرخان لە ئارادا هەن، کە پەیوەستن بە زەمەنەوە و کاریگەریان لەسەر نەخشە و ئاراستەی زەمەن هەیە. بۆیە پەیوەندی زەمەن بە جۆراو جۆری گۆرشانەکان شتێکی ئاسایی و باوە، واتە فرە گۆرانەکان، ئەگەر پەیوەست بن بە فشاری شوێنەوە، ئەوا مەرجێکی دیکەی پێویستە بۆ زەمەن.

**حەوتەم:** مرۆڤێك هەموو شتێك لەیەك (ئان) و ساتدا لە پێشیدا ئامادەبێت، هیچ بیرۆکەیەکی لەمەڕ زەمەن نابێت، لەبەرئەوەی هەموو تەنسیقێك بۆ گۆڕان لای ئەو نامۆ دەبێت. بەلاٚم کەسانی دیکە بەکۆتادێن، لێرەوە زەمەن بەدی دەکرێت، کە رێکخەر و موتەناسیقە.

## فەرهەنگی زاراوەکان:

- کرۆنۆلۆژیا: بەدیارخستنی بەروار بە وردی بۆ رووداوەکان بە پێی کاتی روودانیان.

- تۆبۆلۆژیا: زاراوەیەکی یۆنانیە، بە مانای وەسفکردنی پارچە زەویەك و نیگارکێشانی هەموو روخسار وحالەتەکانی زەویەکە دێت، مەبەست(تۆبۆلۆژیای زەمەن)یش وەسفکردنی روخسار وحالەتەکانی زەمەنە.

- ئۆنتۆلۆژی: زاراوەیەکی یۆنانیە لە دوو بەش پێکهاتووە: ئۆنتۆ(بوون) و لۆژی(زانست) کە واتای زانستی بوون دەبەخشێت.

- کرۆنۆزۆفیا (chronosophie) زاراوەیەکی فەرەنسیە، ئاماژە یان دەلالەت لە " چەند پرۆسە و مومارەسە و داهێنانی زۆر جیاواز لەیەك دەکات، لە روانگەی ئاسۆیەکی زەمەنی، هەروەها هێماو ئاماژەیە بۆ هەندێك ئامانجی دیار و بۆ ئەو ئامرازانانەی بە کاردەهێنرێن بۆ دۆزینەوەی داهاتوو. ئەم زاراوەیە جارێك بایەخ بە تاك دەدات، جارێکیش بە گەل، جارێکی دیکە بە مرۆڤایەتی، بەڵام جۆرەکانی کرۆنۆزۆفیا ئاراستە و روویان لە ئایندە کردوە. کە یەکجار دەست دەگرێت بەسەر تەواوی رێڕەوی ئاراستەکان یان مێژوو یان زەمەن.

- کۆتایی مێژوو: واتە گەیشتن بەدوا قۆناخی پێشکەوتن لە مێژوودا.

- پیرۆز: دەخرێتە پاڵ بوونێك لە کەموکورتی تیانەبێت یان بوونێك لە هەموو لایەنەکەوە پڕ و تەواوبێت.

- (aevum) وشەیەکی لاتینیە، بە مانای سەرمەدی دێت، لە یەك کاتدا مانای (زەمەن) و (ژیان) دەبەخشێت.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: بە زمانی عەرەبی:**


**١- الزمان فى الفكر العربى والعالمى – تآليف (على شلق) بيروت – ٢٠٠٦-**

**٢- الزمان فى الفكر الدينى والفلسفى- حسام الالوسى، بيروت – ٢٠٠٥**

**٣-** الله و العقل والكون، بول ديفز، ترجمه، سعدالدين خرفان، دار علاو الدين، ٢٠٠٨-

**٤- اديان العالم، هوستن سميپ، ترجمه، سعد رستم – ٢٠٠٥ –**

**٥- الفچائ و الزمن والانسان، گراهام كلارك- ترجمه (عدنان حسن)، دمشق – ٢٠٠٤ –**

٦- التخلف الاجتماعى- مستەفا حجازى- لبنان- ١٩٧٦

٧- جوله فى اقاليم اللغه والاسگوره، على الشوك، دمشق، ١٩٩٨ –

٨- جدليه الزمن- غاستون باشلار- ت، د. خليل احمد خليل، بيروت- دار المجد، ١٩٩٢

٩- الخيال العلمى، ادب القرن العشرين) – محمود قاسم- ميسر- ١٩٩٣

**١٠- حكايات الخوارق، جى سى كوبر، ترجمه (كمال الدين حسين) ٢٠٠٥**

**١١- سحر الاساگير- (م. ف. البيدل) – ترجمه (حسان ميخائيل) سوريا – دمشق ٢٠٠٥**

١٢- سقوگ الحضارة- كولن ولسن- ترجمه، انيس زكى- بيروت- گ١ -١٩٧١

**١٣- صور و رموز- مرسيا الياد، ترجمه (حسيب كاسوحه)- دمشق – ١٩٩٨ –**

**١٤- فكره الزمن عبر التاريخ، تااليف (كولن ولسن و جون گرانت)، ترجمه، فوئاد كامل، سلسله (عالم المعرفه)- كويت – ١٩٩٢**

١٥- الكون فى قشره الجوز- تاليف ستيڤن هوكنگ- ترجمه، مصگفا ابراهيم فهمى- كويت- ٢٠٠٣-

١٦- نظام الزمان- كريستوف بومبيان- ترجمة، بدرالدين عرودكي- المنظمة العربية للترجمة- بيروت، ٢٠٠٩

١٧- هنرى برغسون- الطاقة الروحيه- ترجمه على مقلد - بيروت – ٢٠٠٦
١٨- مسقبل الفلسفه العربيه- د. خليل احمد خليل، بيروت- سنه، ١٩٨١
١٩- المقدس والعادى- مرسيا الياد- ترجمه، عادل العوا- بيروت- ٢٠٠٩-
٢٠-ماهو الكون؟ - تاليف، المهندس، فايز العاده- دار علاو الدين، سوريا، ٢٠١٠-
٢١- المذاهب الكبري في التاريخ- ج. ويدجيري- ترجمة ذوقان قرقوط- بيروت- ١٩٧٩
٢٢-موجز تاريخ الزمن- تاليف، ستيفن هوكنغ- ترجمه، باسل محمد حديسى- بغداد- ١٩٩٠)
٢٣- الموسوعه الفلسفيه- باشراف رۆزنتال- ترجمه سمير كرم- بيروت ١٩٨١)
**٢٤- آلمجوسية (آلزرادشتية) تآليف – ر.س. زيهنير – ترجمه – دكتور سهيل زكار – دمشق – ٢٠٠٥ –**
**٢٥- ما قبل آلفلسفة – فرانكفورت وآخرون – ترجمة – جبرا آبراهيم جبرا –**
**٢٦- معجم ديانات و آساطير آلعالم – امام عبدالفتاح امام – مجلد آلثالث – مكتبة مدبولى –**

## – دووەم: بە زمانی کوردی:

١- ئاشنابوون بە قەشە ئۆگستین- پۆل ستراتیرن- و. سەرهەنگ عەبدولرەحمان- ٢٠١١
٢-بوون و داهێنان- محمد کمال- سێمانی -- دەزگا و پەخشی سەردەم) - ٢٠٠٤
٣- تیۆری بونیادی شاراوە- نەجات حەمید ئەحمەد- دەزگای ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٨
٤-جەژنێك بۆ پیر(بنەمایەك بۆ ئوستورەی کوردی)- رەووف مەحمود پوور- هەولێر، ٢٠٠٩-
٥-دیوانی بێکەس- محمدی مەلا کەریم- سلێمانی، ٢٠٠٨،
٦-زمان، هزرو کولتوور- و. رەحیم سورخی- دەزگای بلاوکردنەوەی موکریانی- ٢٠٠٦
٧-زانستی کەلام (فەلسەفە- واچەکان- لاهووت)- نووسینی حەمەکەریم هەورامی، بەرگی دووەم- هەولێر، ٢٠١٠

٨-زانست و فەلسەفەی ڤیدایییەکان- نوسینی، هاوبیر کامەران- چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩-
**٩- گەران بە دوای نەمریدا، مەولود ئیبراهیم حەسەن- هەولێر- ٢٠٠٢**
١٠-فەلسەفەی مێژوو لای شبنگلەر- مەریوان عەبدول-دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی- هەولێر- ٢٠٠٩
١١- فەلسەفەی بوونگەرایی — جۆن ماکواری- وەرگێرانی، ئازاد بەرزنجی-دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧-
١٢-فەرهەنگی کات لە کوردەواریدا — عەبدولوەهاب شێخانی- زنجیرە کتێبی کەلەپوری- هەولێر- ٢٠٠٧-
١٣- هایدیگەر، د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧-
١٤- نیتشە و پاش تازەگەری- د. محمد کەمال- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦-
١٥- مێژویا سالْنامێ و دەمناسین دگوتنێن مەزناندا، جەمیل محەمەد شێلازی، دهۆك، ٢٠٠٧
١٦ - مێژووی فەلسەفە-ئیمیل بریهیە- وەرگیران — ئاوات محمد- بەرگی یەکەم — سلێمانی ٢٠٠٧)

## – گۆڤارە کوردیەکان:

- گۆڤاری (ئاید یا) ژ (٨ - ٩) ٢٠٠٦ —.
- گۆڤاری (ئایندە) ژ (٨ — ٩) ٢٠٠٠ —
-گۆڤاری دیدگا، ژمارە- ١، سلێمانی ٢٠٠٠
-گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ٦- سالْی، ١٩٩٨-
-گۆڤاری رەهەند- ژمارە، ١٨-١٩ - سالْی، ١٩٩٨-
-گۆڤاری، ژیار- ژمارە، ٧- سالْی، ٢٠٠١
-گ، ژیار، ژ، ١٠-١١- سالْی ٢٠٠٢

-گۆڤاری شانەدەر- ژ(٩)
-گۆڤاری کۆچ – ژ (١١-١٢)- ٢٠٠٩ -
-گۆڤاری، کاروان- ژ- ١٧٠- ٢٠٠٣
-گۆڤاری، رامان، ژ- ٣٨- ١٩٩٩-
-گ، رامان، ژ ٣٠، ١٩٩٨،
-گ. رامان، ژ- ٧٠، ٢٠٠٢،
-گۆڤاری رۆشنبیری نوێ- ژ، ١٠١- ١٩٨٤
-رۆشنبیری نوێ –ژ-١٠٩
-رۆشنبیری نوێ- ژ-١١٦- ١٩٨٨
- رۆشنبیری نوێ – ژ (١٠١) ١٩٨٤
-گۆڤار ی، هەژان، ژ- ٢٣، ساڵی، ٢٠١٠

## – گۆڤارە عەرەبیەکان:

-مجلة ا فاق عربية -ع -٥- سنة- ١٩٩٠
- مجلة،افاق عربية، ع-١٢-سنة-١٩٨٧-
-مجلة، دراسات فلسفية- عدد، ٤- سنة، ١٩٩٩- بغداد
- مجلة الثقافة الاجنبية- عدد، الاول، سنة العاشرة- بغداد - ١٩٩٠-
-الانسان و الزمن في التراث الشعيي- مجلة، عالم الفكر- المجلد السادس- العدد الرابع- الكويت- ١٩٧٨)
-فلسفة الوعي بالزمن- مجلة (الثقافة الاجنبية- عدد، الثاني، سنة ا الثانية – بغداد- ١٩٨٢
- مجلة الثقافة الاجنبية - عدد-٤ سنة الخامسة- بغداد- ١٩٨٥
-مجلة العربي- عدد، ١٤٧- ١٩٧١)
-مجلة الفيسل- عدد – ١٣٣- ١٩٨٨- ل٣٨)
- العقل الايماني و صراع الازمنة- مجلة النهج- عدد، ٥٤- ١٩٩٩